# پێشەکی

کۆمەڵ بە بێ بەکارهێنانی زمان بەرێوەناچێ و زمانیش گرنگترین ئامێری پێوەندی بەستن و لە یەکترگەیشتنی ئادەمیزادە . هیچ چالاکییێکی مرۆ نییە ، کە لە دەربڕینی بیر و مەبەست ، هەست و نەست ، پێشکەوتن و گەشەکردنیدا زمان بەشداریی تێدا نەبێ .

ئەوەش هیچ شتێکی سەیر و سەرسوڕهێن نییە ، کە ئادەمیزاد لەمێژە هۆگر و سەودای هاوسەرە هەمیشەییەکەیەتی و زانستی لە بارەیەوە سازکردووە و ناوی ناوە (زمانناسی) . زانینی زانیارییە بنەڕەتییەکانی ئەم زانستە بۆ گشت مرۆیێك کەڵکی هەیە و بەتایبەتیش بۆ ئەو کەسانە زۆر پێویستە ، کە کار و پسپۆڕییان بەندە بە وتنەوەی وانەی زمان و لێکۆڵینەوەی زمانەوە . هەروەها بۆ ئەو کەسانەش پێویستە ، کە زمان ئامرازی پیشەکەیانە ، وەك : مامۆستا ، نووسەر ، ڕۆژنامەنووس ... هتد .

تەنانەت لە مەبەست و بیروڕا بنەڕەتی‌یەکانی زمانناسی هاوچەرخ ئاگادار بوون شتێکی ئاسان نی‌یە و ئەرکێکی گرانە . ئەمەش تەنیا لەبەر ئەوە نی‌یە ، کە زانیارییێکی یەکجار زۆر دەگرێتە خۆ ، بەڵکو ئەو هۆیەشە ، کە پێکهاتنی ناوەکی ، تەواو ئاڵۆزە . زمانناسی کۆمەڵێ زانستی سەربەخۆی لە چوارچێوەی خۆیدا جی‌کردوونەتەوە ، کە ڕووی جیاوازی زمانانی جیاجیا لێکدەدەنەوە . هەندێ زانست لە زمانی کوردی دەکۆڵنەوە : دەنگسازی _ ڕووە دەنگی‌یەکەی ؛ لێکسیکۆلۆژی _ وشە فەرهەنگی‌یەکانی ؛ ڕێزمان _ ڕێگە و کەرەستەی ڕۆنانی وشە و ڕستە ، شێوەناسی _ ئاخاوتنی ناوچەیی ... هتد . بە هەمان ڕێباز دابەش کردنی ناوەکیی زانست لەبارەی زمانانی دی‌یەوە .

ڕێرای ئەوە ، دیوی ناوەوەی زانستی زمان بەپێی پێوەندی بە لێکۆڵینەوە لە پێکهاتن و کاری زمان _ واتە (ئەرك بینینی) _ یان گۆڕانی بە تی‌پەڕبوونی کات _ واتە (پێشکەوتنی)یەوە دابەش دەبێ . ئەگەر لێکۆڵینەوە لە پێکهاتن و کاری زمان لە ماوەیێکی دیاری کراوی ژیانی‌دا بێ ، ئەوە دەبێتە باسی زمانناسی وەسفی ( بە وێنە : دەنگسازیی وەسفیی زمانی کوردی هاوچەرخ ؛ لێکسیکۆلۆژیی وەسفیی زمانی ئەدەبی ئەمڕۆی کوردی ؛ ڕێزمانیی وەسفیی زمانی فارسیی ئەمڕۆ ؛ وشەسازیی وەسفیی زمانی لاتینی ؛ ڕستەسازیی وەسفیی زمانی فارسیی ناوەڕاست ... ) . ڕاست نی‌یە وا بیربکرێتەوە ، کە زانستی زمانناسیی وەسفی پێوەندی تەنیا بە زمانانی ئەمڕۆوە

هەیە . دەشێ وەسفی هەر زمانێك لە هەر قۆناغێکی پێشکەوتنیدا بکرێ و بۆ ئەو وەسفانەش بەڵگە و شێوازی پێویست هەیە.

ئەگەر لە گۆڕانی زمان ( پێکهاتن و ئەرکبینینی ) بەپێی کات بکۆڵرێتەوە _ واتە پێشکەوتن و گەشەسەندنی زمان بکرێتە مەبەست ، ئەوە زانستی زمانناسیی مێژوویی دێتە گۆڕێ ( بە وێنە : دەنگسازیی مێژوویی زمانی کوردی ؛ وشەسازیی مێژوویی زمانی فەرەنسی ؛ ڕستەسازیی مێژوویی زمانی سویدی ...) .

زانستی وەسفی و مێژوویی لەگەڵ ئەوەدا ، کە لە دیوی جیاوازی زمان دەدوێن ، کەچی توند و پتەو پێکەوە بەندن و بە هەردووکیان دانەیێکی یەکگرتوو سازدەکەن و دابەشکردنی ناوەکی پێکدێنن ، کە بەهەموو حاڵیانەوە دەکەونە ژێر یەکێتییێکی زمانناسیی گونجاوەوە .

زانستی زمان لە لێکۆڵینەوە ئەوروپاییەکاندا بە زۆری بە (زمانناسیی گشتی) ، یان (سەرەتایێکی زمانناسی)... ناوبراوە .

کاری زمانناسیی گشتی چییە ؟ لە چ شتێکی زمان دەکۆڵێتەوە ؟ بە واتایێکی دی بابەت و کەرەستەی لێدوانی کامەیە ؟

بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە ، دەبێ هەوڵی تێگەیشتنی ئەوە بدەین ، ئایا لە زمانانی جیاوازدا شتی گشتی هەیە ، کە بۆ سەرجەمیان خاسیەت و بوونیان لە یەك ڕادەدا بێ . بۆ نمونە : ئایا ئەرکی کۆمەڵایەتیی زمانی کوردی و ئینگلیزی و فەرەنسی .... وەك یەکن ، یاخود جیاوازن ؟ بێگومان وەك یەکن : هەر یەکێك لەو زمانانە و هەر زمانێکی دیش ، وەك ئامێری لەیەکترگەیشتن بەکاردێنرێ ...

نمونەییێکی دی : ئایا دەشێ وا بیربکەینەوە ، کە بوونی دەنگ و وشە و ڕستە .... تەنیا خاسیەتی زمانی کوردی نی‌یە و خاسیەتی زمانانی دی‌یشە ؟ تەجروبەی ئاخاوتن و زانست گومانیان لە وەلامی ئەو پرسیارەدا نەهێشتۆتەوە .

بۆ پێ‌سەلماندنی ڕای بوونی گشتێتی ئەو جۆرە لایەن و دیاردە و بەڵگە و ڕاستی‌یانە ، لە زمانانی جیاواز و سەرجەمی زماناندا نموونەی دی یەکجار زۆرە .

زمانناسیی گشتی ، بە تایبەت ئەو زانستەیە ، کە لە کێشەی گشتێتی زمانانی جیاواز دەکۆڵێتەوە . ئەم زانستە ، بە واتاییێکی ئاشکراتر دەشێ بە زانستی زمان بە گشتی و زانستی سروشت و چییەتی (الماهیة _ Essence )ی زمان (لایەنەکانی ، بەش و دانە پێکهێنەکانی) ناوببرێ .

ئەو کێشە گرنگانەی ئەم زانستە چارەسەریان دەکا چین ؟

بەر لە هەرشت ، چۆنیەتی سروشتی زمان دیاری دەکا_ واتە لەوە دەدوێ ، کە ئایا زمان دیاردەییێکی کۆمەلایەتی‌یە ، یان بایۆلۆژی‌یە ، یان فیزیاوی‌یە ، یان دەروونی‌یە . زمانناسیی گشتی لە هەمان کاتدا دەمەتەقێ لەسەر دووەم کێشەی گرنگ دەکا ، کە ئەویش مەسەلەی چییەتیی زمانە _ واتا ئەو جیاوازییە بنەڕەتی‌یانەی زمان لە دیاردەکانی دی ژیان جیادەکاتەوە .

بەم شێوەیە ، یەکەم کێشەی زمانناسیی گشتی _ کێشەی سروشت و چییەتیی زمانە ، کە مەسەلە گرنگەکانی پێوەندی زمان بە کۆمەڵ و بیر و هۆشەوە دەگرێتە خۆ .

دووەم کێشە پتر بەربڵاوە و باس و مەسەلەی زۆر لێك دەداتەوە و بەندە بە تێگەیشتنی پێکهاتنەوە _ واتە پێکهاتنی زمانەوە : لایەنە سەرەکیەکانی زمان کامانەن ؟ لایەنی دەنگیی زمان لە چیدایە ؟ لە چ بەش و دانەییێك سازبووە ؟ دەنگەکانی ئاخاوتن چین ؟... لێکسیك یاخود وشەکانی زمان چیە ؟ چۆن پێکهاتووە ؟ وشە بە چی دەوترێت؟ ... پێکهاتنی رێزمانیی زمان چیە ؟ خاوەنی چ دیاردە و تایبەتێتیەکە ؟ بەشەکانی ئاخاوتن و ئەندامەکانی رستە و رستە چین ؟...

سێیەم کێشەی زمانناسیی گشتی ئەو باسانەن کە پێوەندییان بە سیستەمی زمانەوە هەیە _ واتە ئەو پێوەندیەیە زۆر و هەمە جۆرەی ماکەکانی پێکهاتنی زمانیان لە چوارچێوەییێکی پتەودا پێکەوە بەستووە . زمان کۆکردنەوەی دەنگ و وشە و ئاواز و رستە...ی لابەلا نیە . زمان بریتیە لە سیستەمێکی تەواو رێك وپێك ، بە هاوجووتیی و هاوشانیی بەش و دانەکانی یەکێتیەکەی پێکهێناوە . هەر لایەنێکی بەش و دانەکانی پێوەندییان بە گەڵ لایەنی دی بەش و دانەوە هەیە . ئەم سیستەمە رێك وپێکە ، یەکێتی ناوەکی گونجاوی زمانە و زمانناسی گشتی لێی دەکۆڵێتەوە .

کێشـەی چوارەمـی ئـەم زانسـتە گـەڵ کێشـەی گـەورە و بچووکـی گەشەسـەندنی زمـان بـەپێی پێوەنـدی بـە پێشـکەوتنی کۆمـەڵی مرۆڤایەتی‌یەوە شی‌دەکاتەوە : چۆن و بە چ ڕێگاییێك و بەپێی پێوەندی بەچی‌یەوە زمان بە گشتی گۆڕانکاری بەسەردادێت ؟ یاسای ناوەکیی گەشەسەندنی زمان چی‌یە و تا چ ڕادەییێك لە تەئسیری دەرەکیی زمان جیایە ؟ فۆرمی بنەڕەتیی بوون و پێشکەوتنی هەر زمانێك چی دەگرێتە خۆ ـ زمـانی میللـی ؛ زمـانی ئاخـاوتن و شـێوەی ناوچـەیی ؛ زمـانی ئـەدەبی...؟ قۆناغـە سـەرەکی‌یەکانی زمـانی مـرۆڤ هـەر لەسـەرەتای پەیدابوونی‌یەوە تا ئێستا کامانەن ؟ لە کۆتایشدا ، چۆن و کەی و لە چ هەل و مەرجێکدا ئاخاوتنی مرۆ پەیدابووە و سەرەتای پێشکەوتنی زمانان بۆ چ سەردەمێك دەگەڕێتەوە ؟

لەکێشەی چوارەمەوە ، کێشەی پێنجەم دێتە ناوان : پـەیدابوون و پێشکەوتنی نووسین . وەك دەزانین کۆمەڵی مرۆڤایەتی ئەمڕۆ خاوەنی چـەند جـۆرە نووسـینێکی جیـاوازە . ئەوجۆرانـە چـۆن پـەیدابوون ؟ تایبەتێتی هەر یەکێکیان چی‌یە ؟ بە گشتی چییەتیی نووسین بەپێی پێوەندی بە زمانی دەنگی‌یەوە لـە چیدایـە ؟ چ جـۆرە ئـەلفوبێ‌یێك لـە ئـادەمیزاد ئاشـکرایە و ئـەو ئەلفوبێ‌یانـە چـۆن پـەیدابوون ؟ ڕێنـووس چی‌یە و بنەماکانی چین ؟...

کێشـەی شەشـەم دەکـرێ نـاوبنرێ کێشـەی دابـەش‌کردنی زمانـان. ئیستا لە سەر ڕووی ئەم زەمینە پتر لە دوو هـەزار زمان هەیە . هەندێ لـەو زمانانـە زۆر لـە یـەکدی نـێزیکن (بـە وێنـە : کـوردی و فارسـی و

تاجیکی.. یان عەرەبی و عیبری..) وێک چوون و "خزمایەتی"یان یەکجار بەرچاوە . بەشێکی دی زمانان وا پێدەچێ هیچ وێک چوونێك لە نێوانیاندا نەبێ و لەگەڵ یەکدی تەواو نامۆ بن ، وەك (کوردی و چینی) ... جا ئەمە وایە ؟ ئایا دەکرێ بە گشتی زمانان بەپێی خاسیەتی گشتی خێزان و گرووپ و دەستە دابەش بکرێن ؟ ئەگەر ئەمە بکرێ ، ئەوە ئەو دابەشکردنەی زمان چۆن خۆی دەنوێنێ و تەنیا یەك دابەشکردن کار مەیسەر دەکات ؟ ئەگەر تاکە دابەشکردنێك نەبێ ، کەواتە چەند دابەشکردن هەیە و دابەشکردنی جیاواز بۆ دانراوە ؟

بۆ کێشەی حەوتەمی زمانناسی گشتی دەتوانین ئەوە بێنینەوە یاد و بیخەینە پێش چاو ، کە هەر زانستێك دەمێ لە بابەتەکەی خۆی دەدوێ ، رێگە و رێبازی دیاریکراوی لێکۆڵینەوەی خۆی دەگرێ . بەوێنە لە لێکۆڵینەوەی سروشتناسیدا رێبازی تەجروبە و تاقیکردنەوە فراوان لە کاردایە، رێبازی بەراوردکاری لە زانستی هەمەجۆردا باوە... زمانناسیش لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا رێبازی زانستی جۆربەجۆری (بەراوردی ، مێژوویی ، وەسفی ، ئەزموونگەری ، چەندەکی...) هێناوەتە ئەنجام . زمانناسیی گشتی کۆششی کردووە بە شێوەی تیۆری چییەتی هەر رێبازێك روونبکاتەوە و سنووری بەکارهێنانی دیاری بکا .

کێشەی هەشتەمی زمانناسیی گشتی ساڵ بە ساڵ پتر جێپێی خۆی فراوان دەکات . ئەم کێشەیە بریتییە لە خستنە پێش چاوی زانیاریی زانستی لە بارەی زمانەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەرکی کارەکیی

جۆربەجۆر، کە لە ژیانی ڕۆژانەی مرۆدا سەرهەڵدەدات (قوتابخانە و زماننـاسی ؛ زماننـاسی و وەرگێڕانی دەستی و ئامیری ؛ تەکنیك لە خزمەتی زماندا...) تیۆریی لێکدانەوە و ساغکردنەوەی ئەو کێشانە بە زماننـاسی بەسەرداگونجاندن ناسراوە .

نۆیەم کێشە لەبارەی پێویستیی بارودۆخ و دەوروبەر و کارکردنی لە زماننـاسی و پێوەندی بە زانستەکانی دیـیەوە دەدوێ . زماننـاسی هەر لە زووەوە بە مێژوو و ژیربێژی و دەروونناسی و ئەدەبناسییەوە بەندە . لەم دواییەشدا پێوەندییێکی فراوان لە نێوان زماننـاسی و بیرکاریدا پەیدابووە و بنجی داکوتاوە .

ئەو نۆ کێشەیە و هەندێکی دی بابەت و کەرەستەی زماننـاسیی گشتین و ئێمەش لەم بوارەدا هەوڵمان داوە ئەوەی زۆر بە پێویستمان زانیبێ وەریگێڕینە سەر زمانی کوردی . ئەگەرچی سەرچاوەی سەرەکیی ئەم باسانە کتێبی (ف . ی . کۆدۆخۆف ، سەرەتاییێکی زماننـاسی ، مۆسکۆ ، ۱۹۷۹)یە ، بەڵام چوار باسی سەرەتای فەسڵی دووەم (واتە جگە لە بەشی پێنجەمی ئەو فەسڵە ، کە ئەویش هەر لە کتێبی ف . ی . کۆدۆخۆفەوە وەرگێڕراوە) لە کتێبی (ئـا . ئـا ڕیفۆرماتسکی ، سەرەتاییێکی زماننـاسی ، چاپی چوارەم ، مۆسکۆ ، ۱۹٦۷) یەوە وەرگرتووە ، ئەویش لەبەرئەوەی لە لێکۆڵینەوەی ئەو چوار کێشەیەدا بەلامەوە ڕیفۆرماتسکی سەرکەوتووترە . وێڕای ئەوە لە چەند بەرهەمێکی دی زماننـاسییەوە زانیاریم دەرهێناوە و خستوومەتە

سەر ئەو خەرمانە ... لە شوێنی پێویستیشدا نموونەی کوردی و بۆچوون و بیروڕای خۆیشم تێهەڵکێشی لێدوانە گشتییەکە کردووە ...

مەبەستی گرتنی ئەو ڕێبازەش بۆ ئەوەیە کارەکەمان نیشان باشتر بپێکێ و خوێنەری هێژای کوردیش لەبارەی زانستی زمانەوە زانیاریی‌یێکی تێر و تەسەلتر وەربگرێ .

کۆڵەوارم و هەر هێندەم لە دەست دێت .. خۆزگە کاری گەورەم لەباردا بوایە.. خەجاڵەتی قاپیی دڵسۆزی میللەتەکەمم ، کە هێندە دڵپاك و لەخۆبوردوون دەست بە ڕوومەوە نانێن ئەو جۆرە دیارییانەم لێ وەردەگرن...

میدیا

# - فەسلی یەکەم -

# زمانناسی وەك زانستێك

## -١-

## بابەت و بەشە بنەڕەتی‌یەکانی زمانناسی

زمانناسی ئەو زانستەیە ، کە لە زمان دەدوێ و سروشتی کۆمەڵایەتی و ئەرکی پێکهاتنی ناوەوەی ، دەستووری کارکردنی ، پێشکەوتنی مێژوویی و دابەش‌بوونی زمانانی دیاری‌کراو ڕوون دەکاتەوە .

زمان گرنگترین ئامێری لە یەکترگەیشتنی ئادەمیزادە . کۆمەڵگەی ئادەمیزاد و میللەت نی‌یە ، کەخاوەنی زمان نەبێ . مرۆش بێ زمان دەرناپا . زمان وەك ئامێری لەیەکتر گەیشتن و وەك سیستەمی نیشانە بەرەو ڕووی گەلێ زانست دەبێتەوە .

بۆیە یەکەم کێشە کە دێتە ڕێمان ، بریتی‌یە لە دیاری‌کردنی بابەتی زمانناسی و جیاکردنەوەی سنووری ، لەو زانستە جۆربەجۆرانەی لە زمان دەدوێن .

بەڵگە و دیاردەی زمان و چالاکیی ئاخاوتن خاوەنی خاسیەتی جیاوازن و بۆیە دەکرێ لە ڕووی جیاوازەوە لێیان بکۆڵرێتەوە . بۆ نموونە ، ڕستەی :( گشت سێگۆشە یەکلاییێك ، سێ گۆشە گۆشە یەکسانە) ژێربێژ وەك حوکمی جووتبوون تەماشای دەکا ، کە پێکهاتنی لە نیهاد (ن - گشت سێگۆشە یەکلاییێك) و گوزارە ( گ - سێگۆشە گۆشەیەکسان) و (ە)ی یاریدەدەر . ئەوەش یادداشت دەکات ، کە نیهاد و گوزارە بارستی مەفهوومیان وەك یەکە ، لەبەرئەوەی واتای مەفهووم لەیەك ڕادەدا دەردەبڕن .

هەرچی ڕێزماننناسە بە جۆرێکی دی لەهەمان ڕستە وردەبیتەوە و بەپێی ئەندامانی ڕستە لێی دەکۆڵێتەوە . لە ڕستەکەدا شوێنی نیهاد و گوزارە دەگۆڕێ و (ە)ی یاریدەدەریش وەك بەشێکی گوزارە تەماشا دەکرێ . ڕیزماننناس وێڕای ئەندامە سەرەکییەکانی ڕستە (دیارخراو و دیارخەر) ، بەشی تەواوکەریش جیادەکاتەوە... لە کۆتاییشدا خاسیەتی شێوازی دەربڕینی ڕستەکە ڕووندەکاتەوە .

لە لێکدانەوەی ئەو ڕستەیەدا دوو ڕێبازی لێکۆڵینەوە بەدی دەکرێ:

ژێربێژی و ڕێزمانی . ئەم دوو ڕێبازە پێکەوە بەندن ، چونکە هەردووکیان لە یەك بابەت دەدوێن . ئەو دوو ڕێبازە لەیەکتریش جیان ، لەبەرئەوەی لایەنی جیاوازی یەك بابەت نیشان دەدەن . لایەنی جیاوازی بابەت دەبێتە کەرەستەی زانستی جیاجیا . زانینی بابەت و

لایەنە جیاجیاکانی و خاسیەتی شێوازی لێکۆڵینەوە دەبنە بناغەی دیاریکردنی زانستی جۆربەجۆر .

وەك ئاشکرایە ، زانستی هاوچەرخ بەگشتی لە سێ بەشی سەرەکی پێك دێت : سروشتناسی (یاخود زانستی سروشت) ، کە لە دیاردە و یاسای پێشکەوتن و بوونی سروشت دەکۆڵێتەوە ؛ کۆمەڵناسی واتە _ یاسای کۆمەڵ ؛ فەلسەفە ، کە پتر لە یاسا گشتییەکانی سروشت و کۆمەڵ و بیر دەدوێ . زمانناسی وەك زانستێك لەبارەی زمانی ئادەمیزادەوە ، سەر بەزانستی کۆمەڵە .

لە بەیەك گەیاندنی سروشتناسی و کۆمەڵناسیدا، بە واتاییێکی فراوان زانستی تەکنیك پەیدا دەبێ و زانستی کشتوکاڵ و پزیشکی دەگرێتە خۆ . لە بەیەك گەیاندنی سروشتناسی (بەشێوەییێکی سەرەکی فیزیا) و فەلسەفە (بە شیوەییێکی سەرەکی ژیربێژی) زانستی بیرکاری سەر هەڵدەدا ، کە نەك تەنیا بیرکاری تایبەتی ، بەڵکو بیرکاری ژیربێژی و تەکنیکی بیرکارییش دەگرێتەوە .

زمانناسی بە سەرجەمی بەشەکانی زانستی هاوچەرخەوە بەندە و هۆی ئەمەش ئەو دەورە مەزنەیە ، کە زمان لە سەرلەبەری مەیدانەکانی چالاکیی ئادەمیزاددا دەیبینێ و بە تایبەتی لە پرۆتسێسی هەست و تێکەڵبووندا .

# زمانناسی و کۆمەڵناسی

زمانناسی یەکێکە لە زانستەکانی کۆمەڵناسی و پێوەندیی توند و تۆڵی لەگەڵ بەشەکانی‌دی ئەو زانستەدا – مێژوو ، ئابووری ، جوگرافیا ، زانستی سەرخان و ژێرخان ، دەروونناسی پەروەردە – هەیە.

پێوەندیی زمانناسی بە مێژوو ( زانستی پێشکەوتنی کۆمەڵگای ئادەمیزاد) ەوە دیارە ، چونکە مێژووی زمان بریتی‌یە لە بەشێکی مێژووی میللەت ، بە تایبەتی ئەوەی یەکجار ڕوون و ئاشکرا هەستی پێ بکرێ ، پێوەندیی مێژووی کۆمەڵە بە وشەکانی زمانەوە و مەودا و خاسیەتی ئەرکی زمان و بەر لە هەر شتێش زمانی ئەدەبی .

پێوەندیی زمانناسی و مێژوو هاودەنگی‌یە : زانیاریی مێژوو ڕووی مێژوویی گۆڕانی وشە دابین دەکا و زانیاریی زمانناسیش یەکێکە لە سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوەی کێشەکانی مێژوو ، وەك : پەیدابوونی میللەت ، پێشکەوتنی کولتووری میللەت و کۆمەڵگای لە سەردەمی جیاوازدا و هەروەها پێوەندیی نێوان میللەتان .

زمانناسی بە تایبەتی بە بابەتی مێژوویی وەك ئارخیۆلۆژی و ئەتنۆگرافی‌یەوە بەندە . ئارخیۆلۆژی لەسەر بناغەی کەل و پەل (ئامێری کارکردن ، چەك ، خشڵ ، شتومەکی ماڵ .. ) لە مێژوو دەکۆڵێتەوە . ئەتنۆگرافیا زانستی داب و نەریتی میللەتانە و پێوەندیی پتەوی بە زمانناسی‌یەوە هەیە و ئەو پێوەندی‌یەش لە هەردوو لاوەیە .

لەبەرئەوەی زمان گرنگترین نیشانەی رەگەز و نەژادە ، ئەوە زانینی پێوەندیی زمانی میللەتێك بە زمانی میللەتانی هاوسێ و میللەتانی دییەوە ، رێگە بۆ زانای ئەتنۆگرافیا خۆش دەکا ، بڕوانێتە پێوەندیی مێژوویی و کولتووریی نێو میللەتان . زمانناسیش لە لای خۆیەوە کە لە زمانێك دەکۆڵێتەوە ناتوانێ زانیاریی ئەتنۆگۆافیی ئەو میللەتە پشت گوێ بخا ، چونکە وەك ئاشکرایە مەفهوومی واتای گەلێ وشە و دەربڕین پێوەندییان بە دیاردەی داب و نەریتەوە هەیە[1].

زمانناسی کاتێ پتر لە ئەتنۆگرافیا نێزیك دەبێتەوە ، لە فەرهەنگی دیالێکت دەکۆڵێتەوە – ناوی شوێنی ژیان و خانووبەرەی جووتیاران ، کەل وپەلی ناومالّ ، جل و بەرگ ، ئامێری کشتوکالّ و پیشەسازی ...

پێوەندیی زمانناسی بە ئەتنۆگرافیاوە وەنەبێ تەنیا لە لێکۆڵینەوەی کەرەستەی کولتووری میللەتدا بە دەربکەوێ ، بەڵکو لە دابەشکردنی زمانان و میللەتاندا و لە لێکدانەوەی رەنگدانەوەی هەستی نەتەوایەتی لە زمانیشدا دێتە بەرچاو . ئەم رێبازەی لێکۆڵینەوە ناوی (ئەتنۆگرافیای زمانناسی) ی وەرگرتووە . زمان لەم بارەدا وەك دەربڕینی نیشاندانی میللەت لە بارەی جیهانەوە تەماشا دەکرێ ، کەوا دەشێ نەك هەر بەراوردی وشە ، بەڵکو فۆرمی رێزمانیش بدۆزرێتەوە . بە وێنە وەك زمانی ئەڵمانی و زمانی کاوی ( لە دورگەی یاوا) ، یان زمانی ئینگلیزی و زمانی هۆپی (لە باکووری ئەمریکا) .

---

[1] س . ئا . تۆکارێڤا ، بنەماکانی ئەتنۆگرافیا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨، ل ١٢ .

لە سەرپاکی ئەو زانستانەدا ، کە لە سەرخان و ژێرخان دەکۆڵنەوە ، زمانناسی پێوەندیی نێزیکی بە ئەدەبناسی‌یەوە هەیە (تیۆریی ئەدەب، مێژووی ئەدەب ، رەخنەی ئەدەبی) . یەکێتی زمانناسی و ئەدەبناسی ، فیلۆلۆژی[٢] پێکدێنن . لە ئەنجامی تێکەڵبوونی زمانناسی و ئەدەبناسی‌دا هونەری هۆنراوە دەردەکەوێ ، کە کاتی خۆی ئەرستۆ بنەما سەرەکی‌یەکانی باسکردووە . پێوەندیی زمانناسی و ئەدەبناسی بەتایبەتی لە بابەتی شێوازی ئەدەبی و مێژووی زمانی ئەدەبی و زمانی نووسیندا باش دەبینرێ .

لەگەڵ ئەوەشدا لەنێوان بۆچوون و شێوازی ئەدەبناسی و زمانناسی لێکۆڵینەوەی دەقی ئەدەبیدا جیاوازی هەیە . ئەدەبناس وەك بەشێکی هونەری فۆرم و پێوەندی بە بیری ناوەرۆکەوە و وەك ماکی یەکەمی ئەدەب و هونەری وشە لە زمان دەکۆڵێتەوە . زمانناس وەك دەرکەوتنی

---

[٢] وشەی فیلۆلۆژی (Philoiogy) کە لەزمانی یۆنانی‌یەوە وەرگیراوە ، پێکهاتووە لە : (Philo _ خۆشەدەوێ) و ( logos _ وشە)لە یۆنانیی کۆندا زاراوە (Phliologs) ئەو مانایەی ئێستای نەدەگەیاندو وێرای ئەوەش بە رێزماننووسیان دەوت (Philolog) . بەرانبەر یەکتر وەستانی زاراوەی فیلۆلۆج و رێزماننووس لە رۆمای زوو سەری هەڵدا . ئەگەر بۆ ئەرکی فیلۆلۆج لیکۆڵینەوەی فۆرم و ناوەرۆکی ئەدەب دەستنیشان کرابێ ، ئەوە بۆ رێزماننووس ئەرکی لێکۆڵینەوەی رێنووس و کێشی تێکست دانراوە . لە سەردەمی راپەرین و رۆشنبیری‌دا فیلۆلۆژیی کلاسیکی پەیدابوو ، کە نەك تەنها لە زمان و ئەدەبی دەکۆڵی‌یەوە ، بەڵکو لە مێژوو و یاسا و ئابووری و ئاین و فەلسەفەش دەدوا . دواتر بەهۆی بزووتنەوەی ئازادیخوازیی نەتەوایەتی‌یەوە ، بابەتی فیلۆلۆژی سنووری تەسك کرایەوە و تەنیا زانستی ئەدەب و زمانی گرتەوە .

چالاکی ئاخاوتنی نووسەر و وەك بەڵگەی کێش (Norm) ی زمان و ئەرکی شێواز دەروانێتە زمان . هەر لەبەر ئەوەشە ، کە بە دوو شێوازی ڕەوانبێژی - ئەدەب و زمان - ناودەبرێن .

زمان وەك کەرەستەی چالاکیی ئاخاوتنی تاکایەتی دەبێتە بابەتی لێکۆڵینەوەی دەروونناسی و زمانناسی . لە زمانناسیدا ڕێبازی دەروونناسی بەندە بە ناوی ئا . ئا . پۆتێبنیا ، هـ . پاول و . ماتێزیوس... هوە ، کە لە بیر و هۆش و پرۆتسێسی دی دەروونی و ڕەنگدانەوەیان لە ئاخاوتندا دواون و لە دۆخەکانی زمان - لێکدانەوەی مانای مەجازیی وشە و ڕستەی پرس و ئەندامی سست و چالاکی ڕستە - یان کۆڵیوەتەوە . لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا زمانناسیی دەروونی پەیدابوو ، کە چالاکیی ئاخاوتن وەك یەکێتی هێڵی گەیەنەری کار و پرۆتسێسی دەروونی و یەکێتی تێکەڵاوبوون و لە یەکتر گەیشتن دەکۆڵێتەوە .

زمانناسی (وەك دەروونناسی) هەروەها پێوەندی بە پەروەردەوە هەیە . لەسەروو ئەوەشەوە ڕێنمایی تایبەتی شێوازی دەرزوتنەوەی زمان ، وەك بەشێکی بەجێهێنانی زمانناسی تەماشا دەکرێ .

شێوازی دەرزوتنەوەی زمان لە زمانناسی و دەروونناسی و پەروەردە (بەتایبەتی ڕێنمایی)دا خاوەنی بناغە و بنەمای خۆیەتی . شێوازی هاوچەرخ تەنیا شێوازی وتنەوەی زمانی زگماك ناگرێتە خۆ ، بەڵکو شێوازی وتنەوەی زمانی بێگانەش ڕەچاو دەکا .

# زماناسی و سروشتناسی

زماناسی بەر لە هەر شت بە شێوەیێکی سەرەکی لەگەڵ فیزیۆلۆژیی[٣] مرۆو ئەنترۆپۆلۆژیدا[٤] یەك دەگرن .

ڕشتەی ئاخاوتن و دەربڕینی دەنگەکانی ئاخاوتن خاوەنی بناغەیێکی فیزیۆلۆژین ، چونکە لە پرۆتسێسی ئاخاوتندا ئەندامەکانی هەست و ڕشتە ماسوولکەییەکان و ڕشتەی دەمارە ناوەندییەکانی مرۆڤ بەشداری دەکەن .

بەتایبەت ئەوەی بەلای زماناسییەوە گرنگ بێ ، تیۆریی دانەوەی کاری ئاخاوتنە ، کە زانایانی ڕووسی فیزیۆلۆژی : ی . م . سێچنۆڤ و ی . پ . پاڤلۆڤ دایاننناوە . وشە ، کەوا مرۆ دەیبیسێ و دەیبینێ ، بریتییە لە دووەم سیستەمی ئیشارەت ، سیستەمەکەی دی ئیشارەتی ئیشارەتە . گشتێتی یەکەم و دووەم سیستەمی ئیشارەت ، بریتییە لە دانەوەی بناغەی فیزیۆلۆژی و ڕەنگدانەوەی ڕاستی .

بناغەی فیزیۆلۆژیی چالاکیی ئاخاوتن یارمەتی دۆزینەوەی هۆی هەمەجۆری تێکچوون و شێوانی ئاخاوتن دەدا . بۆ نموونە ،

---

[٣] زانستی ئەرکی ئەندامی لەش .

[٤] مرۆناسی .

لێکۆڵینەوە لە دەنگ بڕان aphasia – واتە تێداچوونی ئاخاوتن بە هۆی تێکچوونی ئەرکی مێشکەوە – ڕێگە خۆش دەکا ، کە لە میشکدا دەمارە ناوەندییەکانی ئاخاوتن و دەوری هەر یەکێکیان لە ئاخاوتندا دیاری بکرێ .

ئەگەر دەمارە ناوەندییەکانی پشتەوەی لای خوارەوەی دیوی چەپ تووشی چەمانەوە و وەرگەڕان ببن، ئەوە نەخۆش ناتوانێ قسە بکات ، ئەگەرچی بە ئاگایە و لەو قسانەی لە گەڵی دەکرێ ، تێدەگا . ئەم نەخۆشی‌یەش بە تێکچوونی پاڵپێوەنەری دەنگ ناسراوە . بێتو دەمارە ناوەندییەکانی تەوقەسەر تووشی چەمانەوە و وەرگەڕان ببن ، ئەو ددمە نەخۆش لە تێگەیشتن دەکەوێ . بەم نەخۆشی‌یەش دەوترێ (زمان شکان) .

لێکۆڵینەوەی ئەرکی دەرەوەی مێشک ، کەرەستەی لێکۆڵینەوەی دەنگسازی و ڕێزمان و واتاناسیمان بۆ دابین دەکا . ئەمە لە ژیانی ڕۆژانەدا نەك هەر کەڵکی بۆ چارەکردنی نەخۆش هەیە ، بەڵکو لە زمان فێرکردنی کەڕولاڵ و کوێر و هەروەها منداڵی سەقەت و کۆڵەواریشدا پێویستە . تیۆریی گێلناسی ئەم جۆرە فێرکردنە دەگرێتە ئەستۆ .

نیاز و مەبەستی زمانناسی و ئەنترۆپۆلۆژی لە دووبواردا یەك دەگرن : یەکەم – لە دابەش‌کردنی نەژاد و زماندا؛ دووەم – لە لێکۆڵینەوەی کێشەی پەیدابوونی زماندا .

پێوەندی زمانناسی بە زانستەکانی کۆمەڵەوە پتەوتر و بەهێزترە ، وەك لە پێوەندی بە زانستەکانی بایۆلۆژی و پزیشکی‌یەوە . ڕاستە

بناغەی فیزیۆلۆژیی ئەندامەکانی ئاخاوتن گرنگە ، بەڵام بەر لە هەر شت ، زمان دیاردەیێکی کۆمەڵایەتییە و پێوەندی بە کۆمەڵ و هۆشی ئادەمیزادەوە هەیە و ئەرکی لەکۆمەڵدا خاسیەتی سەرەکییەتی .

## زمانناسی و فەلسەفە

زمانناسی وەك زانستەکانی دی پێوەندی بە فەلسەفە – دیالیکتیکی و ژێربێژی – یەوە هەیە . فەلسەفە بە تفاقی شێوازناسی لەنگەری زانستەکانی دی دەگرێ . ڕێگە بۆ پێکهێنانی بنەما و شێوازی لێکۆڵینەوەیان ئاسان دەکا . فەلسەفە کە ئەرکی شێوازناسیی بەخۆزانین و بەئاگابوون لە دەوروبەر و لێکدانەوەیان دەبینێ و کە هەموو زانستە کۆمەڵایەتییەکان و بە تایبەتی لە نێوانیاندا زمانناسی بە ڕێگایدا تێدەپەڕن ، تێکڕا بە ئایدۆلۆژی و سیاسەتەوە بەندن .

فەلسەفەی زمانناسی سۆڤێتی لەسەر بناغەی فەلسەفەی مایەکێتی بێژیاری[*] مارکسی– لێنینی دامەزراوە . لەم بارەدا دەوری شێوازناسی هەر مایەکی (المادی) نییە ، بەڵکو مایەکیەتی (المادیه)یشە . ڤ . ی . لێنین بەم جۆرە دیالێکتیکی ژێربێژی دیاریکردووە :"بۆئەوەی بە ڕاستی شتێك بناسرێ ، دەبێ لە گشت ڕوویێکی بکۆڵرێتەوە . پێوەندی هەموو پێکەوە بەستنێکی ڕوون بکرێتەوە . ئێمە هەندێ جار

[*] مایەکیەتی بێژیاری _ المادیه الدیالیکتیه .

ناتوانین ئەمە بە تەواوی وەدەست بهێنین ، بەلام وەدەستهێنانی لە هەڵە و بەنجبوون دەمانپارێزێ . یەکەم وا ، دووەمیش ئەوەیە ، کە دیالیکتیکی ژیربێژی وا دەخوازێ گشت شت بە پێشکەوتنییەوە لێی بکۆڵرێتەوە ، واتە وەك هیگل هەندێ جار دەیڵێ (بزووتنەوەی) ، گۆڕانی .. سێیەم – پێویستە تێکڕای تەجروبەی ئادەمیزاد بچێتە ناو دیاریکردنی تەواوی شت و وەك پێوەری ڕاستی و وەك دەستنیشانکەری پراکتیکی پێوەندی شت بەوەوە ، کە مرۆڤ پێویستێتی ئاشکرا بکرێ . چوارەم– دیالیکتیکی ژیربێژی فێرمان دەکا ، کە ( ڕاستیی ڕووت ) نییە و ڕاستی هەمیشە جێگیرە"[٦].

بنەمای یەکەم (پێویستی لێکۆڵینەوە لە گشت ڕوویێك) لە لێکدانەوەی سیستەمی زمان و چالاکیی ئاخاوتندا ڕەنگی داوەتەوە . بنەمای سیستەم لە زمانناسیدا بەر لە هەر شت ، لەوەدایە زمان وەك یەکێتی تەواو تەماشا دەکرێ و وەك یەکێتی فۆرم و ناوەڕۆکی ئەو دانانەی خۆیان لە ناو خۆیاندا و هەروەها ماکەکانیان بە پەیدابوونیان و بەکارهێنانی جیاوازیان لەکۆمەڵدا ، پێوەندن .

بەتایبەت گرنگ ئەوەیە ، کە لە لایەکەوە مەفهوومی سیستەمی زمان وەك کۆمەکی ئاسۆکانی (دەنگسازێتی ، وشەسازێتی، ڕستەسازێتی ، لێکسیکۆلۆژێتی) دێتە پێش چاو و لە لاییکی دیشەوە – پێوەندی زمان بە کۆمەڵ و بیرەوە .

---

[٦] ڤ . ی . لینین ، جارێکیدی دەربارەی نەقابەکان ... کارە کۆکراوەکانی ، ب ٤٢ ، ل ٢٩ .

دووەم خواستی دیالیکتیك لە بنەمای مێژوویایەتی‌دا دەردەبڕیٚ .
ئەمەش لەوەدا بەدەردەکەویٚ ، کە گشت دیاردەیێك حاڵەتێکی زمان لە نیگـای پەیدابوونیانـەوە ، پێشـکەوتنی مێژوویانـەوە ، ئـەرکی هاوچەرخیان و بابەتی دواڕۆژیان و گۆڕانیانەوە تەماشا بکریٚ .

گشت دۆخێکی زمانی هاوچەرخ بریتی‌یە لە ئەنجامی پێشکەوتنی دوور و درێژ و پەرەسەندن و قاڵب گرتنی فۆرم و حاڵەتی.

بناغەی مێژوویی زمانناسی ، بەراوردیی مێژوویی زمانناسی پێك دێنیٚ ، کە کەڵك لە شێوازێکی تایبەتی لێکۆڵینەوەی زمان وەردەگریٚ : بەراوردیی مێژوویی .

پێولـەی کـارەکی (عملـی– practical) وەك یـەکێك لـە داخوازی‌یـە بنەڕەتی‌یـەکانی فەلسـەفەی مارکسـیزم – لێنینـیزم لـەوەدا بـەدیار دەکەویٚ ، کە ئەرك و مەبەستی لێکۆڵینەوە بەند بیٚ بەپێویستی‌یەکانی کۆمەڵەوە . زمان خۆی لەخۆیدا پێویستی پتەوی دەکـا و تەجروبـەی گشتی دەیگەیەنێتە کەسانی‌دی . گەشەکردنی ئایندەشی دیسان بـەندە بە پێشکەوتنی مـرۆی ڕووناکبیر و خوێنـدەواری دەویٚ ، پێویسـتی بە بەرزکردنەوەی کولتووری ئاخاوتن و نەهێشتنی گیروگرفتی ڕێنـووس و ئاسانکردنی نووسین و دانانی فەرهەنگ و نووسینی کتێبی ڕێزمانە .

نابیٚ پراکتیـك تـەنیا وەك تاقیکردنـەوەی خۆیـەکی سـەیر بکـریٚ . پراکتیـك "پراکتیکـی سـەرپاکی ئـادەمیزادە" . سـازبوونی بـاوەڕی دیـالیکتیکی مـەتریالیزم تێگەیشـتنێکی پتـەو و ڕوون و ڕێـك وپێکـی زانیاری و فراوانکردنی بیر دەرەخسێنیٚ .

چوارەم خواستی دیالیکتیك - ڕاستیی جێگیر ، ئەوە دەگەیەنێ ، هەر زانستێك و بەتایبەتیش زمانناسی ، کە پشت بە بنەماکانی شێوازناسی دەبەستێ تیۆری بابەتەکەی خۆی دادەمەزرێنێ . واتە لەم بارەدا مەبەستی زمان - کێش و چالاکیی ئاخاوتنە .

بنەمای جێگیریی زمانناسی ئەوە ڕادەگەیەنێ ، کە دەستوورە گشتییەکان و یاساکانی ئەرکبینین و پێشکەوتنی زمان تیشکییان لە لێکۆڵینەوەی زماندا بە گشتی نابینرێ ، بەڵکو لە لێکۆڵینەوەی ئەرکبینین و پێشکەوتنی تەواوی زمانێکی دیاریکراو - ڕووسی ، ئینگلیزی ، کوردی ... دا بەرچاو دەکەوێ .

بێگومان زمانناسی ، وەك زانستەکانی دی لە لێکۆڵینەوەدا پشت بە بنەماکانی شێوازناسی و بۆچوونی ژیربێژی دەبەستێ . وەك ئاشکراشە، پێوەندیی نێوان ژیربێژی و ڕێزمان ، واتا و واتاناسی پتر بەتینە ، وەك لە هەر زانستێکی دی . زمانناسی هەمیشە بە ژیربێژیی شێوەکارییەوە بەندبووە ، کە لە فۆرم و یاساکانی دەستخستنی زانیاری ڕاستی کۆڵیوەتەوە . ئەگەر ئاکاری ژیربێژیی شێوەکاری لەمەفهووم و حوکم، هەڵێنجان و ئەنجام گری کۆڵیبێتەوە ، ئەوە ژیربێژیی شێوەکاریی سەردەم ، وەك وەسیلەی پێزانین بایەخی بە زمان داوە . ژیربێژان زمان وەك مەفهووم بە میتافیزیك ناودەبەن ، کە لێکۆڵینەوەکەی ژیربێژیی ڕستەسازی و ژیربێژیی واتاناسازییە .

بۆ نموونە ئەم هەڵێنجانە وەردەگرین : "گشت (م)یەك (پ)ە ؛ گشت (س)یەك (م)ە . کەواتە گشت (س)یەك (پ)ە" ئەم پێکهاتنە دەکرێ بە

فۆرمى مەرج ڕۆبنرىَ و بوترىَ: "ئەگەر گشت (م)يەك (پ) بىَ و گشت (س)يەك (م) بىَ ، ئەوە گشت (س)يەك (پ)ە" . ژيربێژى لە فۆرمى تەجريدى بير دەكۆڵێتەوە و لەبەر ئەوەيە نيشانەى تەجريد بەكاردێنىَ ، بەلاَم فۆرمى زمان بە شێوەى جياواز دروست دەبىَ تاكو ژيربێژانە لێك بدرێتەوە .

ڕستەسازى وەك بەشێكى ڕێزمان لە دەستەواژە و ڕستە دەدوىَ . ڕستەسازى باسى فۆرمى زمانيى ڕستە دەكات و بەپێى خاسيەتى جۆربەجۆر رستە دابەش دەكا و جيادەكاتەوە . بە وێنە لە ڕستەسازيدا ڕستەى سادە و ڕستەى ناسادە ؛ ڕستەى سەرەكى و ڕستەى شوێنكەوتوو ؛ ڕستەى پرس و ڕستەى سەرسوڕمان جيادەكاتەوە . وێڕاى ئەوە لە زمانناسيدا ڕستەى جۆربەجۆرى ئەم زمان يان ئەو زمان باس دەكرێت .

وەك نيشانماندا ، زمانناسى بە جۆرىَ جياواز بەندە بە زانستى جياوازەوە و ئەو پێوەندييانەش دەشىَ زۆر بەهێزنەبن و دەشىَ زۆريش بىَهێز بن . بەو پىَيە پێوەنديى زمانناسى و ئەنترۆپۆلۆژى تەنيا لە سنوورى كێشەى پەيدابوونى ئاخاوتن دايە . بەلاَم پێوەنديى زمانناسى بە ژيربێژى و دەروونناسى و ئەدەبناسىيەوە پتر بەهێزە .

لەگەڵ ئەوەدا ، كە زمانناسى لەگەڵ گشت زانستەكاندا پێوەندى هەيە ، بەلاَم نكوڵى لەوەش ناكرىَ ، كە زانستێكى سەربەخۆيە . سەربەخۆيى زمانناسى بەر لە هەر شت بناغەى خۆى لەسەر ڕاستيى و بەڵگەى بوونى زمان وەك دياردەيێكى تايبەتيى كۆمەڵ ڕۆناوە .

زمانناسی لە هەموو ڕوویێکی زمان دەکۆڵێتەوە ، بەڵام زانستەکانی دی تەنیا هەندێ ڕووی زمانیان مەبەستە .

بۆ پێوەندیی زمانناسی بە هەر یەکێك لە و زانستانەوەی پێشتر باسمان کردن ، دەکرێ نموونە بهێنرێتەوە . ئەوەتە ئەتنۆگراف و زمانناس لە نیگای جیاوازەوە دەڕواننە وشەی " کوخ" . ئەتنۆگراف دەبێ وەك جۆرێکی شوێنی ژیان دیاریی بکا و خاسیەتی نیشان بدا و مەفهوومی ئەتنۆگرافی ڕوون بکاتەوە . بەڵام بۆ زمانناس ئەو جۆرە تایبەتێتی‌یە ئەتنۆگرافیانە پێویست نی‌یە ، بەڵکو ئەوە مەبەستە چۆن خۆی دەنوێنێ و پێوەندی بە "زنج" و " خانوو"ەوە چی‌یە .

## جۆرەکانی زمانناسی

زمانناسی بریتی‌یە لە زانستێکی فرە بابەت . هۆی ئەمەش ئەوەیە ، زمان خۆی لەخۆیدا هەمەچەشن و گرانە . کۆمەڵ گەلێ مەبەست و نیازی هەمەجۆری لەبەردەم ئەو زانستەدا داناوە ، کە لە زمان ئەدوێ . لەبەرئەوە لە زمانناسیدا زانستی جی‌گیری هەمەڕەنگ ، وەك بەش و سەبەستی زانستەکانی زمان جیاکراونەتەوە ، کە یەکێتی سیستەمی زانین پێکدێنن .

زمانناسی وەك زانستێك دابەش دەبێ بەسەر (گشتی) و (تایبەتی) ؛ (تیۆری) و (پراکتیکی)دا . هەموو ئەمە بەلای فەلسەفەوە

زانستی جیٚگیر و چەسپاون . بەلاٚم زمانناسیی گشتی و تیۆری بەلای تایبەتی و پراکتیکی و بەشەکانیانەوە (دەنگسازی و لیٚکسیکۆلۆژی ... هتد) وەك شیٚوازناسی خۆیان دەنویٚنن .

زمانناسیی گشتی زانیاری لەبارەی هەموو زمانیٚکەوە دەخاتەڕوو و تیۆریی وایان بۆ ڕۆدەنیٚ ، کە لە لیٚکۆلیٚنەوەی زمانانی جیاوازدا کەلٚکیان لیٚ وەربگیریٚ . زمانناسیی گشتی وەك بەشیٚکی زانست لە بارەی زمانەوە خاوەنی ئەنجامی خۆیەتی: ١) دیاری کردنی سروشتی زمان و بوونی ؛ ٢) دەستنیشانکردنی بابەتە بنەڕەتییەکانی زمانناسی و ئاسۆکانی زمان و هەروەها لیٚکۆلیٚنەوەی وشەسازی و لیٚکسیکۆلۆژی ... هتد ؛ ٣) خستنە پیٚش چاوی پیٚکهاتنی زمانان و دابەشکردنیان ؛ ٤) سازکردنی شیٚوازی لیٚکۆلیٚنەوەی زمانناسی .

زمانناسیی تایبەتی زانستیٚکە لە بارەی تاکە تاکەی زمانەوە . بۆ نموونە زانستی زمانی ڕووسی ؛ زانستی زمانی کوردی ...

لە دەمیٚکی یەکجار زوودا ، زمانناسی وەك کۆمەکی پەرش و بلاٚوی زمانناسی تایبەتی بوو: زانستی زمانی گریٚکی؛ زانستی زمانی سانسکریتی . ژمارەی ئەو جۆرە زمانناسییە تایبەتییانە وردە وردە زیادی کرد و لە ئەنجامدا لیٚکۆلیٚنەوەی گشتی لە بارەی زمانەوە پەیدابوو : لە ڕیٚزمانی ئەرنۆ و لانسلۆ و کارەکانی بۆپ و هومبۆلدتدا سروشتی زمان و سیستەمی دیاریکراوە و دابەشکردنی زمانەکانی جیهان و دانانی شیٚواز و لیٚکۆلیٚنەوەی خراوەتە بەرچاو .

هەر زمانناسی‌یێکی تایبەتی بە دانانی فەرهەنگ و نووسینی ڕێزمانەوە دەست‌پێ‌دەکات . بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی ئەم کارانە ، لەتەك زانیاری تایبەتی‌دا ، زانیاریی تیۆریی کێش (Norm) یش پێویستە .
لە ناوەرۆکی هەر زمانناسی‌یێکی تایبەتی‌دا ، خاسیەتی زمان بە گشتی هەیە . ڕاستە لە زانستی زمانی کوردیدا دەنگسازی و ڕێزمان جیادەکرێتەوە ، بەڵام ئەمە بۆ زمانناسیی تایبەتی‌و زمانناسیی گشتی‌یش بە هەمان چەشنە . بەڵێ هەروەها ڕاستە لە هەموو زمانێکدا دەنگەکانی ئاخاوتن بەسەر بزوێن و کۆنسۆنانتدا دابەش دەبن ؛ لەنێو بەشەکانی ئاخاوتندا ناو و کردار دیاری کراون .
بەڵام هەر زمانناسی‌یێکی تایبەتی لە ناوەرۆکی‌دا بەڵگەی ئەوتۆ هەیە ، کە تەنیا بۆ زمانی باس لێ‌کراو ڕاستە و وەنەبێ بۆ هەموو زمانێکی‌دی بگونجێ .
لە دەنگسازی و وشەسازی‌یەوە هەندێ نموونە دێنینەوە ، کە بەڵگەی تایبەتێتی زمانی کوردی‌یە .

نموونە لە دەنگسازی‌یەوە:

لە زمانی کوردیدا دەنگی (ڕ) و (ڵ) بە هیچ جۆرێك لە سەرەتای وشەدا بە کارناهێنرێن . جا ئەم دیاردەیە ، نەك هەر لەزمانانی دوور لە کوردی‌یەوە ، بەڵکو لە گەلێ زمانی ئێرانیشدا وەك کوردی نی‌یە .

نموونە لە وشەسازی‌یەوە:

وەك دەزانین لە دیالێکتی کرمانیجی خواروودا (ی ، ە...)و لە کرمانجی ژووروودا (ا ، ە ، یٚ ، ی ، یٚد / یٚت ، یٚن ....) نیشانەی ئیزافەن و دیارخەر و دیارخراو بەیەکەوە دەبەستن . بەلاّم مەرج نی‌یە ئەم خاسیەتە لە گشت زمانێکدا هەبێ و زۆر زمان هەیە نیشانەی ئیزافەی نی‌یە و بەبێ هیچ یاریدەییێك دیارخەر و دیارخراو یەك دەگرن .

یاخود لە وشەی ناسادەی زمانی کوردیدا پاشگر هەمیشە لە دوای ڕەگی وشەوە دێت و ئنجا بە دوای ئەودا نیشانە – واتە هەردەم پاشگر پێش نیشانە دەکەوێ . بە وێنە : وشەی "مومدانەکە" کە لە وشەی "مۆم" و پاشگری ( – دان)و نیشانەی (– ەکە) دروستبووە ... مەرج نی‌یە لە هەموو زمانێکدا پاشگر یەکسەر لە دوای ڕەگی وشەوە بێت و ئنجا نیشانە بێت . لە هەندێ زماندا ڕێدەکەوێ پاشگر دەکەوێتە دوای نیشانەوە ، واتە بە پێچەوانەی زمانی کوردی‌یەوە . بە وێنە لە زمانی ئەڵەمانیدا وشەی (Kind) بە مانای (منداڵ) دێت و (kinder) بە مانای (منداڵان) ، بەلاّم (Kinderchen) دەبێتە (منداڵۆچکان) . لێرەدا (er) کە نیشانەی کۆیە کەوتووەتە پێش (chen) ، کە پاشگرە بۆ واتای بچووك کردنەوە .

پێویستە زمانناسیی تایبەتی و پراکتیکی لەگەڵ زانینی پراکتیکی زمان تێکەڵ نەکرێن . دەشێ یەکێك بە شێوەی پراکتیکی زمانێك یاخود چەند زمانێك باش بزانێ و کەچی شارەزاییشی لە زانیاریی زماندا نەبێ و بە ڕێی تیۆری ئامادەنەکرابێ . بەپێچەوانەشەوە دەشێ یەکێك

تیۆریی زمان باش بزانیٚ و کەچی زمان زۆر نەزانیٚ . زمانناس بە پسپۆڕی بواری زمان دەوتریٚ . ئەو کەسەش ، کە زمان زۆر دەزانیٚ بە زمانزان بەناوبانگە .

مەیدانی گرنگی چالاکیی پراکتیکی زمانناس وتنەوەی زمانی زگماك و زمانی بیٚگانەیە لە قوتابخانە گشتی و تایبەتی‌یەکاندا . ئەم چالاکی‌یە هەل بۆ دانانی فەرهەنگی هەمەجۆر و ڕیٚزمان دەڕەخسیٚنیٚ .

مەیدانیٚکی دی گرنگی چالاکیی پراکتیکی زمانناس وەرگیٚڕانە لە زمانیٚکەوە بۆ زمانیٚکی دیکە ، یان دانانی زاراوەیە ، یان چارەسەرکردنی گیروگرفتی ڕیٚنووسە ، یان سازکردنی ئەلفوبیٚ‌یە بۆ ئەو میللەتانەی نووسینیان نی‌یە ... هتد .

دوا مەیدانی پراکتیکی زمانناس بریتی‌یە لە زمانناسیی ئەندازیارانە، کە لەم سالآنەی دواییدا سەری هەلٚداوە . ئەوەتە بۆ فیٚربوون و لیٚکۆلٚینەوەی زمان بەکارهیٚنانی وەسیلەی تەکنیکی هەمەچەشن و بەتایبەت کۆمپیوتەر پەیدابووە .

## -٢-
# پەیدابوونی زمانناسی

زمانناسی یەکێکە لە زانستە دێرینەکان و بە ڕێگەیێکی دوور و درێژی فراژۆ و پێشکەوتندا تێپەڕیوە . ویست و ئارەزووی مرۆڤ بەرانبەر بە زمان لە فۆلکلۆری هەموو میللەتێکدا ڕەنگی داوەتەوە: زمان چۆن پەیدابووە ؟ هۆی بوونی زمانانی جیاواز و هەمەجۆر چی‌یە ؟ وشە چی ڕادەگەیەنێ و توانستی چی هەیە ؟ – ئەم پرسیارانە و گەلێ پرسیاری دی ئەو بوارە لە ئەدەبی فۆلکلۆری گشت نەتەوەکانی جیهاندا وەلامیان دراوەتەوە .

بایەخدان بە لێکۆڵینەوەی زمان بە ئاشکرا لە فەلسەفەی یۆنانی کۆندا دەبینرێ ، بە تایبەتی لە بەرهەمەکانی ئەرستۆ (٣٨٤ – ٣٢٢پ . ز .) دا . ئەرستۆ هێشتا کە قوتابی ئەفلاتوون بوو ، قوتابخانەی فەلسەفی‌ی خۆی لە ئەسینا سازکردبوو . قوتابخانەکەی بە تەنیشت پەرستگای ئەپۆلۆنەوە بوو و هەر بۆیەش بەو ناوەوە ناوی نرابوو . قوتابیان و لایەنگیرانی ئەرستۆ گەشەیان بە لێکۆڵینەوەکانی دا و هەروەها بەرهەمەکانیان بە چاپ گەیاند و پەراوێزیان بۆ نووسین .

دەستنووسەکانی ئەرستۆ کۆکرانەوە و بەناوی "میتافیزیقا" وە بلاوکرانەوە . ئەم بەرهەمە فەلسەفی‌یە بۆیە ئەو ناوەی درایە ، چونکە

خراوەتـە دوای "فـیزیك" و "نـەفس و دەروون" و "ژیربیـژی" و "سیاسەت"ەوە .

ئەرسـتۆ لـە ڕووی پێوەندیـی بـە کێشـەی فەلسـەفە (بەتایبـەتی ژیربێژی)یـەوە دەڕوانێتـە باسـی زمانناسـی. پێوەندیـی زمانناسـی بـە فەلسەفەوە ، کە ئەرستۆ دیاریکردووە ، تا ئەمڕۆش هەر لە برەودایە .

وا لێرەدا هەندێ بەندی وتەکانی ئەرستۆ لە بارەی زمانناسییەوە دەخەینە پێش چاو :

"لـەنێو سـەرپاکی گیانلەبـەراندا تـەنیا مـرۆڤ خـاوەنی بـەهرەی زمانە".

"وشـە کـە بـەدەنگ دەردەبـڕێ نیشـانەی زادەی گەوهـەری دەروونە..."

"بەر لە هەر شت پێویستە ئەوە دیاری بکرێ ، کـە نـاو چییـە و کردار چییە ، ئەوجا ئەرێ و نەرێ (مثبت و منفي) و لـەبار و نالـەبار (سلب و ایجاب) دەستنیشان بکرێن" .

"وەنەبێ گشت ڕستەیێك حوکم بێت ، تەنیا ئەو ڕستەیە حوکمە ، کە لەسەر ڕاستی یان لەسەر درۆ بینـا کرابـێ . بـۆ نموونـە داخـوازی ڕستەیە ، بەڵام نە ڕاستە و نەدرۆ".

"... جۆرەکانی دی ڕستە لێرەدا ڕەچاو نـەکراوە ، چونکـە ئەمانـە هیـچ پێوەندییـان بەسـەر ژیربێژییـەوە نییـە و ، بەڵـکو کەرەسـتەی شـیعر و خطابەن و ئێمە پشت گوێیان دەخەین" .

"باشـیی و سـەرکەوتوویی شـێواز لـە ڕوونـی و ئاشـکراییدایە ، بەڵگەی ئەمە ئەوەیە ، ئەگەر وتە ڕوون نـەبێ نیشان ناپێکێ . شـێواز

نابێ یەکجار نزم بێت ، یەکجار بەرزبێت ، بەڵام دەبێ شان بەشانی وتنەکە بێت" .

"چالاکیی دارشتن لە روونی و نزمی نەبوونیدایە . روونترین دەربرین ئەوەیە لە وشەی باو پێکهاتبێ ، بەڵام ئەمە دارشتنی نزمە . هەرچی دارشتنی بەرزە ، ئەوەیە لە سەروو زمانی ئاخاوتنەوە بێ و وشەی بەرز و رەسەنی تێدا بەکار هێنرابێ" .

"ئەو وشانەی هەموان بەکاریان دێنن تەواون و میتافۆرن و تاکە کەرەستەیە کە بەکەڵکی زمانی پەخشان بێت" .

هۆی پراکتیکی پەیدابوونی زمانناسی بریتییە لە پێویستیی فێربوونی خوێندنەوە و تێگەیشتن لە نووسین ، بە تایبەتی ئاسەوار و یادگاری سەدە رابوردووەکان . بەڵێ ئەم پێویستییەی کۆمەڵ بووە هۆی پەیدابوونی باسی رێزمان لای هیندییەکانی زوو و گریکییەکانی کۆنی ئەسکەندەرییە .

لە هیندستانی کۆن بۆ یەکەم جار (پانینی) – (نیوەی دووەمی سەدەی چوار و سەدەی سێی پ . ز . ) رێزمان (لە یادگاری ئەدەبی هیندیی کۆندا – وەسفی زمان – ی پیرۆزتراوە)ی نووسیوە . بنەمای ئەم لێدوانە بریتییە لە دابەشکردنی وشە لەسەر بناغەی رەگ (پارچەی گشتی) و کۆتایی (پارچەی وشەگۆر) . لەم رێزمانەدا نزیکەی دوو هەزار رەگ هێنراوەتەوە و واتاکانیان نووسراوە . یاسای دۆخ و گەردانیان نیشاندراوە .

رێزمانی ئەسکەندەرییە لە سەدەی دووەمی پێش زایندا نووسرا . رێزماننووسان لە دەستنووسەکانی کتێبخانەی ئەسکەندەرییە

دەکۆڵنەوە ، بە تایبەتی یادگاری بەرهەمەکانی هۆمیرۆس ... (ئەریستارخ) و (دیۆنیسی) و (ئەپۆلۆنی دیسکۆلٚ) بەناوبانگترین نووسەری ڕێزمانی ئەو سەردەمە بوون .

ڕێزمانی ئەسکەندەری‌یە بایەخێکی زۆری بە لێکۆڵینەوەی خاسیەتی وشەسازی (مۆرفۆلۆژی) و دابەشکردنی وشە بەسەر بەشەکانی ئاخاوتندا داوە .

لەو نووسینانەدا هەشت بەشی ئاخاوتن دیاری‌کراون : ناو ، کردار، ناوی کارا و ناوی بەرکار ، ئامراز ، جێناو ، پێشبەند ، ئامرازی پێوەندی ، ئاوەڵکردار . ڕۆمانەکان ئەو لێکۆڵینەوە یۆنانی‌یەیان بە دەستکاری‌یێکی کەمەوە بۆ زمانی لاتینی وەرگرت . دواتر لە سایەی دەوری زمانی لاتینی‌یەوە لە کولتووری سەدەکانی ناوەڕاستدا ، بۆ توێژینەوەی ڕێزمانی گشت زمانە ئەوروپاییەکان بەکارهێنرا .

هەنگاوی دیاری زمانناسیی ئەوروپایی لە سەدەکانی ١٧ - ١٨ دا نرا . لەو ماوەیەدا بەرهەمی گەورە گەورە لە بارەی زمان و پەیدابوونی زمانەوە پەیدابوو . بە وێنە "تاقی‌کردنەوە لەبارەی پەیدابوونی زمانەوە"ی ژ . ژ . ڕۆسۆ (١٧٦١) ؛

"لێکۆڵینەوە لە بارەی پەیدابوونی زمانەوە"ی ئی . هێردێر (١٧٧٢). هەروەها لە بەرهەمە فەلسەفی و مێژووی‌یەکانی چ . ڤیکۆ ، ر. دیکارت ، لێیبنیس‌دا تیشکی ڕووناکی خراوەتە سەر کێشەی زمانناسیی گشتی‌یەوە .

لەو چاخەدا دوو جۆر ڕێزمان پەیدابوو : گشتیی (ژیربێژی) و کێشەکی[7] (فەلسەفی)... جۆری سێیەم و چوارەمی ڕێزمان (بەراوردی و مێژوویی) درەنگتر پەیدابوون - لە سەدەی ١٩دا .

"ڕێزمانی گشتیی ژیربێژی" (١٦٦٠) لە لایەن ڤنایانی فەرەنسایی (ئا . ئەرنۆ)ی ژیربێژ و (ك .لانسلۆ)ی زمانەوانەوە نووسراوە . ئەم کتێبە هەروەها بە ڕێزمانی پۆر - ڕۆیال" یش بەناوبانگە ، چونکە لەو پەرستگایەی نێزیك پاریس کە لێی چاپ کراوە ، ئەو ناوەی دراوەتێ .

بە ڕای ئا . ئەرنۆ و ك . لانسلۆ ڕێزمان ، هونەری نووسین و قسەکردن نییە[8] ، بەڵکو شیکرنەوەی زمانە . ڕێبازی ڕێزمانی گشتی خاوەنی دوو بنەمای هاوپەیوەندین - ددان نان بە دەستووره گشتییەکانی ڕێزمان و بناغە ژیربێژییەکانیاندا . ئەم ڕێزمانە لە دەنگسازی و وشەسازی و ڕستەسازی پێکهاتووە . لێرەشدا بە هەمان شێوەی قوتابخانەی ئەسکەندەرییە لە دۆخەکانی ڕێزمانی و بەشەکانی ئاخاوتن کۆڵراوەتەوە . ناو بەسەر ناوی بوونەوەر و ئاوەڵناودا دابەشکراوە . ڕستەسازی لە دەستەواژە و ڕستە دەدوێ ، کەوا لە ژیربێژییشدا باس دەکرێ .

---

[7] المعیاری .

[8] بە زمانی یۆنانی بە ڕێزمان دەڵێن (Grammatika) ، کە واتای (هونەری نووسین) دەگەیەنێ . زانایانی ڕووی یۆنان وا تەماشای ڕێزمانیان دەکرد ، کە دەبێ بەر لە هەرچی لە ڕووی ڕێنووس و لە ڕووی شێوازەوە مرۆڤ فێری ڕاستنووسی بکات (وەرگێڕ).

بەجووڕای ژێربێژان و زمانەوانانی کتێبی پۆر - ڕۆیال بە ناوی ڕێزمانی فەلسەفی‌یەوە لە گشت وڵاتانی ئەورووپادا بڵاوبووەوە و پەرەی سەند .

لە ڕوسیا ئەم جۆرە ڕێزمانانە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا سەری هەڵدا و بەناوبانگترینیان "نووسینی ڕێزمانی گشتی" ی ل. گ. یاکوبە .

ڕێزمانی فەلسەفی بەرانبەر ڕێزمانی فیلۆلۆژی ڕادەوەستێ . بە هەردووکیان دەوترێ ڕێزمانی کێشەکی یان وەسفی . ئەرکیشیان لێکدانەوەی قاڵبی چەسپاوی زمانی نووسین و ئەدەبە .

ڕێزمانی وەسفی کێشەکی "ڕێزمانی ڕووسی" (١٧٥٥)ی م . ف . لۆمۆنۆسۆڤە . لەم بەرهەمەدا باسی بەشەکانی ئاخاوتن ، کە لۆمۆنۆسۆڤ (بەشەکانی وشە)ی پێ‌وتوون ، کرۆکی لێکۆڵینەوەی باسەکانی زمانی ڕووسی‌یە . ئەو بەشە ئاخاوتنانەش کە دیاری‌کردوون ئەمانەن : ناو (ناوی بوونەوەر ، ئاوەڵناو ، ژمارە) ، جێناو ، کردار ، ناوی کارا و ناوی بەرکار ، ئاوەڵکردار ، پێشبەند ، ئامرازی پەیوەندی ، ئامرازی سەرسوڕمان . ڕستەسازیی ئەو بەشانەی ئاخاوتن ، بەتایبەتی باسی ڕستەی سادە و ڕستەی ناسادە دەبەستێ بە ڕەوانبێژی‌یەوە ، بەو پێ‌یە ڕێزمان نەك هەر بە ژێربێژی‌یەوە بەندە ، بەڵکو پەیوەندی بە ڕەوانبێژیشەوە هەیە .

لە هەمان سەردەمدا دوو جۆر فەرهەنگ پەیدابوو : فەرهەنگی فرەواتا و فەرهەنگی لێکدانەوە . نموونەی فەرهەنگی فرەواتا "بەراوردیی هەموو زمان و شێوەکان"ە ، کە پ . س . پالاس سالی

١٧٨٧ لە پیترسبورگ بلاوی کردووەتەوە . لە چاپی دووەم (١٧٩١)ی ئەم فەرهەنگەدا وشەی (٢٧٢) لە زمان و دیالێکتەکانی ئەوروپا و ئاسیا و ئەمەریکا و ئەفەریقیای تێدایە .[٩]

یەکەم فەرهەنگی لێکدانەوە ، فەرهەنگێکی زمانی ئیتالیە ، کە بە ناوی "فەرهەنگی ئەکادیمی کروسك" (١٦١٢) ەوەیە . سالی ١٦٩٢ "فەرهەنگی ئەکادیمیای فەرەنسا" چاپکرا . سالی (١٧٨٩-١٧٩٤)یش "فەرهەنگی ئەکادیمی ڕوسیا" بلاوکرایەوە .

-٣-

## زمانناسیی سەدەی نۆزدەیەم

لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی و ڕێبازی بەراوردیی مێژوویی پەیدابوو . لە کرۆك و بنەڕەتی کارەکانی ی . د . دۆبرۆفسکی ، ئا . خ . ڤۆستۆکۆڤ ، ف . میکلۆشیچدا سیما و دیمەنی زمان و ئەدەبی زمانە سلاڤیانییەکان هەیە . لە بنج و بنەمای بەرهەمەکانی ر . ڕاسك ، یا . گریم ، ف . بۆپدا هەوێنی زمان و ئەدەبی زمانە جەرمانییەکانی تێدایە .

لێکۆلینەوەی زمانی بەراوردیی زمانە هیند و ئەوروپاییەکان سەری هەلدا : ف . بۆپ سالانی ١٨٣٣-١٨٤٩ " ڕێزمانی بەراوردی زمانی

[٩] شایانی باسە ، زمانی کوردیش یەکێکە لەو (٢٧٢) زمانانەی ئەو فەرهەنگە (وەرگێڕ) .

سانسکریتی و زەندی و گریکی و لاتینی و لیتوانی و گۆتی و ئەڵەمانی"ی بڵاوکردەوە . ساڵانی ١٨٦١ - ١٨٦٢ "کورتە بەراوردێکی ڕێزمانی زمانە هیندی و ئەوروپاییەکان" ی شلێخەر لە چاپ درا .

لە تەك ڕێزمانی بەراوردی گشت زمانی هیند و ئەوروپاییەکان و دەستەی جیاجیای ئەو خێزانی زمانەدا ، هەروەها لێکۆڵینەوەی مێژوویی لە ڕێزمانی تاکەتاکەی ئەو زمانانە هاتە ناوانەوە . یا . گریم ساڵانی ١٨١٩- ١٨٣٧ بە چوار بەرگ "ڕێزمانی ئەڵەمانی" ی بڵاوکردەوە . ف . ئی . بوسلاییڤیش ساڵی ١٨٥٨ "تەجروبەی ڕێزمانی مێژوویی زمانی ڕووسی" لەچاپدا .

ڕێزمانی بەراوردی زمانە خزمەکان و ڕێزمانی تاکە تاکەی زمان ، بناغەی ڕێبازی مێژوویی لە زمانناسیدا دانا . دیاریکردنی پلە و ڕادەی خزمایەتی لە نێوان زمانانی جیاوازدا و دابەشکردنی بنەچەیی و وشەسازیی زمانانی هێنایە ئاراوە .

فەلسەفەی زمان ، کە ڤ . ف . هۆمبولدت لەو کتێبە سێ بەرگییەدا- "دەربارەی زمانی کاوی لە دوورگەی یاوا" (١٨٣٦ - ١٨٣٩) بینایکردووە ، کارێکی زۆری کردە سەر زمانناسی . هۆمبولدت لەو ڕایەدایە ، کە زمان ئەنجامی چالاکیی تاکایەتییە و توند و پتەو بە وزەی هۆشی میللەتەوە بەندە . هۆمبولدت نووسیویە : " زمانی میللەت گیانی میللەتە ، گیانی میللەتیش زمانی میللەتە" . پێوەندیی زمان و کۆمەڵ ؛ زمان و هۆش واقیعی زمان و خاسیەتی هەمیشەییەتی، کە فۆرمی زمانی سازکردووە . فۆرمی زمان بریتییە

لە یەکێتی دوو لایەنی دانەکانی زمان ؛ مایەکی (المادی) و نموونایەتی (المثالیة) ، کە پێکەوە فۆرمی ناوەکی و دەرەکی زمان پێك دێنن .

فۆرمی دەرکی‌ی زمان بریتی‌یە لە سیستەمە دەنگی‌یەکەی و هەروەها فۆرمی ڕێزمانی و ئێتیمۆلۆژی (ڕەگ) . فۆرمی ناوەکی بریتی‌یە لە یەکێتی فۆرمەکانی زمان ، کە ڕێگە بۆ خۆزانینی میللەت خۆش دەکەن . فۆرم سەنگ بە زمان دەدات و هۆش و ئاگای زمان دەردەبڕێ و لە فۆرمی ژێربێژی جیاوازە ، کەوا بۆ گەیشتنە ڕاستی ، تێگەیشتنی گشتیی مرۆڤ و ئەو یاسایانەی تێگەیشتنەکە شی‌دەکەنەوە دەردەبڕێ. هۆمبولدت لەو ڕایەدا بوو ، کە لێکۆڵینەوە لە فۆرمی زمان نابێ بە ڕێگەی ئەنجامگریی حوکمی ژێربێژی بێ ، بەڵکو پێویستە بە ڕێگەی بەراوردکردنی فۆرمی زمانانی جیاوازی نزیك و دوور ، پێشکەوتوو و دواکەوتوو و لێکدانەوەی هەموو کەرەستەی بەردەست و چوونە ناو سروشتی زمانەوە .

پاش هۆمبولدت بەرانبەر یەکتر ڕاگرتنی لێکۆڵینەوەی ژێربێژی و مێژوویی ؛ هەمەکی و تاکایەتی ؛ ژێربێژی و دەروونی ؛ فۆرم و واتا بووە شتێکی ئاسایی تیۆری زمانناسی . لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمدا ڕێبازی ژێربێژی و دەروونی لە زمانناسیدا پێدەگات و لە زمانناسیی ئەمڕۆدا جێ‌پەنجەی دیارە .

ڕێبازی ژێربێژی لە زمانناسیدا کۆششی دۆزینەوەی خاسیەتی گشتی‌ی واتای دەدا لە زماندا . ڕستە لەگەڵ حوکمی وشەکان و مەفهوومدا دەگونجێ . بایەخێکی زۆر بە شیکاری درا . ڕێبازی ژێربێژی بەر لە ڕێبازی دەروونی گەلاڵە بوو و سەدەی حەڤدەیەم لە

فەرەنسا لە "ڕێزمانی گشتیی ژێربیژی"ی ئا . ئەرنۆ و ك . لانسلۆدا خراوەتە پێش چاو . لە سەدەی نۆزدەیەمدا ڕێبازی ژێربێژیی ڕێزمان لە هەندێ ولات سەری هەلدا : ف . ی . بوسلاییڤ ، نووسەری "ڕێزمانی مێژوویی زمانی ڕووسی" نوێنەری هەرە گەورەی ئەم ڕێبازە بوو لە ڕووسیا .

ڕێبازی دەروونی لە زمانناسیدا کۆششی چەسپاندنی سروشتی چالاکیی ئاخاوتن و تایبەتێتی‌یە ناوەکی‌یەکانی فۆرمی زمانی دەدا . زمانناسانی ڕێبازی دەروونی لە باری هەمەکی‌یەوە دەیانڕوانی‌یە چالاکیی ئاخاوتن ، کە تێیدا بەراورد و دەرك دەورێکی گەورەتر دەبینن، وەك لە دەستووری ژێربێژی . لایەنگیرانی ڕێبازی دەروونی لێکۆڵینەوەی دۆخەکانی ڕێزمان و واتای وشە (واقیعی و مەجازی)یان دامەزراند .

لە پێگەیاندنی ڕێبازی دەروونی‌دا گ . شتێینتال و ف . ودنت دەوری گەورەیان بینی . لە ڕووسیا ئا . ئا . پۆتێبنیای نووسەری کتێبی "بیرو زمان" و "ڕێزمانی ڕووسی" بناغەی لێکۆڵینەوەی ڕێبازی دەروونیی زمانناسی دانا . چالاکیی ئاخاوتنی شی‌کردەوە و بەردی بناغەی لێکۆڵینەوەی بەراوردیی مێژوویی ڕستەسازیی زمانە سلاڤیانی‌یەکانی دانا .

قوتابخانەی لایبزك دەورێکی دیار و گەورەی لە پێشخستنی زمانناسیدا بینی . نوێنەرانی ئەم قوتابخانەیە بە ڕێزمانناسانی لاو ناسراون و ك . برۆوگمەن ؛ ب . دێلبرووك ؛ ئالیسکین ؛ گ . پاول لە ناویاندا جێگەی تایبەتی‌یان وەرگرتووە . کتێبی "بنەمای مێژووی

زمان" (١٨٨٠)ی گ . پاول ، نەك تەنیا ئەنسكلۆپیدیای ڕێزماننناسانی لاو بوو ، بەڵكو یەكەم لێكۆڵینەوەی ڕێكوپێك و تێروتەسەلی زمانناسیی گشتی‌یش بوو .

ڕێزماننناسانی لاو وەك خاوەنی قوتابخانەیێكی بەراوردیی مێژوویی گشتی و تایبەتی زمانناسی هەوڵیان دەدا بنەمای مێژوویی و چەسپاو لە زمانناسیدا پتەو بكەن . وایان دادەنا ، كە مرۆڤی ئاخێوەر كەرەستەی زمانناسی‌یە و بۆیە دەبێ زمانناسی بە دەروونناسی و لێكۆڵینەوەی كولتوورەوە بەند بێ . نوێنەرانی قوتابخانەی لایبزك بایەخیان بە مەفهوومی یاسای ناوەكی زمان – لێكۆڵینەوە لەبارەی گۆڕانی دەنگ و پێوانە و هاوسەنگی - دا و واتاناسی و لێكۆڵینەوەی دیالێكتیان هێنایە مەیدان و ئەمانەش بوونە هۆی پەیدابوونی كۆمەڵایەتیی زمان .

-٤-

## بیروڕا و ڕێبازی قوتابخانە هاوچەرخەكانی زمانناسی

لە كۆتایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا ، لەتەك قوتابخانەی لایبزك (ڕێزماننناسانی لاو)دا ، قوتابخانەی كازان و قوتابخانەی مۆسكۆ و قوتابخانەی جنێف پەیدا بوو .

ی . ئا . بۆدوئێن دێ كورتەنی دامەزرێنی قوتابخانەی زمانناسیی كازان بوو و لە سالانی ١٨٧٥-١٨٨٣ دا لە زانستگەی كازان كاری

دەکرد و لەسالانی ١٩٠١-١٩١٦یشدا لە زانستگەی پیتربۆرگ بوو . ن . ف . کروشێفسکی و ڤ . ئا . بۆگۆرۆدیتسکی و دواتر ل . ڤ . شێربا و ێ . د . پۆلیڤانۆڤ هاوبیری ئەم قوتابخانەیە بوون . قوتابخانەی کازان مەیدانی لێکۆڵینەوەی زمانناسی فراوان کرد و لە یەك کاتدا تیۆری و پراکتیکی بەرانبەر یەکتر راگرت .... بایەخێکی تایبەتی بە گەڵاڵەکردنی تیۆریی فۆنێم و گۆڕانی فۆنەتیکیو مۆرفێم و جۆرەکانی مۆرفێم و پرۆتسێسی وشەسازی دا .

ف . ف . فۆرتوناتۆڤ - پرۆفیسۆری زانستگەی مۆسکۆ ، دامەزرێنی قوتابخانەی زمانناسیی مۆسکۆ بوو . ێ . ف . بوددی و ڤ. ك . پۆرژێزینسکی و م . م . پۆکرۆڤسکی و د . ن . ئوشاکۆڤ و ئا . ئا . شاخمەتۆڤ و ئا . م . پیشکۆڤیش بە نوێنەرانی دیاری ئەم قوتابخانەیە دەژمێررێن . قوتابخانەی مۆسکۆ شان بەشانی تۆژینەوە لە کێشەی جۆربەجۆری دەنگسازی و وشەسازی هیند و ئەورپایی ، لە مێژووی زمانی رووسییان کۆڵیەوە و درێژەیان بە نەریت و رێبازی ی . ی . سریزنێفسکی و ف . ی . بوسلاییڤ و ئا . ئا . پۆتێبنیا دا .

فۆرتوناتۆڤ و هەڤالانی لە ساغ کردنەوەی رێزمانی گشتیدا ئەنجامی باشیان وەدەست هێنا ، بەتایبەتی لەبارەی لێکۆڵینەوەی فۆرمی وشە و فۆرمی دەستەواژەوە .

ف . دێ . سۆسسیور دامەزرێنی قوتابخانەی جنێفە و سەرەتا لە پاریس دەرزی دەوتەوە و لەپاشدا لە جنێف . سالی ١٩١٦ "لێکۆڵینەوەی زمانناسیی گشتی"ی بلاوکردەوە . بیروڕای سۆسسیور

لە نووسینەکانی ش . باللی و ئا . مێیە و قوتابیانی : ژ . ڤاندییسا و ئ . بێنڤێنیستادا ڕەنگی داوەتەوە و گەشەی پێدراوە .

ئەگەر ی . ئا . بۆدوئێن دێ کورتەنێ و ف . ف . فۆرتوناتۆڤ بایەخی سەرەکییان بە فۆنێم و مۆرفێم ؛ فۆرمی وشە و فۆرمی دەستەواژە دابێ ، ئەوە سۆسسیور پێوەندیی کەرەستەی زمانی بە کاری سەرەکی زمانناسی داناوە ، چونکە وەك سیستەمی نیشانە دەیڕوانییە زمان و وتوویە : "پاشگر و بناغە تەنیا لە سنووری پەلهاویشتن و کۆبوونەوەیاندا واتا دەگەیەنن" . بە پێی بۆچوونی سۆسسیور ، زمانناسیی خۆی لەخۆیدا لە کۆبوونەوەی چەند زانستێك پێکهاتووە : زمانناسیی زمان و زمانناسیی ئاخاوتن ؛ زمانناسیی ناوەکی و زمانناسیی دەرەکی ؛ زمانناسیی وەسفی و زمانناسیی مێژوویی .

ئەگەرچی لە کارەکانی ی . ئا . بۆدوئێن دێ کورتەنێ و ن . ڤ . کروشێڤسکی و ف . ف . فۆرتوناتۆڤ و ئا . ئا . شاخمەتۆڤ و سۆسسیور و باللی و مێیەدا کێشە سەرەکییەکانی زمانناسیی هاوچەرخ ـ بەراوردی ، کۆمەڵایەتی ، بنیوی ـ ناوەڕۆك بوون ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵانی ٣٠ـ٤٠ی سەدەی بیستەمدا ڕێبازێکی نوێی زمانناسیی ـ بنیوی پەلهاویشت . زانایانی قوتابخانەکانی پراگ (براغ) و ئەلیسکا و کۆپنهاگن ڕابەری ئەم ڕێبازە بوون .

کۆڕی زمانناسیی پراگ ساڵی ١٩٢٦ پەیدابوو و . ماتێزیوس دایمەزراند . ن . س . ترووبێتسکی و ر . ۆ . یاکۆبسۆن و ب . گاڤرانیك و ڤ . سکالیچکە ئەندامانی چالاکی بوون . خاسیەتی

قوتابخانەی پراگ بەتایبەتی لە سنووردانان لە نێوان زمان و ئاخاوتندا و تێگەیشتنی زمان وەك ئەرکدا بوو . لەبەر ئەوەی لە کۆڕی زمانناسیی پراکدا تیۆریی ئەرك لە پلەی یەکەمدابوو ، بۆیە ئەم قوتابخانەیە بە قوتابخانەی ئەرکایەتی‌یش ناودەبرێ .

دامەزرێنەری قوتابخانەی ئەلیسکای زمانناسیی ئەمەریکایی ل . بلومفیلدی نووسەری کتێبی "زمان" (١٩٣٣) بوو . بەناوبانگترین نوێنەرانیشی : ز . هاریز و چ . هۆکێت بوون . بابەت و کەرەستەی زمانناسی بەلای ئەم قوتابخانەیەوە تێکست و پارچە و مۆرف و دەنگن ؛ وشە ئەنجامی فۆنیم و مۆرفیمە ؛ پێکهاتن ئەنجامی ئەو پێکهێنەیە ، کە دەشێ وشە و مۆرفیم بن . نوێنەرانی قوتابخانەی ئەلیسکا لەو ڕایەدا بوون ، کە پێشخستن و نەهێشتنی ناتەواویی ڕێبازی وەسفی ئەرکی سەرەکیی زمانناسی‌یە . هەر لەبەر ئەوەشە ، کە قوتابخانەی ئەلیسکا بە قوتابخانەی وەسفی (Descriptive) زمانناسی بەناوبانگە .

کۆڕی کۆپنهاگن لە سەرەتای سالآنی ٣٠دا پەیدا بوو . ڕابەر و دامەزرێنەری ئەم قوتابخانەیە ل . ئێلمسلێڤ بوو ، کە تیۆری‌یەکەی خۆی ناونابوو Glossemantics . گلۆسیمانتیك بریتی‌یە لە هەوڵێك بۆ هێنانە ئەنجامی تیۆری‌یێکی بەڵگەنەویستی زمانناسی لە جیاکردنەوەی تەن و ئەرکدا . تەن ــ نیشانەی دانەیە ؛ ئەرك ــ پێوەندیی نێوان ئەندامانی ئەرکگیرە . بەپێی بۆچوونی ئێلمسلێڤ تیۆریی زمانناسیی بریتی‌یە لە شێواز و ڕێبازی تیۆریی زمانناسی . شێواز و ڕێبازی ئێلمسلێڤ . نموونەی نەخشەکێشانی ژێربێژیی

بیرکاری‌یە . وێنەیێکی دی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوەیە ، شێواز و ڕێبازی بزوێن و بگۆڕی ن . چۆمسکی‌ی زانای ئەمەریکایی‌یە .

خاسیەتی ڕووتی ژێربیژی لێکۆڵینەوەی بنیوی زانایانی وەك ئێلمسلێڤ و چۆمسکی لە سالانی ٦٠دا نەك هەر بووە مایەی ڕەخنە لە بیروڕایان ، بەڵکو بووە هۆی دەرگاکردنەوەی بایەخدان بە کێشەی کۆمەلایەتیی زمان و دەروونناسیی ئاخاوتن و ئەندازیارێتی زمانناسی .

بەئاسانی هەست بەوە کرا ، کە زمانناسیی هاوچەرخ پێویستی بە فراوانبوونی سنوورەکانێتی ، بەتایبەتی دوای ئەو هەنگاوە گەورە زمانەوانی‌یانەی لە زۆر ولاتی جیهاندا نرا و لە نێوانیشیاندا لە یەکێتی سۆڤێت .

زمانناسیی سۆڤێت پشت بە فەلسەفەی مارکسیزم _ لێنینیزم و تەجروبەی پێکهاتنی زمان لە یەکێتی سۆڤێت دەبەستێ و کەڵك لە نەریت و ڕێبازی زمانناسیی خۆماڵی و هەندەران وەردەگرێ ... لێکۆڵینەوە لە کەرەستەی (١٣٠) زمانی میللەتانی یەکێتی سۆڤێت تاقیکردنەوەیێکی کەم وێنەی زمانناسی‌یە . کەرەستەی دەوڵەمەندی شارەزایانی زمانی ڕووسی ؛ پێشکەوتنی بەگوڕی لێکۆڵینەوەی زمانی ئوکراینی ؛ هەنگاوی گەورەی تۆژینەوەی زمانە هیندو ئەورووپایی‌یەکان و زمانەکانی قەفقاس و ئاسیا و هەروەها گەلێ زمانی دی ئەودیو سنووری یەکێتی سۆڤێت باشترین زەمینەی گەشەکردن و سەرکەوتنی زمانناسیی سۆڤێتین .

سیمای دیار و ئاشکرای زمانناسیی سۆڤێتی بریتی‌یە لە ددان‌نان بە کۆمەڵایەتیی سروشتی زمان و لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵایەتیی زمان . دەوری رابەریی رێبازی کۆمەڵایەتیی لە زمانناسیی سۆڤێتی‌دا نەك تەنها مەرجی تێگەیشتنی سروشتی دیاردەی زمانە ، بەڵکو پێوەندێتی تیۆریی زمانناسی‌یشە بە ئەرکی بیناى رۆشنبیری‌یەوە و ددان‌نان بە دەوری چالاکی زانست لە کۆمەڵی سۆشیالیستی‌دا .

یەکێ لە لایەنە بەهێزەکانی زمانناسیی کۆمەڵایەتیی سۆڤێتی بریتی‌یە لە سازکردنی تیۆریی کێش (Norm)ی زمان و زمانی ئەدەبی . دەوری دیاری یەکەم جار دانانی ئەلف و بێ بۆ گەلێ زمان و نووسینی رێزمان و فەرهەنگ بۆیان ، بوونە هۆی روونکردنەوەی کێشەی جۆربەجۆری زمانناسی .

تەجروبەی پێشکەوتنی زمانی ئەدەبی‌ی زمانانی جۆربەجۆری میللەتانی سۆڤێت و سازکردنی تیۆریی زمانی ئەدەبی جێگەیان لە تیۆری و پراکتیکی زمانناسیی نێو میللەتاندا دیار و تایبەتە . لە تیۆریی سۆڤێتی زمانی ئەدەبیدا وەنەبێ تەنیا لایەنی زمانناسیی گشتی رەچاوکرابێ ، بەڵکو رووی کۆمەڵایەتی‌و سیاسی و کێشەی کێشی ئەدەبی و کولتووری ئاخاوتن‌یش لەبەرچاو گیراوە و رێگای هەمەجۆری دروستبوونی زمانی ئەدەبی و شێوازەکانی و پێکەوەبەندیی فۆرمی کۆمەڵایەتیی گشتیی خەڵك و جۆرەکانی کۆمەڵایەتیی زمان ، بەتایبەتی زمانی میللەتانی جیاجیا و زمانی نەتەوایەتی‌یان . زمانناسیی سۆڤێتی لەسەر بناغەی کەرەستەی زمانانی جیاواز گەشەیان بەو بیروڕایەی لێنین داوە ، کەوتوویە :

یەکێتی زمان و پێشکەوتنی بێگیروگرفتی ، مەرجی بنەڕەتیی نەتەوەیە .... چالاکانە لێکۆڵینەوە لە گەلێ ڕووی زمانانەوە کرا و بەراوردی فۆرمی ئەرکیان و پێشکەوتنیان خرایە بەرچاو . ئەنجامی گەورە لە مەسەلەی لێکۆڵینەوەی دیالێکتدا وەدەستهێنرا و ئەوە بوو نووسینی زانستی و تێروتەسەل سەبارەت بە دیالێکتی گەلێ زمان بلاوکرایەوە و ژمارەیێك فەرهەنگی ئەو بوارە لەدایك بوون .

ڕێبازی مێژوویی تیۆریی زمانناسیش بەپێی باروودۆخی خۆی گەشەی سەند . لە ڕێی ئەم تیۆرییەوە هۆیەکانی فراژۆبوونی زمان ؛ یاسا گشتی و تایبەتییەکانی پێشکەوتنی زمان ؛ ڕێباز و شێوازی بەراوردیی مێژوویی ؛ ڕێزمانی مێژوویی ... ساغکرانەوە و نووسران . لێکۆڵینەوە لە زمانە هیند و ئەورووپاییەکان و لەنێو ئەوانیشدا زمانە سلاڤیانییەکان و ڕێزمانیان بابەتی هەرە دیاری کاری بەراوردیی مێژوویی بوون .

لە زمانناسیی سۆڤێتیدا لەسەر بناغەی کەرەستەیێکی زۆری زمانانی جیاواز ، توانرا تیۆریی دابەشکردنی زمان بەپێی باری وشەسازی ئەنجام بدرێ . ئەوەبوو ی . ی . میشانینۆف دابەشکردنی واتایی ـ ڕستەسازیی زمانانی داهێنا .

ڕوویێکی دیار و بەرچاوی زمانناسیی سۆڤێتی بریتییە لە هێنانە ناوانی تیۆریی سیستەمی زمان و پێشکەوتنی چالاکی زمانناسی ، کە لە ئاسۆی جیاجیای سیستەمی زمان دەکۆڵێتەوە . ئەمەش نەك هەر بووە هۆی دابینکردن و چەسپاندنی فۆنۆلۆژی و مۆرفۆلۆژی و

سینتاکس و لێکسیکۆلۆژی ، بەڵکو وشەڕۆنان و فرێزیۆلۆژیشی وەك چالاکی‌یێکی سەربەخۆی زمانناسی جیاکردەوە .

ی . ی . میشانیکۆڤی نووسەری کتێبی "لێکۆڵینەوەی نوێ لەبارەی زمانەوە . جۆرەکانی قۆناغ" (١٩٣٦) ؛ "زمانناسیی گشتی کێشەی قۆناغ لە پێشکەوتنی وشە و ڕستەدا" (١٩٤٠) ؛ "ئەندامەکانی ڕستە و بەشەکانی ئاخاوتن" (١٩٤٥) گرنگی و بایەخی بنەو بنچینەی پێوەندی زمان و کۆمەڵ ؛ زمان و بیر ؛ یەکێتی پرۆتسێسی بەرهەمی زمان ؛ قۆناغ لە پێشکەوتنی زماندا ؛ یەکێتی و جیاوازیی زمانان ؛ بەشەکانی ئاخاوتن و ئەندامەکانی ڕستە ... ی خستووەتە پێش چاو . ئەمانە و دۆزینەوەی تیۆری مەفهوومی حاڵەت و جۆرەکانی دابەش‌کردنی مۆرفۆلۆژی _ سینتاکس و ڕێبازی ئەرکی واتا دەوری گەورەیان لە پێشخستنی زمانناسیدا بینی .

ل . ڤ . شێربا ، کە پێڕەوی ڕێبازی بۆدوئێنی دەکرد ، دانەری ئەو تیۆری‌یەی زمانناسی‌یە بوو، کە پشت بە تێبینی و ئەزموونی زمانناسی و ڕێڕەوی بنەچەیی لە دەنگسازیدا دەبەستێ . ساڵی ١٩٧٤ هەندێ کاری هەڵبژاردەی بە ناوی "سیستەمی زمان و چالاکیی ئاخاوتن"ەوە بلاّوکرانەوە .

ڤ . ڤ . ڤینۆگرادۆڤ ، کە قوتابی شاخمەتۆڤ و شێربا بوو ، گەورەترین زمانناسی ڕووسی ناوەڕاستی سەدەی بیستەمە . کارە سەرەکی‌یەکانی : "لەبارەی مێژووی زمانی ئەدەبیی ڕووسی سەدەکانی ١٧-١٩ەوە " (١٩٣٤) ؛ "زمانی ڕووسی . لێکۆڵینەوەی ڕێزمانی لەبارەی وشەوە" (١٩٤٧) ؛ "لە مێژووی لێکۆڵینەوەی ڕستەسازیی

ڕووسی‌یەوە" (١٩٥٨) ؛ (لەبارەی زمانی هونەری ئەدەبی‌یەوە (١٩٥٩) ؛ "لێکۆڵینەوە لەبارەی ڕێزمانی ڕووسی‌یەوە" (١٩٧٥) ... کرۆکی بۆچوونە زمانناسی‌یەکانی ڤینۆگرادۆڤ بریتی‌یە لە وشە و شێوازی زمان لە هەلومەرجی سیستەم و کۆمەڵ و مێژوودا . ڤینۆگرادۆڤ لە دابەش‌کردنی بەشەکانی ئاخاوتندا لێکۆڵینەوەیێکی نوێی هێنایە ئەنجام ... بناغەی لێکۆڵینەوەی فرازیۆلۆژی و وشەڕۆنان و مێژووی زمانی ئەدەبی پتەو کرد .

ئێمە بێ‌گومانین ، کە زمانناسیی هاوچەرخ لە کۆمەکی قوتابخانەی جیاوازی زمانناسی پێکهاتووە . سەبارەت بە زمان و شێوازی لێکۆڵینەوەی زمان لەگەڵ هەموو بۆچوون و بیروڕاییێکی جیاوازی قوتابخانەی زمانناسیی هەمەجۆریشدا ، لە زمانناسیی هاوچەرخدا شێواز و ڕێبازی سەرەکی دیاری‌کراون . زمانناسیی گشتی لە سێ بەشی سەرەکی پێکدێت :


زمانناسیی گشتی
زمانناسیی بەراوردی
زمانناسیی ناوەکی
زمانناسیی دەرەکی
زمانناسیی
بەراوردیی
ناوچەیی
زمانناسیی
بەراوردیی مێژوویی
زمانناسیی
تاکایەتی
زمانناسیی
کۆمەڵایەتی
دابەش کردنی زمان بە پێی خاسیەت
فۆنۆلۆژی
لێکسیکۆلۆژی
ڕستەسازی
(سینتاکس)
وشەسازی
(مۆرفۆلۆژی)

زمانناسیی دەرەکی وەک دیاردەیێکی لە یەکتر گەیشتن لە زمان دەکۆڵێتەوە و هەر لەبەر ئەوەشە بە کۆمەڵایەتیی زمانیش ناسراوە. جارجارەش بە زمانناسیی ئەرکی ناودەبرێ، چونکە لە کۆمەڵایەتی و ئەرکی بیری زمان دەدوێ.

زمانناسیی دەرەکی لە زمانناسیی کۆمەڵایەتی و زمانناسیی تاکایەتی پێکدێ.

زمانناسیی تاکایەتی لە پێوەندیی زمان و بیر دەکۆڵێتەوە؛ تیۆریی واتای زمان و پێکهاتنی لێک دەداتەوە؛ پەیوەستیی لایەنی ناوەڕۆکی زمان بە چالاکیی ئاخاوتنەوە ساغ دەکاتەوە.

زمانناسیی ناوەکی لە سیستەمی ناوەوەی زمان دەکۆڵێتەوە؛ دانەکان و حاڵەتەکانی نیشان دەدا، ڕادە و ئاسۆ و پێکهاتنیان دیاری دەکا. بەشە سەرەکییەکانی زمانناسیی ناوەکی بریتییە لە فۆنۆلۆژی و لێکسیکۆلۆژی و ڕێزمان و ئەمانیش بەسەر بەشی بچووکتردا دابەش دەبن.

زمانناسیی بەراوردی وەک زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی سەریهەڵدا و پشتی بە بەراوردی دەنگسازی و وشەسازیی زمانە هیند و ئەورووپاییەکان بەستبوو.

لە زمانناسیی بەراوردیدا، پێویستە زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی و زمانناسیی بەرانبەر یەک ڕاگرتن جیابکرێنەوە، چونکە دوو ڕێبازی جیاوازن و هەر یەکەیان خاوەنی شێواز و مەبەستی خودی خۆیەتی. ئەگەر زمانناسیی بەراوردیی مێژوویی زمانانی خزم و خاوەن یەک بنەچە و یەک سەرچاوە لەگەڵ یەک بەراورد بکا، ئەوە

زمانناسیی بەرانبەر یەك ڕاگرتن زمانانی جیاواز و دوور لە یەکتر بە یەك دەگرێ .

بوونی ئەم هەموو بەشەی زمانناسیی _ گشتی و تایبەتی ، تیۆری و پراکتیکی _ زەمینە بۆ زانستی زمانی هاوچەرخ خۆشدەکا ، لێکۆڵینەوەی قووڵ و تەواو لە خاسیەت و ئەرك و پێشکەوتنی زمان بکرێ و سەرجەمی ئەو کێشە جۆربەجۆرانە لەبەردەم زمانناسیی و زمانناسانی سەردەمدان ساغ بکرێنەوە .



ئەرستۆ
(٣٨٤ - ٣٢٢ پ.ز.)



م. ف. لۆمۆنۆسۆف
(١٧١١ - ١٧٦٥)



VOCABOLARIO
DEGLI ACCADEMICI
DELLA CRUSCA
COSIMO TERZO
GRANDUCA DI TOSCANA

فەرهەنگی ئەکادیمی
کروسک



ئاوگوست شلیخەر
(١٨٢١ - ١٨٦٨)



ڤ. ف. هومبولدت
(١٧٦٧ - ١٨٣٥)



ئا. ئا. پۆتیبنیا
(١٨٣٥ - ١٨٩١)



ف. ی. بوسلاییڤ
(١٨١٨ - ١٨٩٧)



گ. پاول
(١٨٤٦ - ١٩٢١)



ی. ئا.
بۆدوێن دی کورتەنێ
(١٨٤٥ - ١٩٢٩)



ف. دێ سۆسیور
(١٨٥٧ - ١٩١٢)



ف. ف. فۆرتوناتۆڤ
(١٨٤٨ - ١٩١٤)



و. ماتێزیوس
(١٨٨٢ - ١٩٤٥)



ل . یێلمسلێڤ
(١٨٩٩ - ١٩٦٥)



ل . ڤ . شێربا
(١٨٨٠ - ١٩٤٤)



ی . ی . میشانینۆڤ
(١٨٨٣ - ١٩٦٧)



ڤ . ڤ . ڤینۆگرادۆڤ
(١٨٩٥ - ١٩٦٩)

## - فەسلی دووەم -

# زمان وەك گرنگترین ئامێری لە یەکتر گەیشتن و پێوەندی بەستنی ئادەمیزاد

-١-

## بۆچی زمان بە دیاردەییکی سروشتی دانانرێت ؟

زمان گرنگترین ئامێری پێوەندیی نێوان ئادەمیزادە . بێ زمان پێوەندی لە نێوان ئادەمیزاددا پەیدا نابێ و بێ پێوەندییش کۆمەڵ ساز نابێ و هەروەها مرۆ خۆیشی . بیریش بێ زمان پەیدا نابێ- واتە ئادەمیزاد بێ زمان ناتوانێ لە واقیعی دەوروبەری تێبگا و خۆی تێیدا بناسێ . بەلاّم چ ئەم و چ ئەو تەنها لە کۆمەڵی ئادەمیزاددا دەشێ ببێ .

با ئەوە لە "دوورگەی نهێنی"ی ژوول ڤێرندا[1] بێنینەوە یاد کە کۆلۆنیستەکان (ئایرتۆن)ی کێوی‌یان لە دوورگەیەکی چوڵی بێ ژیاندا دۆزی‌یەوە کە لە سزای تاوانێکدا لەوێ بەجێهێڵرابوو . ئایرتۆنی لە کۆمەڵ دابڕاو لەوە کەوتبوو وەك مرۆ بژی ، وزە و توانستی بیرکردنەوەی وەك مرۆ نەمابووو لە قسە کەوتبوو .

---

(1) (Jules Verne) نووسەرێکی فەرەنسەیی‌یە ، لە نێوان سالانی (١٨٢٨-١٩٠٥)دا ژیاوە و "دوورگەی نهێنی"ی ڕۆمانێکیەتی کە سالی ١٨٧٥ بلاّوی‌کردۆتەوە (وەرگێڕ) .

کاتێ کەوتە ناو کۆمەڵێکی بچووکەوە و چووە نێو ژیانی ئادەمیزادانەوە ، وزە و توانستی بیرکردنەوەی گەڕایەوە و سەرلەنوێ کەوتەوە قسە .

ئەگەر مرۆڤایەتی خۆی ڕانەگرێ و ڕەگ دانەکوتێ و بەردەوام نەبێ، ئەوە نەوەی ئادەمیزاد کە بکەوێتە بارودۆخی گیاندارانەوە ، ڕەوشتی گیانداران وەردەگرێ و هیچ جۆرە ئاکار و ڕەوشتێکی مرۆڤانەی نامێنێ. ئەمە لە هیندستان لە دوو کچی بچووک ڕوویدا . ساڵی ١٩٢٠ (ڕید سینگ)ی دەروونناسی هیندی لە لانەی گورگدا لەگەڵ بێچووە گورگدا دۆزیبوونییەوە . یەکێك لە کچەکان بەشێوە حەوت - هەشت ساڵان دەبوو . ئەویتریشیان - دوو ساڵێك . بچکۆلەکەیان هەر زوو مرد ، بەڵام گەورەکەیان کە ناونرا (کەماڵە) نزیکەی دە ساڵ ژیا . ر . سینگ لە هەموو ئەو ماوەیەدا بە بەردەوامی سەرنجی دەربارەی ژیان و پێشکەوتنی کەماڵەی یادداشت دەکرد . لەو یادداشت و کارەی ر . سینگەوە دەزانین ، کەماڵە لە سەرەتادا لەسەر چوار پەل دەڕۆیشت - واتە لەسەر دەست و ئەژنۆی ، بەڵام کە ڕای دەکرد لەسەر دەست و پاژنەی پێی ؛ گۆشتی هەر لەسەر زەوی هەڵدەگرت و دەیخوارد ، بەڵام ئەگەر بەدەست بتدایەتێ وەری نەدەگرت .

لە ئاوخواردنەوەدا زمانی بەکاردەهێنا . ئەگەر یەکێك لە کاتی نانخواردنیدا لێی بچوایەتە پێشەوە مۆڕ دەبووەوە و دەنگێکی وەك شیڕاندنی لێوە دەهات . هەندێ جار شەو دەیلووراند . کەماڵە بە ڕۆژ

لەسەر چیچکان لە سووچێكدا دەنووست و ڕووی دەكردە دیوار . جلی لەبەر خۆی دادەدڕی . شەوان لە تاریكیدا زۆر باش دەیبینی ؛ لە سەرەتادا لە ئاگر و شەوقی بەهێز و ئاو دەترسا .

كەماله پاش دوو ساڵ فێربوو بە پێوە بووەستێ . دوای شەش ساڵ فێری ڕۆیشتن بوو . بەڵام هەر وەك جاران لەسەر چوار پەل ڕای دەكرد . لە ماوەی چوار ساڵدا تەنها شەش وشە فێربوو و لە حەوت ساڵدا چل و پێنج . لە دوای حەوت ساڵ وای لێهاتبوو ئیتر لە تاریكی نەترسێ ؛ هاتبووە سەر ئەو بارەی بە دەست بخوا و بە پەرداخ بخواتەوە ؛ ئارەزووی لەگەڵ خەڵك تێكەڵاوبوونی پەیدا كردبوو.

ر . سینگ پێی لەوە ناوە كە نەیتوانیوە بە تەواوی ژیانی "مرۆڤانە" بۆ كەماله بگەڕێنێتەوە[٢].

زانایان ماوەیێكی زۆر هەوڵیان دا ئیسپاتی بكەن ، كەوا ئادەمیزاد بوونەوەرێكی وەك گیاندار و ڕووەكە و بە هەمان یاسای سروشت گەشە دەكات و بۆ هەموو زمانێك وەك یەكە لە هەر شوێن و لە هەر دەمێكدا بێ . زمان وەك گشت بوونەوەرێك لە دایك دەبێ ؛ نەشونما دەكات ؛ دەگاتە لووتكەی پێشكەوتن ؛ بەرەو نشوستی دەڕوات و دەمرێ . ئەم تێگەیشتنەی زمان ، لە ناوەڕاستی سەدەكانی ناوەڕاستدا باو بوو ،

---

[٢] بڕوانە : ئا.ئا. لیۆنتێڤ ، زمانناسی و سەرەتای پێشكەوتنی زمان ، مۆسكۆ ، ١٩٦٣،ل ١٦. بۆ باسی تەواوی ئەم ڕووداوە ، بڕوانە: ك . ك . پلاتۆنۆڤ ، دەروونناسیی سەرنج ڕاكێش ، مۆسكۆ، ١٩٦٢ ل١٦١-١٦٦ .

بەتایبەتی کاتێ سەرکەوتنی زانستەکانی سرووشت و کە داریونیزمیش یەکێکیانە ، سەرنجی گەلێ لەوانەی ڕاکێشابوو ، کە خەریکی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ و خاسیەتەکانی بوون .

بەلام ئەو جۆرە تێگەیشتنەی زمان بەرەو ئەنجامی ڕاست بردن نییە، لە لێکدانەوەی دیاردەی واقیعدا ، بەڵکو بە پێچەوانەوە لە ڕاستی دوورخستنەوەیە .

هەندێ تەجروبە دەتوانن بە ئاسانی ئەو جۆرە بۆچوونە ڕەت بکەنەوە .

لە یەکەم سەرنج ڕاگرتنیدا دەشێ وا بێتە بەرچاو ، کە وا منداڵ هەموو بە یەك جۆر فێری هەناسەدان ، تەماشاکردن ، ڕۆیشتن ، قسەکردن دەبن ، بەلام ئەمە ڕاست نییە . بێتو منداڵێکی تازە لە دایك بوو بنێردرێتە دوورگەیەکی چۆڵ و بێ ژیان و ئەگەر لەوێ نەمرێ ، ئەوە زۆر باش فێری ڕاکردن ، بەسەر دار هەڵگەڕاندا ، خۆشاردنەوە ، خواردن بۆخۆدابین کردن دەبێ ، بەلام فێری قسەکردن نابێ ، چونکە کەس نییە لێوەی فێر بێ و کەس نییە قسەی لەگەڵ بکا .

خاسیەتی سرووشتی و بایۆلۆجیی مرۆ دەشێ دوور لە کۆمەڵ و لە بارودۆخی تەنیاییشدا فراژۆ و گۆڕان و گەشە و نەشونما بکا ، بەلام ئەو خاسیەتانەی پێوەندییان بە زمانەوە هەیە ، لەو جۆرە بارودۆخەدا ناتوانن گەشە و نەشونما بکەن .

ئاشکرایە ، لە دایک و باوکێکی زۆلووس [٣] تەنیا قولەڕەش پەیدادەبێ . لە دایك و باوکێکی چینی تەنیا چینی لە دایك دەبێ . بەڵام ئایا ئەمە وا دەگەیەنێ کە منداڵی یەکەم هەر دەبێ بە زۆلووسی بدوێ و منداڵی دووەمیش بە چینی ؟

. بۆ لێکدانەوەی ئەو کێشەیە تاقیکردنەوەیەکی دی دەکەین . منداڵە ساوا زۆلووسەکە دەگوێزینەوە بۆ چین و منداڵە ساواچینییەکەش دەبەینە ئەفەریقا لای زۆلووس . بێگومان منداڵە زۆلووسەکە بە زمانی چینی قسە دەکا و چینییەکەش بە زۆلووسی . هەرچەندە ئەو دوو منداڵە بە شێوە لە خەڵکی دەوروبەریان زۆر جیاوازن (منداڵە زۆلووسەکە لە دایك و باوکی زۆلووسی دەچێ و منداڵە چینییەکەش لە دایك و باوکی چینی) ، بەڵام بە زمان بە تەواوی وەك خەڵکی دەوروبەریانن .

بەو پێیە دەزانین ، زمان میراتێکی بەدەنی نییە ، وەك میراتی ڕەنگی پێست و چەشنی لەش و فۆرمی کەللەسەر و کەمی و زۆریی موو، کە نیشانەی ڕەگەز و نەژادن .

بەمەدا دەردەکەوێ تێکەڵ کردنی نیشانەی زمان و ڕەگەز هەڵەیەکی گەورەیە . نێزیکی زمان لەگەڵ یەکتردا بە هیچ جۆرێ نیشانەی وێکچوونێ ڕەگەز نییە . بە پێچەوانەشەوە یەکێتی ڕەگەز پێوەندی بە

---

[٣] میللەتێکە لە خوارووی ئەفەریقا دەژی (وەرگێڕ) .

یەك زمانی یان نێزیكیی زمانەوە نی‌یە . سنووری ڕەگەز و سنووری زمان یەك ناگرنەوە .

بۆ نموونە نوێنەرانی ڕەگەزی دەریای سپی ناوەڕاست كە لە باكووری دەریای سپی ناوەڕاست دەژین لە ڕووی زمانەوە سەر بە گرووپ و خێزانی جیاجیان ، وەك : (تورك ، گرێك ، ئەڵبان ، سێرب ، ئیتالیایی ، فەرەنسەیی ، ئیسپانیایی... هتد) . دانیشتوانی فەرەنسە ، كە بە یەك زمان قسە دەكەن كە فەرەنسەیی‌یە ، لە ڕووی ڕەگەزەوە زۆر لە یەك جیان (فەرەنسەیی باكوور و ناوەڕاست و خواروو) .

. لەم ڕووەوە دانیشتوانی ئەمەریكا تەواو سەرنج ڕادەكێشن . ئەمەریكا لەباری ڕەگەزەوە پێكهاتنێكی یەكجار هەمەچەشنی تێدایە ، كە بە هۆی هاتنی میللەتانی جۆربەجۆرەوە لە ولاتانی دوور و نزیكی جیهانەوە ، وەك (ئەورووپایی خاوەن ڕەگەزی هەمەجۆر و قولەڕەش و چینی و تورك و عەرەب و گەلێكی دی ) سازبووە . بەلام لە ڕووی زمانەوە وێكدەچن : هەموو بە زمانی ئینگلیزی دەئاخێون .

لایەنگیرانی نیگای بایۆلۆجی لە بارەی زمانەوە ، كە باوەڕیان بە یەكێتی یەكگرتنەوەی زمان و ڕەگەز هەبوو ، بوونە هۆی شێواندنی ئەو پێوەندی‌یە واقیعی‌یەی لە نێوان ئەو دوو دیاردەیەدا هەیە .

بەلام گەلێك لە زمانناسان لە كۆتایی سەدەی نۆزدە و سەرەتای سەدەی بیستدا توند دژی ئەو یەكێتی و یەكگرتنەوە و پێوەندی‌یە وەستان . بە وێنە ئی .ئا . بەدوئێن دیٚ كورتەنیٚ (١٨٤٥-١٩٢٩)

نووسیویە : "یەکێ لەسەر لێ شێواندنە زانستییەکان مەسەلەی یەکێتی زمان و رەگەزە... لەنێوان رەگەز و زمانێکی دیاریکراودا کەمترین پێوەندی چییە ، نییە"[٤]

لایەنگیرانی نیگای بایۆلۆجی سەبارەت بە زمان بەڵگەیەکی تریشیان بە دەستەوەیە . ئەوەش وێکچوونی "زمانی منداڵان"ە لای گشت میللەتان .

بە سەرنجدان دەربەکەوێ ، کەوا لە ڕاستیدا هەموو منداڵان لە گشت سووچێکی جیهاندا ئەو "دەنگانە"ی لە سەرەتادا دەریان دەبڕن پێکهاتنێکی برگەییان هەیە و بە دەنگی لێوەکی دەست پێدەکەن ، وەك: ما - ما ، با - با ، پا - پا . دواتریش : دا - دا ، نا - نا ، تا - تا . ئەم یەکێتییەش پێوەندی بەوەوە هەیە ، کەوا جووڵانەوەی لێو ئاسانترە وەك لە جووڵانەوەی بنی زمان... ، بەڵام ئەو "گڕوگاڵ"ەی منداڵ هێشتا هیچ شتێکی لە زمان ناچێ ، چونکە ئەمە تەنها

---

[٤] ئی . ئا . بەدوئێن دێ کورتەنێ ، زمان و زمانان ، کارە هەڵبژاردەکانی لە بارەی زمانناسییەوە ، مۆسکۆ ، ١٩٦٣،ب٢ ، ل٦٧ - ٩٦.

هەندێ لەزانایانی دیش بەهەمان شێوە ڕای خۆیان دەربڕیوە ، بە وێنە ، بڕوانە ف . ف. فۆرتوناتۆف، کارە هەڵبژاردەکانی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٦ ،ب١ ،ل٦١-٦٢ ؛ ف . دێ سۆسسیور، زمانناسی (ئا . م . سوخۆتین کردوویە بە ڕووسی) مۆسکۆ ، ١٩٣٣ ، ل١٩٩-٢٠٠ ؛ ئێ . سێیر ، زمان ، مۆسکۆ ، ١٩٣٤ ، ل١٦٣ - ١٧٠ .

"دەنگ"ێكى بێ واتايە كە لە ئەنجامى تاقىكردنەوەى ماسوولكەوە پەيدا دەبێ ، وەك چۆن پێ بە زەوىدا دان - نە دانسە و نە هەڵپەڕكێ .

ئەو "گڕوگاڵ"ە تەنيا كاتێ دەبێتە وشە ، كە ببێ بە ناوى شتێك ، كە واتايێك بگەيەنێ . ئيتر ئەوسا گشت نهێنىيەكى يەكێتى "زمانى منداڵان" و سروشتى پەيدابوونى ئاشكرا دەبێ .

لە زمانانى جياوازدا وشە هەيە وەك يەك دەوترێن ، بەڵام مانايان جياوازە . بە وێنە لە زمانى ڕووسيدا بە "دايك" دەڵێن "مامە" ، بەڵام لە زمانى گورجيدا "مامە" واتاى (باوك) دەگەيەنێ و لە كورديدا بۆ (براى باوك) بەكاردەهێنرێ . وشەى "بابە" لە ڕووسيدا واتاى (نەنك) دەگەيەنێ ، لە كورديدا "باوك" ، لە زمانە تۆرانىيەكاندا "باپير"...

ئەگەرچى منداڵ ئەو دەنگانە وەك يەك بەكاردەهێنن ، بەڵام ناتوانن لە يەكتر تێبگەن ، چونكە زمانيان جياوازە . هەرچى زمانيشيانە بەندە بە زمانى گەورەوە و گەورەش منداڵ فێر دەكا ئەو بڕگە بێواتايانە بكا بە وشە .

لە كاتى خۆيدا ئەرستۆ ڕاىخۆى دژى ئەو جۆرە بۆچوونە دەربڕيوە: " لە نێو هەموو زيندەوەراندا تەنيا ئادەميزاد بەهرەى ئاخاوتنى هەيە" ("سياسەت") . ئەم وتەيەى ئەرستۆ زۆر جار بە شێوەيەكى بەرفراوانتر لەلايەن ڕووناكبيرانى وڵاتانى جياوازى سەدەى بووژاندنەوە "ڕێنيسانس"ەوە بەرچاو دەكەوێ . بە وێنە دانتێ (سەدەى چواردە) پەنجەى بۆ ئەوە درێژ كردووە ، كەوا ئاخاوتن تەنيا

بۆ ئادەمیزاد پێویستە ، تاکو بیروڕای خۆیان بۆ یەکتر دەربڕن (لێکۆڵینەوە "لەبارەی زمانی ڕازاوەی میللی‌یەوە") . بۆسیوئێت (سەدەی حەڤدە) نووسیویە : "دەکرێ دەنگ و وشە وەك یەك وەربگیرێن ، چونکە هەردووکیان کار لە هەوا دەکەن ، دوایی لە گوێ و ئینجا لە مێشك . هەروەها بە تەواوی دەشێ وەك نیشانە وەربگیرێن ، کە ئادەمیزاد داینـاون و لە بیر و لێکدانەوەی خۆیدا واتای شت دەگەیەنن" (لێکۆڵینەوە "لە بارەی ناسینی خوا و خودی خۆوە") .

بەڵێ لە هەندێ حاڵەتدا بۆ ڕاگەیاندنی هەواڵێك هەست بە بەکارهێنانی دەنگ دەکەین لە لایەن گیاندارانەوە . بە وێنە ئەو دەنگەی مریشك و هەندێ باڵندەی مێی دی کە جووچکەکانیانی پێ بانگ دەکەن. یاخود سەگ کە بە کەسێکی نە ناسیاو دەوەڕێ... گیانداران هەروەها دەتوانن لە ڕێی دەنگەوە هەستی خۆیان دەربڕن (تووڕەیی ، ترس ، خۆشی) ، بەڵام هەموو ئەمانە دیاردەی ڕەنگدانەوەی بایۆلۆجین، کە بەشێکی لەسەر (ڕەنگدانەوەی عەفەوی) دامەزراوە و بەشێکی تری لەسەر (ڕەنگدانەوەی چاولێکەری) پەیدابووە ، کە لێرانەدا نە "وشە" و نە دەربڕینی "واتا" نی‌یە .

هەندێ جار پەنا دەبەنە بەر ئەو حاڵەتانەی باڵندە و گیاندار بە هۆش و ئاگاوە دەنگ دووپات دەکەنەوە . ڕاستە دەتوانرێ تووتی فێری قسەکردن بکرێ – واتە ئەو باڵندەیە دەتوانێ لە ڕێی مەشقەوە لەسەر بنچینەی ڕەنگدانەوەی لاسایی دەنگ لاسایی ئاخاوتنی ئادەمیزاد

بکاتەوە ، بەڵام کاتێ تووتی "دەڵێ" : "تووتی بێ ئەقڵە" ئەوە لەوە تێناگا کە خۆی قسە بە خۆی دەڵێ . کەواتە قسەی تەنیا لاسایی‌کردنەوەی قسەی ئادەمیزادە . شتێکی‌تری سەیر ئەوەیە ، هەندێ گیاندار بۆ مەبەستێك دەنگی خۆیان دەگۆڕن و لاسایی دەنگی گیاندارێك دەکەنەوە کە دەبێتە نێچیریان . بە وێنە کاتێ ئاسکی نێر لەسەر ئاسکی مێ بەشەڕدێن ، پڵنگ دەنگی خۆی وەك دەنگی ئەوان لێ دەکا ، تاکوو شەڕکەرەکان بێنە پێشەوە . وەك گەریدەی بەناوبانگ ڤ . ك . ئارسێنێڤ پەنجەی بۆ درێژکردووە "پڵنگ نۆتی ئەو دەنگانە دووپات دەکاتەوە"[*]. جا لەمەشدا لاسایی پڕبەپڕ نایەتە ئەنجام . خۆ ئەوە هەر ناکرێ ، کە پشیلە فێری وەڕین بکرێ و سەگیش فێری میاواندن ، ئەگەرچی پشیلە و سەگ گیانداری هەرەماڵی و لە مرۆڤ نێزیکن .

لێکۆڵینەوەکانی ئی .پ . پاڤلۆڤ ڕێگە خۆش دەکەن ئەو کێشانە بە شێوەیێکی تیۆری ، ڕاست ساغ بکرێنەوە .

ئی . پ . پاڤلۆڤ نووسیوێتی : "... گیاندار و مرۆڤی سەرەتایی تا ئەو دەمەی هێشتا نەبووبوونە ئادەمیزادی ڕاستەقینە و لە دۆخی ئێمە نزیك نەکەوتبوونەوە و پێوەندییان بە جیهانی دەوروبەریانەوە تەنها بە یاریدەی ئەو سەرنجانەوە بوو ، کە لە ئەنجامی کارتێ‌کردنی هەر

---

[*] ڤ . ك . ئارسێنێڤ ، لەنێوان دارستانە چڕەکانی ئوسورییسکی‌دا ، مۆسکۆ ،١٩٥١، ل ٢٢٧ .

شتێکدا ڕەنگیان دەدایەوە و لە وێنەی هەموو جۆرە هەستێکەوە - بینین، ڕەنگ ، سەرما ، گەرما ....هتد ئنجا کە لە کۆتاییدا مرۆڤ پەیدابوو ، ئەوە ئەو یەکەم نیشانانەی واقیع ، کە ئێمە هەمیشە سەرنجیان دەدەینێ تا ڕادەییێکی دیار کران بە وشە ... کارێکی دیارە ، کەوا لەسەر بناغەی سەرنجدان لە واقیع ، لەسەر بناغەی ئەو یەکەم نیشانانە لای ئێمە دووەم نیشانە لە شێوەی وشەدا دەرکەوت" [٦] .

سەرنج و هەست و ڕا لە دیوی دەرەوەی دەوروبەر چ سروشتی گشتی و چ سروشتی کۆمەلآیەتی بێ (جگە لە وشە کە ببیسترێ و ببینرێ) - "ئەو یەکەم سیستەمی نیشانەیەی واقیع گشتییە لە نێوان ئێمە و گیانداراندا" [٧] .

دووەم سیستەمی نیشانە بەندە بە تەجرید (ئەبستراکت - Abstraction)ی بیرەوە ، کە واتای گشتی و وشە پێکدێنێ . "سەرکەوتنێکی ئێجگار گەورەی ئادەمیزاد بەسەر گیانداردا هەبوونی توانستی واتای گشتییە ، کەوا بە یاریدەی وشە پێکهاتووە..." [٨] .

" ..وشە کە نیشانەی یەکەم نیشانەیە بە تایبەتی دووەم سیستەمی نیشانەی واقیعی ئێمەی داناوە" [٩] .

---

[٦] دەورووبەرەکانی پاڤلۆڤ ، ب٢ ،١٩٤٩ ، ل ٢١٨ .

[٧] هەمان سەرچاوە ، ل ٢١٨ .

[٨] ئی . پ . پاڤلۆڤـسەرجەمی کارەکانی ، ب٢ ، ١٩٤٩، ل ٥٦٨.

[٩] دەورووبەرەکانی پاڤلۆڤ ، ب٢ ، ١٩٤٩ ، ل ٢٧ .

لە یەکەم سەیرکردندا وا دێتە پێش چاو ، کە ئەمە گیاندارانی ماڵی ناگرێتەوە ، کەوا لە مرۆڤ و ئاخاوتنی "تێدەگەن" . بێگومان گیاندارانی ماڵی ، کەوا پشتاوپشت لە دەوروبەری ئادەمیزاد دەژین و لەگەڵیان ڕاهاتوون و سەرنجیان بۆ ژیانی کۆمەڵایەتییان ڕاکێشاوە ، ڕاهێنان و فێرکردنی "گوێگرتنیان" لە مرۆڤ ئاسانە ، بە وێنە (ختتە– بۆ پشیلە ؛ چغە – بۆ سەگ...) . یاخود کاتێ ئەو گیاندارانە بۆ هەندێ مەبەست هەندێ دەنگ بەکاردێنن ... بەڵام هەموو ئەمانە دەکەونە ئەودیو سنووری یەکەم سیستەمی نیشانەوە ، لەبەر ئەوەی تەنانەت "پێشکەوتووترین" گیانداریش لە بەهرەی چالاکیی قسە بێبەرە .

دیورینگ [10] کە هەوڵیدا تەجرید و ڕەسەنی بیر لە "ڕێی ئاخاوتنەوە" ئازاد بکا لە (ف . ئێنگلس)ەوە ڕەخنەی توندی لێگیرا : "ئەگەر وابوایە ، ئەوە دەبوو گیانداران خاوەنی تەجریدترین و ڕەسەنترین بیر بوونایە ، لەبەر ئەوەی بیریان هەرگیز بە لووت تێژەنینی زمان گەردی لێ نانیشی" [11] .

---

[10] فەیلەسوفێکی ئەڵەمانییە (١٨٣٣-١٩٢١) ، هەروەها خەریکی ئابووریی سیاسی و یاساش بووە .ساڵانی (١٨٦٣ –١٨٧٧) لە زانکۆی بەرلین یاریدەدەری پرۆفیسۆر بووە. هەوڵیدا سیستەمێکی تایبەتی خۆی ((فەلسەفەی واقیع)) دامەزرێنێ ، کە بەپێی قسەی خۆی بە شێوازی بیرکردنەوەی نوێی لە قەڵەم داوە ، بەڵام دەرکەوت کە ئەو ڕۆنراوەی ماکێکی سەیری میتافیزیکە ... (وەرگێڕ) .

[11] ك . مارکس و ف . ئێنگلس ، بەرهەمەکانیان ، چاپی دووەم ، ب٢٠ ، دژی دیورینگ ، ل٨٥ .

لەوەڵامی پرسیاری "سروشتايەتی" يان "مەرجايەتی"ی پێوەندیی دەنگ و واتا لە وشەدا دواتر لە باسی كێشەی پێكهاتنی زماندا لێی دەدوێین .

هەموو ئەوەی لێی دوایـن ، ڕێمان دەدا ئەو ئەنجامانەی لێ‌هەڵێنجێنین :

١- زمان نە دیاردەیێكی سروشتە و نە دیاردەیێكی بایۆلۆجی .

٢- بوون و پێشكەوتنی زمان ژێردەستە و گوێڕایەڵی یاساكانی سروشت نی‌یە .

٣- نیشانەی فیزیایی ئادەمیزاد (بە وێنە ڕەگەزی) پێوەندی بە زمانەوە نی‌یە .

٤- تەنیا ئادەمیزاد خاوەنی زمانە . گیاندار لەم دووەم سیستەمەی نیشانە بێ‌بەرە .

* * *

-٢-

## زمان وەك دیاردەیێكی كۆمەڵ

ئەگەر زمان دیاردەیێكی سروشتی نەبێ، دەبێ جێی لەنێو دیاردەكانی كۆمەڵدا هەبێ. ئەم بڕیارە شتێكی ڕاستە، بەڵام بۆ ئەوەی بەتەواوی ئەو كێشەیە ڕوون بێتەوە، پێویستە شوێنی زمان لەنێو

دیاردەکانی تری کۆمەڵدا ئاشکرا بکرێ. ئەم شوێنەی زمان تایبەتی‌یە، چونکە زمان دەورێکی تایبەتی بۆ کۆمەڵ هەیە .

ئەو وێکچوونانە چین کە لە نێوان زمان و دیاردەکانی تری کۆمەڵدا هەن و لە چیدا زمان لەگەڵیان جیاوازە ؟

وێکچوونی زمان لەگەڵ دیاردەکانی تری کۆمەڵ لەوەدایە ، کە زمان- مەرجێکی پێویستی بوون و پێشکەوتنی کۆمەڵی ئادەمیزادە و ماکی گیانی کولتورێتی- . زمان وەك گشت دیاردەکانی دی کۆمەڵ ناشێ لە مایەکی‌یەت دابپڕێ .

بەلاّم ئەرکی زمان و سروشتی بەجێ‌هێنانی ئەرك و جۆری پێشکەوتنی لە دیاردەکانی تری سروشت جیاوازە .

باوەڕ دەربارەی ئەوەی زمان بوونەوەرێکی بایۆلۆجی نی‌یە ، زووتریش نوێنەرانی "قوتابخانەی زانستی کۆمەڵ" وەك (ف . دێ سۆسسیور ، ژ . ڤاندرێیس) لەژێر ئالاّی نموونایەتی (المثالیة - Idealism) دا دەریان بڕیوە و (ل . نوارێ ، ن . یا . مارر)یش لەژێر ئالاّی مایەکیەتی ( المادیە -Materialism )دا نیشانیان داوە ، بەلاّم گرانی و گیروگرفت لە تێنەگەیشتنی پێکهاتنی کۆمەڵ و خاسیەتەکانی دیاردەکانی کۆمەڵدا بوو .

مارکسیزم لە دیاردەکانی کۆمەڵدا ژێرخان (basis) و سەرخان (superstructure) جیادەکاتەوە – واتە پێکهاتنی ئابووریی کۆمەڵ لە یەکێك لە قۆناغەکانی گۆڕان و پێشکەوتنیدا و لە ڕای سیاسیی و

یاسایی و ئاینی و هونەریی کۆمەڵ و دەزگا هاوشان و جووتەکانی هەر ژێرخانێکیش ، سەرخانی خۆی هەیە .

بە بیری کەسدا نەهاتبوو زمان و ژێرخان بە یەك بگرێ ، بەلام دانانی زمان لەناو سەرخاندا چۆن لە زمانناسیی سۆڤیەتدا پەیڕەوی کرابوو ، لە هەندەرانیش هەر بەو چەشنەبوو .

ڕای هەرە باوی دژ بایۆلۆجستەکان دانانی زمان بوو بە "ئایدۆلۆجی" لە مەسەلەی سەرخان و هاوشان و جووتیی زمان لەگەڵ کولتووردا . ئەمەش کۆمەڵێ ئەنجامی چەوتی بە دوا خۆیدا هێنا .

بۆچی زمان نابێتە سەرخان ؟

چونکە زمان ئەنجام و بەرهەمی ئەو ژێرخانە نییە ، بەڵکوو ئامێری تێکەڵبوون و لەیەکتر گەیشتنی کۆمەڵی ئادەمیزادە ، کە لە ماوەی گەلێ سەدەدا کەڵەکە بووە و پارێزراوە ، ئەگەرچی لەو ماوەیەشدا گۆڕان بەسەر ژێرخان و سەرخانە هاوشان و جووتەکانیدا هاتبێ .

سەرخان لە کۆمەڵی چینایەتیدا موڵکی ئەم چین یان ئەو چین نییە ، بەڵکو هی هەموو دانیشتوانە و خزمەتی جۆربەجۆرەکانی دەکا و بە بێ ئەمە کۆمەڵ پێك نەدەهات .

ن . یا . مارر و لایەنگیرانی "لێکۆڵینەوەی نوێ لە بارەی زمانەوە" چینایەتیی زمانیان بە یەکێك لە بیروڕا بنەڕەتییەکانی خۆیان دادەنا . ئەمە نەك هەر ئەوە دەردەخا کە باش لە کێشەی زمان تێنەگەیشتبوون، بەڵکو لە دیاردەکانی تریشی زمان کەم ئاگابوون ، چونکە لە کۆمەڵی

چینایەتیدا شتی گشتی بۆ چینە جۆربەجۆرەکان تەنها زمان نی‌یە ، بەڵکو ئابووری‌یشە ، کە بەبێ ئەمە کۆمەڵ لەناودەچێ .

لایەنگیرانی چینایەتیی زمان بۆ نیشاندانی دابەش‌بوونی کۆمەڵ بەرژەوەندیی پرۆلیتار و بۆرژوا لەگەڵ خەباتی چینایەتی‌یان بەرانبەر یەك ڕاگرتووە و بەو پێوانەیە وایان داناوە ، لەبەر ئەوەی کۆمەڵێکی یەککگرتوو نی‌یە و تەنها چین هەیە ، ئیتر بۆ کۆمەڵ زمانی هاوبەش پێویست نی‌یە .

بەڵام بێ زمانی گشتی و بێ زمانێ تێکڕای ئەندامانی کۆمەڵ تێی بگەن ، کۆمەڵ لە بەرهەمهێنان دەکەوێ و پەرش و بڵاودەبێتەوە و وەك کۆمەڵ نامێنێ .

دیالێکتی دەوری دەرەبەگ بۆ سەرپاکی پلەکانی دەرەبەگایەتی "هەر لە میرەوە تاخزمەتکار"[١٢] هاوبەش بوو . ئەگەر تەماشای دەورەکانی پێشکەوتنی سەرمایەدارێتی و سۆشیالیستیی کۆمەڵگەی ڕووس بکەین ، دەبینین زمانی ڕووسی چۆن ئێستا خزمەتی ڕژێمی سۆشیالیستی و کولتووری سۆشیالیستی کۆمەڵگەی ڕووس دەکا ، بەر لە شۆڕشی سۆشیالیستی ئۆکتۆبەری مەزنیش وا باش خزمەتی کولتووری بۆرژوای ڕووسی دەکرد .

بەو جۆرە چینایەتی زمان نی‌یە و نەبووە .

---

[١٢] هەمان سەرچاوە ، ب٢١، ل ١٧٠ .

دووەم هەڵەی زمانناسان ، مەسەلەی هاوشان و جووتیی زمان و کولتووره ، ئەم هاوشان و جووتی‌یە ڕاست نی‌یە ، لەبەرئەوەی کولتوور ئایدۆلۆجی‌یەتە ، واتە دیاردەی سەرخانە ، بەڵام زمان سەر بە سەرخان نی‌یە .

بۆچوونی نادروستی هاوشان و جووتیی زمان و کولتوور هەندێ ئەنجامی ناڕاستی لەپاش خۆی بەجێ‌هێشت .. کولتوور و زمان وەك یەك نین . جیاوازیی کولتوور لە زمان ، ئەوەیە کە دەتوانێ هی بۆرژوا یان هی چینی کرێکار بێ . هەرچی زمانە کە ئامێری پێوەندیی نێوان ئادەمیزاد و لە یەکتر گەیشتنە هەمیشە هی گشت میللەتە و خزمەتی کولتووری بۆرژواش و چینی کرێکاریش دەکا .

ئەو پێوەندی‌یە چی‌یە کە لە نێوان زمان و کولتووردا هەیە ؟ زمانی نەتەوەیی فۆرمی کولتووری نەتەوەیی‌یە . زمان بە کولتوورەوە بەندە و بە بێ کولتوور مەحاڵە ، وەك چۆن کولتووریش بە بێ زمان نابێ ، بەڵام زمان ئەو ئایدۆلۆجی‌یە نی‌یە ، کە بنەمای کولتووره .

لە کۆتاییدا هەوڵی ئەوە درا بە تایبەتی لەلایەن ن .یا . مارڕەوە کە زمان وەك ئامێری بەرهەم تەماشا بکا .

بەڵێ زمان ئامێری بەرهەمە ، بەڵام "ئامێر" بە واتایێکی تایبەتی . هاوبەشیی زمان لەگەڵ ئامێرەکانی بەرهەمدا ئەوەیە ، کە هەردووکیان بەرانبەر بە سەرخان بێ‌باکن و خزمەتی چین و کۆمەڵی جیاواز دەکەن ، بەڵام ئامێری بەرهەم خێروبێری ماددی دێنێتە بەرهەم ، هەرچی زمانە

هیچ ناهێنێتە بەرهەم ، بەڵکو تەنیا هۆیە بۆ خزمەتی پێوەندی و لە یەکترگەیشتنی ئادەمیزاد . زمان ئامێرێکی ئایدۆلۆجی یە . ئامێری بەرهەم (تەور ، داس ، پاچ ، بێڵ...) بەدەن و شێوە و دیمەنێکی هەیە ، زمانیش خاوەنی پێکهاتن و سیستەمێکی ئۆرگانی یە .

بەم چەشنە نابێ زمان لەگەڵ ژێرخان یان لەگەڵ سەرخان یان لەگەڵ ئامێری بەرهەم دابنرێ . زمان لەگەڵ کولتووردا هاوشان و هاو جووت نی یە و ناتوانێ هی یەك چین بێ .

هەرچەندە ، زمان دیاردەیێکی کۆمەڵە ، کە لە نێو دیاردەکانی تری کۆمەڵدا جێگای تایبەتیی خۆی هەیە و خاوەنی خاسیەتی خۆیەتی . ئەو خاسیەتانە چین ؟

لەگەڵ ئەوەشدا کە زمان ئامێری پێوەندی و لەیەکترگەیشتنە ، لە هەمان کاتیشدا کەرەستەی ئاڵوگۆڕکردنی بیروباوەڕە . جا شتێکی ئاسایی یە باسی پێوەندیی زمان و بیر بێتە پێشەوە .

لە بارەی ئەم کێشەیەوە دوو شێوە بۆچوونی دژ بەیەکی وەك یەك ناڕاست هەیە :

١ – پچڕاندی زمان لە بیر و بیر لە زمان .

٢ – هاوشان و جووتیی زمان و بیر .

زمان سامان و موڵکی کۆمەڵە و پێوەندی و لەیەکترگەیشتن لە نێوان کۆمەڵدا پێکدێنێ و مەودای ڕاگەیاندن و پاراستنی هەواڵی پێویستی هەر دیاردەیێکی ماددی و مەعنەویی ژیانی ئادەمیزاد خۆش

دەکا. زمانیش وەك سامان و موڵکی کۆمەڵ لە ماوەی چەندین سەدەدا کۆبووەتەوە و پێکهاتووە .

بیر گەلێك خێراتر لە زمان گەشە دەکا و نوێ دەبێتەوە ، بەڵام بیر بە بێ زمان "شتێکە تەنها بۆ خودی خۆ" ئەگەر بیر بە زمان دەرنەبڕرێ ، ئەوە ئەو بیرە ڕوون و ئاشکرایە نابێ ، کەوا یارمەتیی ئادەمیزاد بدات و دەرك بە دیاردەکانی واقیع بکا و تێی بگاو گەشە بەزانست بدا و بیگەیەنێتە لووتکە .

ئادەمیزاد هەمیشە دەتوانێ کەڵك لە کەرەستەی حازر بە دەستی زمان (وشە ، ڕستە) وەربگرێ ، وەك ڕێژە (Formula) یان قاڵب (matrix) نەك تەنها بۆ شتی ناسراو و زانراو ، بەڵکو بۆ شتی نوێش . لە باسی لێکسیکۆلۆژیدا ، ئەوە نیشان دەدرێ ، چۆن دەتوانرێ لە زماندا زاراوە بۆ ئەو شتە نوێیانە دابنرێ یان دابڕێژرێ کە لە زانستدا دەدۆزرێنەوە . کاتێ وشەیەکی پێویست یان واتایێکی نوێ دەهێنرێتە ناوانەوە ، ئاسانکردنی تێگەیشتنی هەر بۆ کەسانی تری کۆمەڵ نییە ، بەڵکو بۆ ئەوانەشە کە دەیانەوێ ئەو واتا نوێیە ببەنە ناو زانست و ژیانەوە . لەم بارەیەوە لە کاتی خۆیدا پلاتۆنی فەیلەسوفی یۆنانی (کۆتایی سەدەی ٥ی پ . ز .) وتوویە : "سەیر دێتە پێش چاوم ، کە گێرمۆگێڕ وای دەربڕیوە گوایا شت ڕوون دەبێتەوە ئەگەر بە یاریدەی پیت و بڕگە نیشان بدرێ ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە وایە"[١٣] .

---

[١٣] بڕوانە : تیۆری کۆن و زمان و شێواز ، لێنینگراد . ١٩٣٦ ، ل٤٩ .

هەر مامۆستاییێك دەزانێ ، تەنیا ئەو دەمە دەتوانێ بێگومان بێ ، روون دەرس دەڵێتەوە ، کە بتوانێ ئەوەی پێویستە بە وشە بۆ قوتابێکانی باس بکا. دیارە خەڵکی رۆما بە خۆرایی نەیان وتووە : (Docendo discimus) – فێرمان بکەن فێر دەبین .

وەك بیر بە بێ زمان دەرنابا ، زمانیش بە بێ بیر دەرنابا . ئێمە بیر دەکەینەوە و قسە دەکەین و دەنووسین و هەوڵ دەدەین رێکوپێکتر و روونتر بیری خۆمان لە زماندا دەربرین . رەنگە لەو حاڵەتانەدا کە قسەکەر ئەو وشانەی دەیانلێ هی خۆی نەبن ، بە وێنە کاتێ یەکێك شیعری شاعیرێك دەخوێنێتەوە یان ئەکتەرێك کە دەور دەبینی ... وا بێتە پێش چاو کە لێرەدا بیر نەبێ ، بەلام مەحاڵە ئەکتەرێك ، حیکایەتخوانێك تەنانەت موزیعێکیش وەك تووتییێك خۆی بنوێنێ کە تەلەفوز دەکا ، بەلام قسە ناکا . نەك تەنها ئەکتەر و حیکایەتخوان ، بەڵکو هەر کەسێك کە "تێکستی کەسێکی تر بڵێتەوە" بە پێی تێگەیشتنی خۆی واتای رادەگەیەنێ و دەیداتە گوێگر . ئەمە هەروەها پێوەندی بە بەکارهێنانی دەقی پەندی پێشینان و قسەی نەستەقەوە هەیە لە ئاخاوتنی ئاسایی‌دا. ئەو دەقانە کەرەستەیەکی چاکن . چونکە کورت و لەبارن ، بەلام هەڵبژاردنیان و ماناپێدانیان دەگەرێتەوە بۆ بیر و هۆشی ئاخێوەر . بەگشتی ئاخاوتنی عادەتیی ئێمە بریتییە لە وەرگرتن و کۆکردنەوەی دەق لەو زمانەوەی لێمان ئاشکرایە . دەقەکانیش ئەو شەو رستانەن ، کە وا لە ئاخاوتنماندا بەکاریان دێنین

(خۆ هەرچی سیستەمی دەنگ و ڕێزمانە ناتوانرێ شتی "نوێ"یان تێدا بدۆزرێتەوە ) .

بێگومان بارودۆخی وەهاش هەیە ، کاتێ قسەکەرێك (بە وێنە شاعیرێك) خۆی بە جوونەوەو دووپاتکردنەوەی وشەی عادەتی‌یەوە نابەستێتەوە و خۆی شت دانانێ (هەندێجار سەرکەوتووانە و هەندێ جار بە پێچەوانەوە) بەڵام وەك دەستوور وشەی نوێی شاعیر و نووسەر بە زۆری نرخی هەر لە تێکستەکەدا دەبێت و ناچێتە ناو زمانی هەموو خەڵکەکەوە . دیارە ئەو وشانە بۆ ڕاگەیاندنی واتای "هەموو شتێك" ڕۆنەنراون ، بەڵکو بۆ واتا بەخشینی تاکایەتی (فردی – Individual)ی شتێك دروستکراون ، کە پێوەندییان بە ڕوخساری سیستەمی ئەو تێکستەوە هەیە . ئەو جۆرە وشانە بۆ ئەو مەبەستە نین، کە تێکرای خەڵك بەکاریان بێنن و گشت هەواڵێکی پێ ڕابگەیەنن .

ئەم بیرە لە شێوەیەکی بە ڕواڵەت نەسازاودا و سێکست ئێمپیریك (سەدەی دووەمی پ . ز . )ی فەیلەسوفی یۆنانی دەریبڕیوە ، کە وتوویە:

"وەك ئەوە وایە کە چۆن مرۆیەك بە ڕەهاوەت پارەیێکی ناسراو بە دەستەوە دەگرێ ، کە بەپێی داب و نەریتی ئەو شوێنە لە شاردا دەردەچێ و ئاڵوگۆڕی پێدەکرێ . ئەو کەسە دەتوانێ بە بێ گیروگرفت ئەو پارەیە ، کە لەو مەڵبەندەدا شوێنی خۆی هەیە ، بەکاربێنێ . کەسێکی دی کە ئەو پارەیە بەلاوە بنێ و بێت جۆرە پارەیەکی تر

بۆخۆی دروست بکا و بیەوێ خەڵك لێی وەرگرن، ئەوە کارێکی پووچ دەکا، هەروەها لە ژیانیشدا ئەو مرۆیە لە شێت دەچێ ، کە نایەوێ ئاخاوتنی وەك پارەیێکی بڕواپێکراو بێ و وا بە باش بزانێ زمانی تایبەتی خۆی دروست بکا"[١٤] .

کاتێ ئێمە بیردەکەینەوە و ئارەزوو دەکەین شتێ بە یەکێ رابگەیەنین و تێمان بگات ، ئەوە بیر دەخەینەوە فۆرمی زمانەوە .

بەم چەشنە بیر لەسەر بنچینەی زمان لە دایك دەبێ و لەناو زماندا پتەو دەبێ . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە بە هیچ چەشنێك ئەوە ناگەیەنێ کە زمان و بیر هاوشان و جووتن .

ژیربێژی (المنطق –Logic ) لە یاساکانی بیر دەکۆڵێتەوە و جیاوازی لە نێوان مەفهووم و دەلالەت ؛ تەصەورات و تەصدیقات ؛ لێچواندن (القیاس) و قاڵبەکانیدا دەکات . بەلام لە زماندا بە شێوەیێکی تره و واتای دانەکانی : مۆرفێم ، وشە ، ڕستە لەگەڵ دابەشکردنی ژیربیژیدا وەك یەك نین .

گەلێك لە زانایانی ڕێزمان و ژیربێژیی سەدەکانی نۆزدە و بیست هەوڵیان دا گونجان لە نێوان مەفهووم و وشەدا ؛ حوکم و ڕستەدا دەست نیشان بکەن ، بەڵام ئاشکرایە ، هەموو وشەیێك واتا ناگەیەنێ (بە وێنە ئامرازی سەرسوڕمان هەست و ئارەزوو ڕادەگەیەنن ، بەلام واتا ناگەیەنن ، جێناو تەنیا شت نیشان دەدا ، بەڵام ناوی نابا و خۆی واتا

---

[١٤] هەمان سەرچاوە ، ل ، ٨٤ .

نابەخشێ ؛ گەڵێ لە ناوی تایبەتی واتایان تێدا نی‌یە ... هتد). هەروەها وەنەبێ هەموو ڕستەیەکیش حوکمی تێدا بێ (بەوێنە ڕستەی پرسیار و وریاکردنەوە) . جگە لەوە سنوورەکانی حوکم لەگەڵ ئەندامەکانی ڕستەدا یەك ناگرنەوە) .

یاساکانی ژیربێژی بۆ گشت ئادەمیزاد وەك یەکە ، لەبەرئەوەی خەڵك هەموو وەك یەك بیردەکەنەوە ، بەڵام ئەو بیرە بە زمانی جیاواز و بە جۆری جیاواز دەردەبڕن . تایبەتێتی نەتەوایەتیی زمان هیچ جۆرە پێوەندی‌یێکی بە مەنتیقی ناوەرۆکی گوتەوە نی‌یە . هەروەها بە نیسبەت فۆرمی لێکسیکی و ڕێزمانی و فۆنەتیکی گوتەی زمانێکی دیاری کراوەوە دەتوانرێ بە چەند جۆرێ دەربڕرێ ، بەڵام لەگەڵ مەنتیقی دانەکاندا یەك بگرنەوە . ( بەوێنە : من دەست هەڵدەبڕم / من دەست بەرزدەکەمەوە ؛ ئەو چوو بۆ قوتابخانە / ئەو چووە قوتابخانە...).

بەلای پێوەندیی زمان و بیرەوە کێشەی سەرەکی و بنەڕەتی جۆری تەجریدە ، کە وا چووەتە ناو سەرانسەری زمانەوە ، بەڵام لە پێکهاتنی هێڵە ئاسۆیی‌یەکانی : لێکسیکی و ڕێزمانی و فۆنەتیکی‌دا جیاوازە و خاسیەتی لێکسیك و ڕێزمان و فۆنەتیك دیاری دەکاو تایبەتێتی جیاوازیی چۆنەکیی ئەم دانانە و پێوەندیی نێوانیان ڕادەگەیەنێ .

زمان و بیر یەکێتی پێك دێنن ، چونکە بە بێ بیر زمان ناتوانێ ببێ و بیریش بە بێ زمان مەحاڵە .

زمان و بیر لە ڕووی مێژووەوە لەیەک کاتدا پەیدابوون لە ئەنجامی پێشکەوتنی زەحمەت کێشانی ئادەمیزادەوە "زمانیش هەروەک بیر دێرینە ؛ زمان وەک چۆن تەجروبە و هەبوونە بۆ خەڵکیتر ، هەر ئەو هەبوونەشە بۆ من . واقیعی بیریش هەر بەو جۆرەیە..." [١٥]

* * *

-٢-

## پێکهاتنی زمان ، زمان وەک سیستەم

زمان وەک ئامێری پێوەندی بەستن و لەیەکتر گەیشتن دەبێ وەک ڕێکخراوێکی یەک دەنگ بێ و پێکهاتنێکی ناسراوی هەبێ و وەک هەندێ سیستەم یەکێتی ماکەکانی پێکبێنێ .

بەر لەوەی بێینە سەر باسی پێکهاتن و سیستەمی زمان ، پێویستە کێشەیێکی تریش ڕوون بکەینەوە .

ئەگەر بۆچوونی ئێمە و ئەنجامی لێکدانەوەی بیرمان بریتی بێ لە ڕەنگدانەوەی "شێوە" و "قاڵب" و "ڕوخسار"ی شتی واقیعی و پرۆتسێسی سروشت ، ئەوە ئەمە پێوەندی بە وشەکانی زمان و زمان بە تێکڕاییەوە نییە .

[١٥] ك . ماركس و ف . ئینگلس ، بەرهەمەکانیان ، چاپی دووەم ، ب٣، ئایدۆلۆژیی ئەڵمانی ، ل٢٩ .

"ڕەنگدانەوە"ی ڕاستەوخۆی شت تەنیا لە چاولێکردنی دەنگدا دەبێ ، وەك (باع - باع ، وەو - وەو...) و تەنانەت ئەمانەش دەستوورێکی ئاڵۆزەکیی فۆنەتیکن و دەتوانن ببنە گیروگرفت لە ڕێگای باش دەربڕینی دەنگەکانی سروشت بە دەنگەکانی ئاخاوتن . جا بۆیە ئەو دەنگە سروشتییانە لە زمانانی جیاوازدا بە جۆری جیاواز تەقلید دەکرێن . وشەی ئاسایی دەنگ تەقلید نەکراو لە کەرەستەی ڕۆنانیدا هیچ شتێکی گشتی نییە لەگەڵ واتای ئەو شتەدا یان ئەو دیاردەیەدا کە دەیگەیەنێ . لە ڕاستیدا چ شتێکی گشتی لە نێوان کۆمەڵە دەنگی (دەم ، چاو ، برا ، پشیلە...) و ماناى ئەو شت و دیاردانە هەیە ، کە دەیانگەیەنن ؟

بە تەواوی ڕوون و ئاشکرایە ، کەوا ئەو کۆمەڵە دەنگانە "ڕەنگدانەوە"ی واقیع نین .

لەگەڵ ئەوەشدا ئەی بۆچی بەزانین کەوا (دەم) یانی (دەم) و (پشیلە) یانی (پشیلە) ... ؟

وەڵامی ئەمە لە تیۆری نیشانەدا دەبینینەوە . پێویستە چی لە زاراوەی نیشانە تێبگەین ؟ دەشێ ئەمە بە پێی ئەو چەند خاڵانەی بەسەر زماندا دادەبڕێ ، لێك بدرێتەوە :

١ - نیشانە دەبێ مادی بێ - واتە وەك هەموو شتێك بە ئاسانی هەست و دەرکی پێ بکرێ .

٢ – نیشانە واتای نی‌یە ، بەلام ئاراستەی واتا کراوە و هەبوونی لەبەر بەجێهێنانی ئەو ئەرکەیە . بۆیە نیشانە – دووەم ئەندامی سیستەمی نیشارەتە .

٣– ناوەڕۆکی نیشانە لەگەڵ خاسییەتە مادی‌یەکاندا یەک ناگرنەوە ، ئەوسا وەک ناوەڕۆکی شت لە خاسیەتە مادی‌یەکانی دوور دەکەوێتەوە .

٤ – ناوەڕۆکی نیشانە بە خاسیەتە جیاکەرەوەکانیدا دەردەکەوێ، کە بە رێگەی شی‌کردنەوەدا جیادەکرێتەوە و لە جیانەکراوەکاندا جیادەکرێتەوە .

٥ – نیشانە و ناوەڕۆکی بەجێگە و دەوری ئەو نیشانەیە لە سیستەمی شی‌کردنەوەی بە دوایەکدا هاتنی نیشانەدا دیاری دەکرێ .

ئەمە دەشێ بەو جۆرە نموونانە ڕوونبکرێتەوە . ئەگەر (پەڵە) و (پیت) ، کە سروشتی مادییان وەک یەکە و هەردووکیان بەر توانای ئەندامەکانی هەست دەکەون ، بەراورد بکرێن ئەوە ئاشکرا دەبێ کە بۆ خاسیەتەکانی (پەڵە) هەموو خاسیەتە مادی‌یەکانی : بارست ، شێوە ، ڕەنگ ، پلەی کاڵی و تۆخی ... وەک یەک گرنگن . بەلام بۆ پیت تەنها ئەوە گرنگە ، کە ئەم پیتە لە پیتێکی تر جیابکرێتەوە : پیتی (ا) دەشێ گەورە بێ یان بچووک ، کاڵ بێ یان تۆخ ، ڕەنگی هەمەچەشن بێ ... بەلام هەر (ا)یە ، کەچی لە گۆڕینی ئەو خاسیەتانەدا (پەڵە) جیا دەبێتەوە . (پەڵە) هیچ ناگەیەنێ ، بەلام پیت دەیگەیەنێ ، ئەگەرچی واتای خۆی نی‌یە . (ا) لەبەرئەوە بوونی هەیە ، کەوا لە (ۆ ، ی ... هتد) جیابکرێتەوە ، تاکو (مار) لەگەڵ (مۆر ، میر ..) تێکەڵ نەکرێن ... هتد .

پیت دەشێ شێوەی ماددی بگۆڕێ ، بە وێنە : جـ ، جـ ، ـجـ ، ج ، ج ... جـ ، جـ ، ـجـ ، ج ، ج ، ... بەلام ئەمە بە نیسبەت (پەڵە)وە ، کە

شێوەی بگۆڕێ دەبێ بە پەڵەی جیاواز . لێرەدا مەسەلە ئەوەیە ، کەوا نیشانە بریتی‌یە لە ئەندامی دیاریکراوی سیستەمی نیشانە .

توانستی نیشانە ، کە بەجێ‌هێنانی ئەرکی جیاکردنەوەیە ، لەسەر ئەوە دامەزراوە کە نیشانە لە سنووری ئەو سیستەمی نیشانەیەدا (ئەلفوبێ ، پێکهاتنی دەنگیی زمان)[١٦] خۆی جیادەبێتەوە یان بە تێکڕایی یان بە یاریدەی تایبەتێتی‌یەك . ئەمەش دیسان ئاسانترە لەسەر پیت نیشان بدرێ . بە وێنە (ۆ) و (ن) بە تێکڕایی لە یەك جیاوازن و هیچ شتێکی گشتی لە نێوانیاندا نی‌یە . بە پێچەوانەوە (س) و (ش) هەموو شتێکیان وەك یەکە ، جگە لە تایبەتێتی‌یەك کە "سێ خاڵ"ە لەسەر (ش) .

لەنێو زانایاندا لە بارەی نیشانەوە لە زماندا ڕاییێکی یەکگرتوو نی‌یە و زۆریان ئەو تێگەیشتنە بە جۆری جیاواز لێکدەدەنەوە .

ف . ف . فۆرتوناتۆڤ زاراوەی "نیشانە"ی بە لاوە پەسەندبووە و زۆری بەکارهێناوە و نووسوێتی : "زمان بریتی‌یە لە هەمەکی نیشانە، بە شێوەیێکی سەرەکی بۆ بیر و دەربڕینی بیر لە ئاخاوتندا . جگە لەوەش ، لە زماندا هەروەها نیشانە بۆ دەربڕینی هەستیش هەیە"[١٧].

فۆرتوناتۆڤ هەروەها نیشانەی بۆ دەربڕینی پێوەندییش تەماشا کردووە: " ... دەنگەکانی وشە بریتین لە نیشانەی بیر ، بەتایبەتی

---

[١٦] ئەگەر نیشانەیێك بگوێزرێتەوە بۆ سیستەمێکی تر ئەوە دەبێ جێگە و ئەرکی لە سیستەمدا بگۆڕێ . بە وێنە ( P) لە ئەلفوبێی ڕووسیدا –نیشانەی فۆنێمی (ڕ)ە ، بەڵام لەلاتینیدا ( P) – نیشانەی فۆنێمی (پ)ە . وەك "شت" یەکن ، بەڵام وەك "نیشانە" جیاوازن .

[١٧]) ف . ف . فۆرتوناتۆڤ ، زمانناسیی بەراوردکاری ، بڕوانە : کارە هەڵبژاردەکانی ، ب١، مۆسکۆ ، ١٩٥٦، ل٢ .

نیشانە وەك ئەوەی بۆ بیر دێن (واتە – نیشانەی شتەکانی بیر) ، وەك ئەوەی بیر دەیهێنێت (واتە – نیشانەکانی ئەو پێوەندییانە کەوا لە بیردا دەکرێنەوە لەنێوان بەشەکانی بیردا یان لەنێوان تێکرای بیردا"[18].

دواتر فۆرتوناتۆڤ تەماشای کاری هاوبەشیی نیشانەی هەمەچەشنەی لە زماندا کردووە ، کەوا لەگەڵ لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی فۆرمی وشە و تێگەیشتنی واتای هاوسەنگی نیشاندەدا . فۆرتوناتۆڤ باسی ئەو جۆرە خزمایەتی‌یەی لایەنی دەنگیی زمان دەکات ، کەوا هەستی پێ دەکرێ (لەو نیشانانەی زماندا کە خراونەتە ڕوو) وەك واتاگۆڕیی ئەو نیشانانە کە لەگەڵیان یەك دەگرن و چونکە وەك دروست کەرانی ئەم نیشانانەی لە نیشانەی تر خۆیان بریتین لە جۆری نیشانەی ناسراو لە زماندا ، بەتایبەتی نیشانە لەگەڵ واتای شێوەیی و واتای ناشێوەیی نیشانەکانی زمان لە پێوەندی‌یاندا لەگەڵ واتای شێوەیی زماندا بە واتای ماددی یاخود واقیعی ناودەبرێن) [19].

لە مەیدانی تیۆریی نیشانەدا ژیربێژی ئەڵمانی - ئێدمۆند هۆسسێرل لە "لێکۆڵینەوەی ژیربێژی"دا پەنجەی بۆ جیاکردنەوەی ئێجگار گرنگ ڕاکێشاوە :

١ _ هەموو دەربڕینێك نیشانەیە .

٢ _ پێویستە نیشانەی ڕاستەقینە (Zeichen) لە هێما یان پێوار (Anzeichen) جیابکرێتەوە وەك لە وێنەکێشانی خاچی هەمەجۆر بۆ مەبەستی جیاواز ، پەتکردنە دەست و گرێ‌لێدان بۆ لە بیرنەکردن"

---

[18] هەمان سەرچاوە ، ل١١٧ .

[19] هەمان سەرچاوە ، ل١٢٤ .

٣ _ نیشانە بۆ واتا ئاراستەکراوە ، هەرچی هێما و پێوارە بۆ واتای ساکار دەمێنێتەوە .

٤ _ ئاراستەکردنی نیشانە دەشێ پێوەندی بەشتە ناوبراوەکەوە هەبێ _ ئەمە "پێوەندیی شت"ە بە "دەربڕینی قسەکەر"ەوە و بەتایبەتی بە واتاوە .

٥ _ شتی زۆر گرنگ بۆ زمانەوانان بریتییە لە جیاکردنەوەی حاڵەتەکانی : أ) واتا – شتی جیاواز . ئەمە کۆکەرەوەیە– مانای گشتی، وەك : ئەسپ ، مرۆڤ .. ، ب) یەك شت -مانای جۆربەجۆر – ئەمە هاوواتایە ، وەك : پەنجە – قامك ...[٢٠].

لە گەشەپێدانی بیروڕای ئی . هۆسسێرلدا ، دەروونناس و فەیلەسووف و زمانناسی نەمساوی – کارل بیولێر لە کتێبی "تیۆریی زمان"دا باسی بەریانی جۆربەجۆری نیشانەکانی زمانی کردووە و ئەرکە بنەڕەتیەکانی زمانی دەست نیشانکردووە :

١ _ ئەرکی دەربڕین یاخود چۆنێتی دەربڕین ، کە دۆخ و باری قسەکەر دەردەبڕێ . ئەو نیشانانەی دەریان دەبڕێ بریتین لە "بەڵگە"، بە وێنە ئامرازی ئاخ ، ئۆف ... هتد .

٢ _ ئەرکی بانگکردن و ڕووکردنە گوێگر یان ئەرکی داوای یارمەتیکردن . ئەم جۆرە نیشانانە بریتیین لە ئیشارەت (بە وێنە ، هاوارکردن : هێی ، ڕێژەی فەرمان : بوەستە ! ... هتد) .

٣ _ ئەرکی بۆچوون . کاتێ یەکێك باسی شتێك بۆ یەکێکی تر دەکات یان شتێکی بۆ دەگێڕێتەوە ، ئەوە بیولێر ئەو جۆرە نیشانانەی

---

[20] Husserl , logisch Untersuschungen ,
(Ausdruck and Bedeutung) : چاپی دووەم ، ب٢، ١٩١٠، فەسڵی دووەم

ناو ناوە نیشانەی ڕەمز . ئەم ئەرکە ، ئەرکی هەرە گەورە و گرنگی زمانە ، چونکە بەهۆی ئەم ئەرکەوە پێوەندی ساز دەبێ"[21].

زمانناسی دانیمارکیی – ل . ئێلمسلێڤ دەربارەی نیشانە نووسیوێتی : "مەبەستی زمان بەر لە هەرشت سیستەمی نیشانەیە ، بۆ ئەوەی بە تەواوی ئەو مەبەستە بەجێ‌بێنێ ، پێویستە هەمیشە ئامادەبێ بۆ دروستکردنی نیشانەی نوێ و وشەی نوێ و ڕەگی نوێ... پەیدابوونی بارودۆخی بێ سنووریی ژمارەی نیشانە لەوەوە دێ کە هەموو نیشانەکانی لەسەر شتێ ڕۆدەنرێن کە نیشانە نین و ژمارەیان سنووردارە . ئەو نانیشانانە ، کە وەك بەشێکی نیشانە دەکەونە سیستەمی نیشانەوە پێیان دەوترێ تەن (Figure) . ئەمە زاراوەیێکی برین‌سازی‌یە و لێرەدا بەکارهێنانی لەبارە . بەم شێوەیە زمان کۆکراوەیێکی وایە ، کە بەیاریدەی تەنی ئامادەبوو و لە ڕێگەیەوە دەتوانێ ژمارەیێکی بێ‌شومار نیشانەی نوێ ڕۆبنێ ..."[22].

هەروەها باوەڕێکی وەهاش هەیە ، کە ئەوەی ئێلمسلێڤ ناوی ناوە تەن (Figure) پێی دەڵێن نیشانەی جیاکەرەوە (Diacritical mark sign) . ئەوەش کە بەنیشانەی تایبەتی ناوبردووە ، بە نیشانەی ڕەمز (Symbol) دادەنێن . هەروەها دەشێ نیشانەی جۆری یەکەم (تەن و جیاکەرەوە) و جۆری دووەم (ڕەمز)یشیان پێ بوترێ .

---

(21) Buhler, Sprachtheorie lena, 1934

ئەو ئەرکە جۆربەجۆرانەی زمان کە بیولێر دەستنیشانی کردوون ن . س ، تروبێتسکی لە کتێبی (بنەماکانی فیلۆلۆژی) (مۆسکۆ ، ١٩٦٠)دا باسی کردوون .

(22) لوون ئێلمسلێڤ ، یەکگرتنەوە لەگەڵ تیۆریی زمان (تەرجومەی رووسی "نوێ لە زمانناسیدا" ب١ ، ١٩٦٠، ل٣٠٥) .

نیشانەی جۆری یەکەم بریتین لە نیشانەکانی دەنگ و نووسین ، کە بەر هەستی ئادەمیزاد دەکەون و خۆیان واتایان نییە ، لە سیستەمێکدا دانــراون و ڕێکوپێــك کۆکراونەتــەوە و لــەوێوە خاســیەتی خۆیــان وەردەگرن .

مۆرفێم کە بەشێکی سنووری هەیـە ، وەك (ئـافیکس) و بەشێکی سـنووری نییــە ، وەك (ڕەگ) واتــای خــۆی هەیــە . وشــە لــە زمــاندا سنووری نییە (ئەگــەرچی هــەر تێکســتێك دەکــرێ ژمــارەی وشــەکانی دیاری بکرێ) ، بەڵام لەبەرئەوەی مۆرفێم و وشە لە نیشانەکانی جۆری یەکەم (فۆنێم ، پیت) پێکدێن ، بۆیە ئەم دانانەی زمانیش _ هەروەها نیشانەن .

ئەمە پتر ڕوون دەبێتەوە ، ئەگەر تەماشای پێوەندیی وشە و واتـای ئەو شتانە بکەین کە دەیان گەیەنێ .

وشە وەك نـاوی شت و دیاردە هیچ شتێکی هاوبەشی لەگەڵ ئـەو شت و دیاردانەدا نییـە ، ئەگـەر پێوەندییێکی وەهـا ئاسـایی لـە نێـوان وشە و شتدا هەبوایە ، ئەوە لە زمـاندا نـە وشـەی هاوواتـا (مـرادف _ Synonym) _ ئـەو وشـانەی یـەك مانـا دەبەخشـن یـاخود مانایـان لێـك نزیکە، بـەڵام لـە خوێندنـەوە و نووسـیندا جیـاوازن (تـووش _ دژوار _ سـەخت _ نـاخۆش ، خـاپوور _ وێران...) و نە وشـەی هـاوبێژ (مشـترك لفظـي _ Homonym) _ ئـەو وشـانەی لـە خوێندنـەوە و نووسـیندا وەك یـەکن ، بـەڵام مانایـان جیـاوازە (ئـاش _ جێـی هـاڕین و پاككردنـی دانەوێڵە و ئاش _ چێشت ، بیر _ بیر وهۆش و بیر _ بنری عەرەبی...) نـەدەبوو . هـەروەها مانـای پێچـەك (المعنـی المجـازی _ Transferred meaning)یـش (ئاگرنانـەوە _ ئاگربەردانـە شـوێنێکەوە کـە بسـووتێ و ئاگرنانـەوە _ هەڵگیرساندنی شەڕ و ئاشووبنانەوە ، نـەرم _ شـتێك کـە

ڕەق نەبێت و نەرم _ مرۆڤی نەرم... هتد) پەید نابێ . لە کۆتاییشدا ، هەروەها لە زمانانی جیاوازدا بۆ گەیاندنی واتای یەك دیاردە وشەی جیاواز دروست نەدەبوو .

ك . ماركس نووسیویە كەوا "ناوی هەر شتێك هیچ شتێكی هاوبەشی لەگەڵ سروشتیدا نییە"[٢٣].

بۆیە ناكرێ مانای ڕاستەوخۆی وشەی دانەڕێژراو بزانرێ . ئێمە نازانین بۆچی بە "چاو" دەوترێ "چاو" و بە "بەرخ" دەوترێ "بەرخ" و بە "بەرد" دەوترێ "بەرد" ...

بەڵام وشەی داڕێژراو لە وشەی سادە ، واتا زانینی لە ڕێگای وشە دانەڕێژراوەكانەوە ئاسانە . بە وێنە "چاویلكە" لە ڕێگای "چاو"ەوە ، "بەرخۆلە" لە ڕێگای "بەرخ"ەوە ، "بەردەڵان" لە ڕێگای "بەرد"ەوە... ئەمەش وەك ئەوە وایە ، كە مانای پێچەكی وشە لە ڕێگای مانای ڕاستەوخۆی (المعنى الحقيقي _ Direct proper meaning)یەوە ڕوون دەبێتەوە . بە وێنە وشەی "بارخستن" بە مانای (كەوتنی مریشك و كەڵەشێر لەسەر تەنیشت) لە ڕێگای نێزیكی و وێكچوونی ئەو ڕووداوە لەگەڵ "بارخستن" بە واتای (كردنەوەی بار و خستنی لە شوێنێك)دا ئاشكرا دەبێ . یاخود وشەی "نەرم" بە مانای (مرۆڤی لەسەرخۆ و ئاسك و بە ئەدەب) بە هۆی نێزیكی و وێكچوونی خاسیەت و ئەركی ئەم دیاردەیە لەگەڵ "نەرم" بە واتای "شتێك كە ڕەق نەبێ" بە دەردەكەوێ ... هتد .

بەم چەشنە وشەی داڕێژراو لەگەڵ واتای پێچەكی ئەسڵیان دیارە و لە زمانی ئەمڕۆدا لە ڕێگەی وشەی دانەڕێژراو و مانای ڕاستەوخۆوە

---

[٢٣] ك . ماركس : سەرمایە ، ب ١، كتێبی١ ، مۆسكۆ ، ١٩٥٥، ل١٠٧ .

ڕوونده‌کرێنه‌وه . هه‌رچی دانه‌رێژراو و مانای ڕاسته‌وخۆیه‌ ئه‌سڵیان ئاشکرا نی‌یه‌ و له‌ ڕێگای زمانی ئه‌مڕۆوه‌ ڕوون ناکرێنه‌وه . زانینی ئه‌سڵی ئه‌و ناوانه‌ ته‌نیا له‌ ڕێی لێکۆڵینه‌وه‌ی ئێتیمۆلۆژی‌یه‌وه‌ و به‌ یارمه‌تی شێوازی به‌راوردکاریی مێژوویی ئه‌نجام ده‌درێ .

له‌ گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا ئه‌ی بۆچی "چاو ، به‌رخ ، به‌رد ..." هه‌ر یه‌ککرتنی ده‌نگ نین و وشه‌ن و مانایان هه‌یه‌ و ئاخێوه‌ری کورد تێیان ده‌گات ؟

بۆ ڕوونکردنه‌وه‌ی ئه‌م کێشه‌یه‌ پێویست به‌ ئاوڕدانه‌وه‌ له‌ پێکهاتنی زمان ده‌کات .

مه‌به‌ست له‌ پێکهاتن یه‌کێتی ماکی جیاوازه‌ له‌ سنوورێکی گشتی‌دا .

ئه‌وه‌ی له‌ یه‌که‌م هه‌نگاوی ته‌ماشاکردنی پێکهاتنی زماندا به‌ره‌نگاری ده‌بین ، سه‌رنجچوونه‌ بۆ شتێکی زۆر سه‌یر ، ئه‌ویش مه‌سه‌له‌ی ئاڵۆزی و نه‌سازانی ئه‌و پێکهاتنه‌ی زمانه‌ .

به‌ڵێ له‌ یه‌که‌م سه‌رنجدا له‌ قسه‌گه‌یشتنی یه‌کتر زۆر ئاسانه‌ : من قسه‌ ده‌که‌م ، تۆ گوێ‌ده‌گری ، ئێمه‌ له‌ یه‌کتر تێ‌ده‌گه‌ین . ئه‌مه‌ ته‌نها له‌به‌رئه‌وه‌ی عاده‌ت وایه‌ . به‌ڵام ئه‌گه‌ر باش له‌وه‌ بیربکه‌ینه‌وه‌ که‌ ئه‌مه‌ چۆن ڕووده‌دات ، ئه‌وه‌ به‌ره‌نگاری دیارده‌ی ئێجگار سه‌رنجڕاکێش ده‌بین : قسه‌کردن به‌ هیچ چه‌شنێك وه‌ك گوێگرتن نی‌یه‌ . هه‌رچی تێگه‌یشتنیشه‌ له‌ هیچیان ناکات . ئه‌مه‌ وا ده‌گه‌یه‌نێ قسه‌که‌ر شتێك ده‌کا و گوێگر شتێکی‌دی ، که‌چی هه‌ردووکیان شتێکی سێیه‌م تێ‌ده‌گه‌ن.

پرۆتسێسی قسه‌کردن و گوێگرتن وه‌ك ئاوێنه‌ و پێچه‌وانه‌که‌یه‌تی. کۆتایی پرۆتسێسی قسه‌کردن بریتی‌یه‌ له‌ سه‌ره‌تای پرۆتسێسی گوێگرتن . قسه‌که‌ر که‌ له‌ نێوه‌ندی مێشکه‌وه‌ پل وه‌رده‌گرێ ،

ئەندامەکانی ئاخاوتن دەکەونە کار و لە ئەنجامدا دەنگ پەیدادەبێ ، بە ڕێگای هەوادا دەگاتە ئەندامی بیستن _ (گوێ)ی گوێگر. پەردەی گوێ و ئەندامەکانی تری ناو گوێی بیسەر ئەمە دەدەن بە دەمارەکانی بیستن و ئنجا دەگاتە نێوەندی مێشك لە شێوەی هەستکردندا و لە کۆتاییدا تێگەیشتن لێی .

ئەوەی قسەکەر دەیهێنێتە ئەنجام کۆمەڵی ئەندامانی وتن ڕێکیدەخەن . ئەوەش کە وەریدەگرێ و هەستی پێ دەکا کۆمەڵی ئەندامانی بیستن سازی دەکەن .

کۆمەڵی ئەندامانی وتن لە ڕووی فیزیاوییەوە لە کۆمەڵی ئەندامانی بیستن ناچێ . بەڵام لە کاری قسەکردندا ئەو دوو کۆمەڵە یەك شت سازدەکەن ، ئەمە دوو ڕووی یەك مەبەستە . لە ڕاستیدا وشەی "چاو" ئەگەر دەریبڕین یان بیبیستین لە ڕووی زمانەوە هیچ جیاوازییێکی نییە .

وێکچوونی وتراو و بیستراو لە خۆنواندنی ئاخاوتندا بە هۆی ئەوەوە دەگاتە ئەنجام ، کە کاری ئاخاوتن دوو لایەنە . ئەمە بە تایبەتی لە وتووێژدا دەردەکەوێ کە قسەکەر دەبێتە گوێگر و گوێگر دەبێتە قسەکەر . جگە لەوە هەر قسەکەرێك بێئاگایانە بیستنی خۆی تاقیدەکاتەوە و گوێگریش وتنی . وێکچوونی وتراو و بیستراو ڕێكوپێکی هەست دەگەیەنێتە ئەنجام و بە بێ ئەمە _ واتە بە بێ هەست قسەکەران ناتوانن لە یەکتر تێبگەن .

لە دەرككردنی زمانێکی نەناسراودا یەکێتی وتن و بیستن پەیدا نابێ . بۆ دەرك کردنی ڕاست پێویستە هەردوو قسەکەر و گوێگر _ زمانی ئەو وتراو و بیستراوە باش بزانن . بەڵام کار (act)ی زمان بە دەرككردن ناگاتە کۆتایی، ئەگەرچی بە بێ دەرككردن هیچ ئەنجامێك

پەیدانابێ . پلەی دواتر _ تێگەیشتن _ە . تێگەیشتنیش ئەو دەمە دەوری تەواوی خۆی بە جێدێنێ ، قسەکەر و گوێگر ئەو یەکێتی وتن و بیستنە لەگەڵ هەمان واتادا پێکەوە ببەستن . خۆ ئەگەر قسەکەر و گوێگر ئەو یەکێتی وتن و بیستنە لەگەڵ واتای جیاوازدا بە یەکەوە ببەستن ، ئەگەرچی لە بواری دەرککردنێکی ڕاستیشدا بێ ، لە یەکترگەیشتن پەیدا نابێ . بە وێنە ئەگەر عەرەبێك و کوردێك بە یەك بگەن و عەرەبەکە بڵێ "دار" ، ئەوە کوردەکە بە ئاسانی کۆمەڵی ئەندامی وتنی "دار" دەخاتە ژێر باری کۆمەڵی ئەندامی بیستنی کوردی "دار"ەوە ، بەڵام بە "درەخت" یان "لقی درەخت"ی تێدەگا، چونکە "دار"ی عەرەبی بە کوردی "خانوو"ە . بەم چەشنە لە پلەی دووەمی کاری زمانیشدا ، هەروەك لە پلەی یەکەمدا پێویستە کەوا قسەکەر و گوێگر سەر بەو کۆمەڵە بن ، کە بە یەك زمان قسەدەکەن ، ئەوسا کۆبوونەوەیێکی نوێی لەیەکنەچوو پێك دێ : وتن و بیستن و واتاش یەکێتییێك پێکدێنن .




نەخشەی کار (act)ی وتراو

واز لە پلەی یەکەمی کاری قسەکردن دێنین و سەیرێکی پێوەندیی دووەم دەکەین .

لە زماندا هەمیشە پێویستە دوو ڕوو هەبێ :

یەك _ ڕووی دەرەوە ، کە ماددیی‌یە و بە کۆمەڵی ئەندامانی وتن و بیستنەوە بەندە ؛ دوو _ ڕووی ناوەوە ، کە ماددی نییە و بە واتاوە بەندە . دیاردەی یەکەم ئەرکی ئەوەیە لە ڕێگای نیشانەوە قسە بگەیەنێتە ئەندامانی هەست کردن ، کە بەبێ ئەمە لە یەکترگەیشتن مەحاڵە . دووەم - ئەرکی لێکدانەوەی ناوەڕۆکە و بە بیرەوە بەندە .

دەربڕینیی ڕاستەوخۆی واتا لە دەنگدا بۆ زمان شتێکی ئاسایی نییە . ئەمە لە ئیشارەتی هەمەچەشنەی میکانیکی‌دا دەردەکەوێ . بە وێنە لە ترافك لایتدا ڕەنگی سەوز "ڕاستەوخۆ" واتای "دەشێ" دەگەیەنێ ؛ ڕەنگی سوور واتای "ناشێ" دەدات ، ڕەنگی زەردیش واتای "ئامادە بە" یە . لەم جۆرە سیستەمانەی ئیشارەتدا لە نێوان واتا و دەرکدا هیچ ماددیی‌یەتێك نییە . لە زماندا تەنانەت ئامرازەکانیش لەو پێکهاتنە نەخشەییە جیاوازن ، چونکە ئامراز دەتوانێ ئەرکی ڕستەیەکی سەر لەبەر بەجێبێنێ، وەك (ئاخ - ئاخ هەڵکێشان ...) و وەك ئاشکرایە دوورە و پەرێز نەوەستاوە ، بەڵکو پێوەندی لەگەڵ ماکەکانی تری زماندا هەیە و وەك سیستەمی ئیشارەت دروستکراو نییە .

ئەوەی بۆ زمان ئاسایی بێ ، ئەوەیە بریتی‌یە لە سیستەمێکی ئاڵۆزی تێکچڕژاوی ماکی هەمەجۆر .

بۆ دیاری‌کردنی ئەو ماکانەی دەکەونە پێکهاتنی زمانەوە ، ئەو نموونەیە لێکدەدەینەوە : دوو ڕۆمانی گرەویان کرد کێ دەتوانێ کورتترین ڕستە بڵێ (یان بنووسێ) . یەکێکیان وتی (نووسی) :

"Eo rus – من دەچم بۆ لادێ" . ئەوی تریان وەڵامی دایەوە : " i – بچۆ". ئەمە کورتترین وتراو (یان نووسراو)ە . بیهێنە بەرچاو ، کە لەگەڵ ئەوەشدا بە تەواوی وتراوێکی تەواوکراوە و لەو وتووێژەدا لە تێکستێکی تەواو پێکهاتووە و دیارە تێکڕای ئەو خاسیەتانەشی تێدایە کە لە هەر وتراوێکدا هەن . ماکەکانی ئەم وتراوە چین ؟

١- ( i ) - ئەمە دەنگی ئاخاوتنە ( ڕاستتر فۆنێمە) - واتا نیشانەی ماددی‌یە دەنگە گوێ دەرکی پێ دەکا ، یاخود ( i ) – ئەمە پیتە - واتا نیشانەی ماددیی نووسینە و چاو دەرکی پێ دەکا .

٢- (i) – ئەمە ڕەگی وشەیە (بە گشتی مۆرفێمە) – واتا ماکێکە مانایەك دەردەبڕێ .

٣- (i) – ئەمە وشەیە (کرداره لە ڕێژەی فەرماندا بۆ تاك) ، دیاردەیێکی واقیعی دیاریکراو ناو دەبا .

٤- (i) – ئەمە رستەیە – واتا ماکێکە هەواڵێك دەگەیەنێ .

دەرکەوت، ئەو (i)یە بچووکە هەموو ئەوەی گرتۆتە خۆ کە بە گشتی زمانی پێکهێناوە :

١- دەنگەکان – فۆنەتیك (یاخود پیتەکان – نووسین) .

٢- مۆرفێم (ڕەگ ، پاشگر ، کۆتایی) – مۆرفۆلۆژی .

٣- وشە (لێکسیك) .

٤- ڕستە (سینتاکس) .

لە زماندا لەمە زیاتر نی‌یە و نابێ .

بۆچی بۆ ڕوونکردنەوەی کێشەی پێکهاتنی زمان ئەو نموونە سەیرە پێویست بوو ؟ بۆ ئەوەی ڕوون و ئاشکرا ببێ ، کە جیاوازی ماکە پێکهێنەکانی زمان چەندەکی نی‌یە . ئەگەر ڕستەیەکی درێژمان بکردایەتە نموونە و وشە وشە و مۆرفێم مۆرفێم و فۆنێم فۆنێم جیامان

بکردایەتەوە ، ڕەنگە بە چەندەکی بهاتایەتە پێش چاو . لەو نموونەیەدا ئەو مەترسی‌یە لادراوە : هەموو پلەکانی پێکهاتنی زمان هەر ( i I ) ن ، بەلام هەر جارە بە چەشنێکی تایبەتی .

بەو پێیە جیاوازی ماکە پێکهێنەکانی زمان - چۆنەکی‌یە . چی ئەرکە جیاوازەکانی ئەو ماکانە دیاری دەکا ؟ ئەرکی ئەو ماکانە چین ؟

١ - دەنگ (فۆنێم) نیشانەیەکی ماددی زمانە ، نەك تەنها دەنگێکی گوێ لێبوو .

نیشانەی دەنگیی زمان ( هەروەك لە نووسینیشدا) دوو ئەرکی هەیە :

ا - دەرك کردن - واتا بەر کاری هەست کەوتن .

ب - واتا گەیاندن - بوونی توانای جیاکردنەوەی واتای ماکەکانی زمان : مۆرفێم ،وشە ، ڕستە .

ئەوەی لە زماندا پێوەندی بە جیاوازیی پیت (نیشانەی نووسین) و دەنگ (نیشانەی فۆنەتیك)ەوە هەیە شتێکی ئەرکگێڕی نی‌یە ، بەلکو ماددی‌یە . ئەرکی هەردووکیان - پیت و دەنگ - یەك شتە .

٢ - مۆرفێم دەتوانێ واتا بگەیەنێ :

ا - ڕیشەیی ، وەك : سەر ، شار ، ڕەش ، جل ....

ب- ناڕیشەیی . ئەمیش دوو جۆرە : واتای خاسیەت و واتای پەیوەندیی . ئەمەش ئەرکی واتاناسی (Semasiology)یە ، ئەرکی دەربڕینی واتایە .

٣ _ وشە دەتوانێ ناوی شت و دیاردەی واقیعی بێ . ئەمە ئەرکی ناونانە . بۆ ئەرکی ناونان وشە هەیە ، کەوا بێ هیچ یاریدەیەك یەکسەر ئەرك دەبینێ ، ئەویش ناوی تایبەتی‌یە .

٤ _ ڕستە دەوری گەیاندنی هەواڵێك دبینیّ ، کە ئەمە شتی هەرە گرنگی لەیەکتر گەیشتنی ئاخاوتنە ، چونکە زمان ئامێری لەیەکتر گەیشتنە. ئەمە ئەرکی لەیەکتر گەیشتە ، لەبەر ئەوەی ڕستە بریتی‌یە لە وشە و لە پارچە پێکهێنەکانی وشەشدا ئەرکی ناونان و ئەرکی واتاناسی هەیە .

ماکەکانی ئەم پێکهاتنە لە زماندا یەکێتی پێك دێنن .

تێگەیشتنی ئەمەش ئاسانە ، ئەگەر سەرنج لە پەیوەندی‌یان بدەین: هەر پلەیەکی خوارتر بریتی‌یە لە وزەی پلەی داهاتووی سەرووتر . بە پێچەوانەشەوە هەر پلەیەکی سەرووتر بە لایەنی کەمەوە لە یەکێکی خواروتر پێکهاتووە . بە وێنە ، ڕستە دەشیّ بە لایەنی کەمەوە لە وشەیەك پێکهاتبیّ ، وەك : (چوون ، ڕاکردن ، سەهۆڵ ...) . وشە دەشیّ لە یەك مۆرفێم پێکهاتبیّ : (ڕیّ ، جیّ ، دڵ ...) ؛ مۆرفێم دەلویّ لە یەك فۆنێم ساز بووبیّ : (ڕاستە ، سەوزە ...) .

جگە لەو ئەرکانەی ناومان بردن ، زمان دەتوانیّ ئەرکی هەست بزواندنی قسەکەر ببینیّ ، وەك : ئارەزوو ، هیوا ، ناسکی ، تووڕەیی... دەربڕینی ئەو دیاردانەش بەر ئەرکی شێوە و چۆنیەتی دەربڕین دەکەویّ . شێوە و چۆنیەتی دەربڕین دەشیّ بە ماکی جیاجیای زمان بە جیّ بهێنریّ بە وێنە ئامرازی (ئاخ ، داخ ، حەیف ، ئۆی ...) بۆ ئەسەف و پەژارە ؛ ئامرازی (پەح ...) بۆ سەرسوڕمان ؛ هەندیّ فۆرمی ڕێزمانی (وشە لەگەڵ پاشگری بچووککردنەوە بۆ گەیاندنی مانای نازداری ، وەك: کیژۆڵە ، جامولکە ، باخچە ؛ هەندیّ وشەی بەرز و نزمی شێواز و لە کۆتاییشدا ئاواز .

پێویستە ئەرکێکی تریش باس بکەین ، کە ماکەکانی زمان و بزواندن (بەتایبەتی ڕاوەشاندنی دەست) پێکەوە دەبەستیّ . ئەمەش

ئەرکی (نیشاندان)ە . جێناوی کەسی و جێناوی نیشاندان و هەندێ ئامراز ئەم ئەرکە دەبینن .

لە سنووری هەر دەورەیەکدا پێکهاتنی زمانی فۆنەتیکی ، مۆرفۆلۆژی ، لێکسیکی ، سینتاکسی سیستەمی خۆی هەیە ، چونکە هەموو ماکەکانی ئەو دەورەیە وەك ئەندامی سیستەم خۆیان دەنوێنن .

سیستەم – بریتی‌یە لە یەکێتی کۆمەڵە ماکێکی جۆر و هەل و مەرج وێکچوو .

بە هیچ چەشنێك ناشێ واتای سیستەم بگۆڕێ بە واتای ڕێکهێنانی ڕوخساری میکانیکی . هەر بەم جۆرەش زمان کە ئامێری لە یەکتر گەیشتن و پێوەندی بەستنە لە ئامێری بەرهەم جیادەبێتەوە . لە ڕووی ڕوخسارەوە ڕێکهێنانی چۆنەکی هەر ماکێك بە سەرجەمەوە بەند نی‌یە • (ئەگەر کورسی چوار –چوار یان هەشت – هەشت ڕیز بکەین و گشتیان ببن بە ٣٢ یان ٦٤ کورسی ، ئەوە هەر کورسی‌یێك وەك ئەو شێوەیە دەمێنێتەوە ، ئەگەر بە تەنیا دابنرایە) .

ئەندامەکانی سیستەم ، بەپێچەوانەوە، پێکەوە بەندن و سەرجەم هاو هەل و مەرجن ، بۆیە ژمارەی ماکەکانی و پێوەندیی نێوانیان لە هەر ماکێکی ئەو سیستەمەدا ڕەنگدەداتەوە . خۆ ئەگەر ماکێك بمێنێتەوە ، ئەوە ئەو سیستەمە پووچ دەبێتەوە . بەوێنە سیستەمی گەردان کاتێ دەبێ ، کە هیچ نەبێ بە لایەنی کەمەوە دوو دۆخ هەبێ (بە نموونە لە جێناوی he – him ی ئینگلیزی‌دا) . سیستەمی گەردان لەباری بوونی تاکە یەك دۆخدا پەیدا نابێ . بە نموونە لە زمانی کوردیدا تەنیا کاتێ کرداری تێپەڕ دەبێ ، کە لەو سیستەمی ڕێزمانەدا کرداری تێنەپەڕ هەبێ .

سیستەمی پێکهاتنی ڕیزە جیاجیاکانی زمان کار لەیەکتر دەکەن و سیستەمێکی گشتیی ئەو زمانە ساز دەکەن .

-٤-

## زمان و ئاخاوتن

زمانناسانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەم پەتی گشتی‌یایەتی (Univirsalism) و وشکەبڕوایەتی (الدوغمائیە - Dogmatism)ی ڕاڕەوی سروشتەکی (مذهب الطبیعیین- naturalism)ی شلێخەریان پساند و تا دەهات پتر لە لێکۆڵینەوەی تاکایەتیی ڕاستی‌یەکانی زماندا قوڵتر دەبوونەوە و لێکۆڵینەوەی خۆیان گەیاندە ئاخاوتنی تاکە تاکەی ئادەمیزاد. سەرکەوتنی زانستی نوێی دەروونناسی ڕێگەی بۆ ئەو هەوڵە خۆش کرد، لێکۆڵینەوە بگەیەنێتە تاکە تاکەی خەڵك. پێگەیشتنی ئەم بیروڕایە گەیشتە ئەو سنوورەی نکۆڵی ئەوە بکا کە زمان سەرمایەی کۆمەڵ بێ.

ئا. ئا. شاخمەتۆڤ وای بۆچووە، کە "لە ژیانی ڕاستەقینەدا هەر تاکایەتی‌یێك خاوەنی زمانە: زمانی گوند، زمانی شار، زمانی ناوچە..."[٢٤].

---

[٢٤] ئا. ئا. شاخمەتۆڤ، لەبارەی زمانی ئەدەبیی ڕووسی ئەمڕۆوە، چاپی چوارەم، مۆسکۆ ١٩٤١، ل ٥٩. وەنەبێ هەر شاخمەتۆڤ لەسەر ئەم ڕایە بووبێ، بەڕێنە بڕوانە: ئی. ئا. بۆدوئێن دێ کورتەنێ، زمان و زمانان، فەرهەنگی ئەنسکلۆپیدی بڕۆکگاوز و ئێفرۆن، ب٨١، ل٥٣١؛ بۆدوئێن کورتەنێ، کارە هەڵبژاردەکانی لەبارەی زمانناسی‌یەوە، مۆسکۆ ١٩٦٣، ب ٢؛ ڤ. پیزانی، ئێتیمۆلۆژی، مۆسکۆ، ١٩٥٦، ل٤٣؛ ج. بۆنفانتێ، "باری زمانناسیی نوێ"؛ ڤ. ئا.

لایەنگیرانی ئەو جۆرە بیروڕایە ، بەپێی ئەو پەندە ڕووسی یەیە "لە پشت درەختەوەدارستان نابینن" . لەم بارەیەوە ڤ . گومبۆلدت (١٧٦٧- ١٨٣٥) نووسیویە : "... لە واقیعدا زمان هەمیشە تەنها لە کۆمەڵدا گەشە دەکا و مرۆ لە خۆی دەگا ، چونکە مادام تەجروبە چەسپاندوویەتی ، کە هەروەها کەسانی تر لە وشەکانی تێدەگەن"[٢٥].

ئەم بیرە بە شێوەیێکی تیژتر لە لایەن (ك . مارکس)ەوە بەم شێوەیە وتراوە : "زمان چۆن تەجروبە و هەبوونە بۆ خەڵکی تریش ، هەروەها ئەو هەبوونەشە بۆ من"[٢٦] و ئەگەر زمان هەمیشە موڵکی کۆمەڵ بێ ، ئەوە ناتوانێ ببێتە کۆکراوەیێکی میکانیکیی زمانی تاکایەتی .

ڕاستتر وایە ، ئاخاوتنی هەر قسەکەرێك وەك دەرکەوتنی ئەو زمانە لە بارودۆخی ئەم یاخود ئەو ژیانەدا تەماشا بکرێ . بەڵام تایبەتێتی تاکایەتی لە ئاخاوتنی هەر مرۆیەکدا شتێکی بێ دەمەتەقەیە.

بەم جۆرە کێشەیێکی زۆر گرنگ دێتە ناوانەوە : زمان و ئاخاوتن . ئەو دوو مەفهوومە زۆر جار تێکەڵ دەکرێن ، ئەگەرچی بە تەواوی ئاشکرایە ، کە بە وێنە فیزیۆلۆژی و دەروونناسی کاریان تەنیا لەگەڵ

---

ژڤێگینتسیڤ ، مێژووی زمانناسیی سەدەکانی ١٩-٢٠ ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤ ب١ ، ل٣٢٥ ...

[٢٥] ڤ . گومبۆلدت ، دەربارەی جیاوازیی پێکهاتنی زمانەکانی ئادەمیزاد و کاری لەسەر پێشکەوتنی ڕەگەزی ئادەمیزاد ، بڕوانە : ڤ . ژڤێگینتسیڤ ، مێژووی زمانناسیی سەدەکانی ١٩-٢٠ ، چاپی سێیەم ، مۆسکۆ ، ١٩٦٤، ب١ ، ل ٩٧.

[٢٦] ك . مارکس و ف . ئێنگلس ، بەرهەمەکانیان ، چاپی دووەم ، ب٣ ، ئایدۆلۆژیی ئەڵەمانی، ل٢٩ .

ئاخـــاوتندا هەیـــە ، لـــە پـــەروەردەدا دەشـــێ باســـی گەشـــەکردن و دەوڵەمەندبوونی ئاخاوتنی قوتابیان بکرێ . لە پزیشکی‌دا دەشێ باسی کەموکورتی و گیروگرفتی ئاخاوتن بکرێ .. هتد . لـە هـەموو ئـەو حاڵەتانەدا ناشێ "زمان" لەجێی "ئاخاوتن" دابنرێ ، چونکە مەبەست پرۆتسێسی دەروونی و فیزیۆلۆژی‌یە .

لەسەر زەمینەی زمانناسیی ڕووتدا جیاکردنەوەی زمان و ئاخاوتن زۆر گرانترە .

ڤ . گومبۆلدت نووسیویە : "زمان وەك کۆکراوەی گشت بەرهەمی ئاخاوتن لەگەڵ ئاخاوتنی زاری میللەت یەك شت نین"[٢٧].

ئـەم هەڵوێســتەی گومبۆلــدت لەلایــەن ف . دێ سۆسســیورەوە (١٨٥٧-١٩١٧) گەشەی پێدراوە و لە کتێبی "زمانناسیی گشتی"دا فەسڵێکی تەواوی گرتۆتەوە .

هەڵوێستە بنەڕەتی‌یەکانی سۆسسیور لەو بەندانەدا کۆدەبنەوە :

"لێکۆڵینەوەی چالاکیی زمان دەبێ بە دوو بەشەوە : یەکێکیان سەرەکی‌یە و ماددەی خۆی هەیە ، کە زمانە - واتە شتێکە لە بووندا کۆمەڵایەتی‌یە و بە تاکایەتی‌یەوە بەند نی‌یە ... ئەوی تریان - لە پلەی دووەمدا دێت و ڕووی چالاکیی ماددەی ئاخاوتنی تاکایەتی‌یە ، واتە -

---

[٢٧] ڤ . گومبۆلدت ، لەبارەی جیاوازیی ئۆرگانی زمانی مرۆڤەوە و سەبارەت بە کاری ئەو جیاوازی‌یە لەسەر پێشکەوتنی ئەقڵی ڕەگەزی ئادەمیزاد (پ . س . بیلیارسکی کردوویە بە ڕووسی) ، سانپیتربورگ ، ١٨٥٩.

ئاخاوتن ، وتراو دەگرێتە خۆ"[٢٨] . دواتر "ئەو دوو ماددەیە توند پێکەوە بەندن و بەیەکەوە وا نیشان دەدەن : زمان پێویستە ، تاکو لە ئاخاوتن تێبگەین بۆ ئەوەی گشت چالاکییەکانی خۆی بنوێنێ . ئاخاوتنیش لە ڕیزی خۆیدا پێویستە بۆ ئەوەی زمان پتەو ببێ . ڕاستیی مێژووی ئاخاوتن هەمیشە پێش زمان دەکەوێ"[٢٩] .

بە پێی بۆچوونی سۆسسیور لێکۆڵینەوەی چالاکیی زمان دەبێ بە دوو بەشەوە : ١- "یەکێکیان سەرەکییە و ماددەی خۆی هەیە ، کە زمانە ، واتە - شتێکە لە بووندا کۆمەڵایەتییە و بە تاکایەتییەوە بەند نییە ..."[٣٠] ، ٢- "ئەوەی تریان - لە پلەی دووەمدا دێت و ڕووی چالاکیی ماددەی ئاخاوتنی تاکایەتییە ، واتە - ئاخاوتن ، وتراو دەگرێتەوە"[٣١] .

بەم جۆرە بەلای سۆسسیورەوە سێ مەفهووم هەیە : چالاکیی ئاخاوتن (langage) و زمان (langue) و ئاخاوتن (parole) .

سۆسسیور کەمتر ڕوون چالاکیی ئاخاوتنی دیاری کردووە : "چالاکیی ئاخاوتن خاوەنی خاسیەتی هەمەڕەگەزە"[٣٢] . "بە باوەڕی ئێمە مەفهوومی زمان (langue) لەگەڵ مەفهوومی چالاکیی ئاخاوتن

---

[٢٨] ف . دێ . سۆسسیور ، زمانناسیی گشتی ، (ئا . م . سوخۆتینا کردوویە بە ڕووسی) ، ١٩٣٣، ل٤٢ .

[٢٩] هەمان سەرچاوە .

[٣٠] هەمان سەرچاوە .

[٣١] هەمان سەرچاوە ، ل٣١ .

[٣٢] هەمان سەرچاوە .

(language) بەگشتی یەك ناگرنەوە . زمان تەنیا بەشێکی دیاریکراوە، بەڵێ بەشی هەرە گرنگ و چالاکی ئاخاوتنە"[٣٣].

"ئاخاوتن"یش لە ڕێی پێوەندی‌یەوە لەگەڵ زمان دیاری دەکرێ ، بەلاَم دیارتر : "... ئاخاوتن بریتی‌یە لە کاری سەربەخۆی خواز و تێگەیشتن ، کەوا پێویستی بە جیاکردنەوەیە :

١ - ئاوێتەیێك بە یاریدەی ئەوەی کەوا قسەکەری کارا کەڵك لە یاسای زمان وەردەگرێ بەو مەبەستەی بیری خۆی دەربڕێ .

٢ - ئامێرایەتی دەروونی و بەدەنی بەپێشکەوتنی بابەتەکی‌یەتی ئەو ئاوێتەیە"[٣٤] . لە دابەشکردنی زمان و ئاخاوتندا ، ئەوەش جیادەکەینەوە :

ا - کۆمەلاَیەتی لە تاکایەتی .

ب - کرۆکی و بنەڕەتی لە لاوەکی یان ڕێکەوت .[٣٥]

ئەو دیاردەیە "هەمیشە تاکە و بە تەواوی تاکایەتی حوکم دەکا تێیدا ، ئێمە ناوی دەنێین ئاخاوتن (parole) "[٣٦]. بەلاَم لەم دیاریکراوانەدا شتێکی زۆر نەساز ونە : یان تەنیا "ئاخاوتن" تاکایەتی‌یە ، لاوەکی‌یە تەنانەت ڕێکەوتیشە و تەنیا یان ئەو "ئاوێتەیە

---

(٣٣) هەمان سەرچاوە .

(٣٤) هەمان سەرچاوە .

(٣٥) هەمان سەرچاوە ، ل٢٨ .

(٣٦) هەمان سەرچاوە .

کە بەیاریدەی ئەوەی کەوا قسەکەری کارا کەڵك لە یاسای زمان وەردەگریٚ" ، کە بە هیچ جۆرێك ناشیٚ لاوەکی بێت و بە تایبەتی هەر ناشیٚ ڕێکەوت بیٚ و تەنانەت ناتوانیٚ تاکایەتیش بیٚ .

کارڵ بیولێری دەروونناس و زمانناسی نەمساوی و بە دوایدا ن . س . ترووبێتسکی لەم مەیدانەدا دوو مەفهوومیان جیاکردووەتەوە : کاری ئاخاوتن (Sprechakt) و پێکهاتنی زمان (Sprachgebilde)[٣٧] .
ئەگەر بشیٚ زاراوەی (Sprachgebilde) لەگەڵ زاراوەی (زمان) (langue)ی سۆسسیوردا یەك بگرنەوە ، ئەگەرچی سۆسسیور خۆی پەنجەی بۆ زاراوەیێکی تری ئەڵمانی هاوواتا درێژکردووە : (Sprache) – "زمان" ، ئەوە زاراوەی کاری ئاخاوتن (Sprechakt) لەلای سۆسسیور لەگەڵ هیچدا یەك ناگرنەوە .

هەرچی بۆ زاراوەی ("ئاخاوتن" – Parole)ە زاراوەی ( Rede – "ئاخاوتن" )ی ئەڵمانی داناوە .

سۆسسیور لەنێو ئەو مەفهوومانەدا ، مەفهوومی "زمان"ی باشتر و تەواوتر دیاری کردووە : "زمان سامانێکی تەجروبەی ئاخاوتنە لە هەموو ئەوانەوە کۆبۆتەوە کە سەر بە کۆمەڵی کۆمەڵگایەکن"[٣٨]؛ "زمان سیستەمی نیشانەیە ، کە یەکێتی کرۆك و بنەڕەت تێیدا بریتییە لە

(37) K. Buhler , Sprachtheorie, Iena, 1934; N. Trubetzkoy, Grundzuge der Phonologie , “Travaux du Cercle Linguistique de Prague” , 1938. No.7

(٣٨) سەرچاوەی ناوبراو ، سۆسسیور ، ل٣٨.

یەکگرتنی واتا و شێوەی بیستن . ئەم دوو ماکەی نیشانە وەك یەك هۆشەکین"[٣٩] .

لە ئەنجامی هەندێ لەو بیروڕایانەی سەرەوەدا دەتوانین چ ئەنجامێك هەڵهێنجین :

١ - سۆسسیۆر لەوەدا ڕاستە ، کە پێویستە زمان وەك دیاردەی کۆمەڵایەتی سامانی کۆمەڵ جیابکرێتەوە و ئەو دیاردانە بە چالاکیی زمانەوە بەندن .

٢ - سۆسسیۆر لەوەشدا ڕاستە ، کە دیاری دەکا ، بەر لە هەر شت بە سیستەمی نیشانەی دادەنێ ، چونکە بە بێ سیستەمی نیشانە پێوەندی و لەیەکترگەیشتنی ئادەمیزاد پێك نایەت ، کە ی . پ . پاڤلۆڤ بە دیاردەی دووەمی سیستەمی ئیشارەتی ناوبردووە .

٣ - سۆسسیۆر لەوەدا ڕاست نییە ، کەوا دادەنێ ئەم دیاردەیەی کۆمەڵ ، واتە . زمان هۆشەکییە ، ئەگەرچی دیاردەی زمان لەگەڵ دیاردەکانی هونەر و داب و نەریت و تەکنیك بە هۆشی ئادەمیزاددا تێدەپەڕن ، بەڵام وشەکان ، دەستووری گۆڕان و گەردان ، شیعر و ڕۆمان ، سیمفۆنیا و گۆرانی، وێنە و نەخشە وەك کەوچك و کورسی و زین و ئەشکەوت و منارە و کۆشك و تیروکەوان نموونە و ڕاستیی هۆش نین . بۆ زمان بەگشتی و بۆ نیشانەی زمان بە تایبەتی مادییەتیان پێویستە (دەنگ و پیت و پێکهاتنیان) .

---

[٣٩] هەمان سەرچاوە ، ل٣٩ .

٤ - ئەو لەوەشدا ڕاست نییە ، کە واتای کاری ئاخاوتن و ئاخاوتن وەك سیستەمی نیشانەی تەجروبەی پێوەندی و لە یەکترگەیشتن بە هۆی زمانەوەی بە یەکەوە بەستووە .

٥ - سۆسسیۆر هەروەها ڕاست نییە ، کە مەفهوومی ئاخاوتن و کاری ئاخاوتنی جیانەکردۆتەوە ، ئەویش لەبەر ئەوەیە ، کە مەفهوومی چالاکیی زمانی باش لێك نەداوەتەوە .

٦ - سۆسسیۆر ئەگەرچی ئەو چەند هەڵەیەی کردووە ، بەڵام دەبێ ئەوەش لەبیر نەکەین ، ئەوەی ئەو لە بارەی زمان و ئاخاوتنەوە وتوویەتی دەوری ڕابەرێکی بینیوە بۆ ساغکردنەوەی کێشە هەرە گرنگەکانی ئەو مەیدانە لە ماوەی چەندین ساڵدا .

لە ئەنجامدا دەڵێین :

١ - زمان پێویستە بە مەفهومی سەرەکی دابنرێ . لە ڕاستیدا ئەمە گرنگترین ئامێری پێوەندی و لە یەکترگەیشتنی ئادەمیزادە . زمان موڵکی کۆمەڵە و بابەتی مێژووە . زمان دیالێکت و بەشە دیالێکتە هەمەچەشنەکان ، ئاخاوتنی چینە جیاوازەکان و خاوەن پیشە جۆربەجۆرەکان ، ئاخاوتنی زارەکی و شێوەی نووسین ... پێکەوە دەبەستێ . زمانی تاکایەتی نییە ، زمان ناتوانێ موڵکی تاك بێ ، چونکە زمان تاکەکان و گرووپە هەمەجۆرەکان یەکدەخا ، کەوا دەتوانن زمانی گشتی بە شێوەی جیاواز بەکاربێنن لە بواری هەڵبژاردنی وشە و پێکهاتنی ڕێزمانی و تەنانەت لە تەلەفوز کردنیشدا . بۆیە چ ئەمڕۆ و چ لە مێژوودا بوونی زمانی وەها : ڕووسی ، ئینگلیزی ، فەرەنسی ،

چینی ، عەرەبی ... هتد شتێکی واقیعە و دەشێ باسی زمانی ئەمڕۆی ڕووسی یان ڕووسیی کۆن یان سلاڤیانیی گشتی بکرێ .

٢ – کاری ئاخاوتن تاکایەتی‌یە و هەر جارە بەکارهێنانێکی نوێی زمان وەك ئامێری لەیەکترگەیشتنی تاکی جۆربەجۆر . کاری ئاخاوتن پێویستە و دەبێ دوو لایەن بێ : گوتراو و بیستراو ، کە یەکێتی‌یێکی نەپچڕاو پێك‌دێنن و مەرجی لەیەکترگەیشتنی تێدایە . کاری ئاخاوتن بەر لە هەرشت پرۆتسێسێکە ، کە زانایانی فیزیۆلۆژی و بیستن و دەروون و زمان لێی دەکۆڵنەوە . کاری ئاخاوتن مەرج نی‌یە هەر ببیسترێ (لە قسەی بێژەیی‌دا) ، بەڵکو هەروەها دەشێ نوسراوبێ (لە نووسییندا) ، هەروەها لە حاڵەتی پێوەندیی بێژەیی ئاخاوتندا کە لەسەر شریت تۆمار کرابێ . کاری ئاخاوتن دەشێ بە پێی ڕای جۆربەجۆر و بەشێوازی زانستی هەمەچەشن لێی بکۆڵرێتەوە و باس بکرێ .

٣ – لە هەمووی گرانتر دیاری‌کردنی پێناسەی (ئاخاوتن)ە . بەر لە هەر شت ئەمە زمان نی‌یە و هەروەها کاری جیاوازی ئاخاوتن نی‌یە . ئێمە باسی ئاخاوتنی بێژەکی و ئاخاوتنی نووسین دەکەین و ئەمە بە تەواوی هاوسەنگن . ئێمە باسی ئاخاوتنی منداڵ و قوتابی، ئاخاوتنی لاوان ، ئاخاوتنی سەر شانۆ ، ئاخاوتنی نووسین ، ئاخاوتنی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ ، ئاخاوتنی کارگێڕی و هونەری ، ئاخاوتنی وتووێژ ... دەکەین .

هەموو ئەمانە بەکارهێنانی جیاوازی توانای زمانە ، بۆ ڕەنگدانەوەی ئەم یان ئەو مەبەست ، ئەمە فۆرمی جیاوازی بەکارهێنانی زمانە لە هەلو مەرجی جیاوازی پێوەندی و لەیەکترگەیشتندا . هەموو ئەمەش بریتی‌یە لە بابەت و کەرەستەی زمانناسی .

* * *

-٥-

## زمان و ڕێگەی دی لە یەکترگەیشتن و پێوەندی‌بەستن

مەبەستی لە یەکترگەیشتن یاخود پێوەندی‌بەستن ڕاگەیاندنی هەواڵێکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی . لە یەکترگەیشتن لە ئەنجامی چالاکیی پێوەندی بەستنی دوو کەس یان پتر ساز دەبێ ، بەپێی بارودۆخێکی دیاری‌کراو و بوونی ئامێری گشتیی لەیەکترحاڵی‌بوون .

زمان گرنگترین ئامێر و وەسیلەی لەیەکترگەیشتن و پێوەندی بەستنی ئادەمیزادە . دانانی زمان بە ئامێری لەیەکترگەیشتن بە (ئەرکی پێوەندی بەستن) ناسراوە . خەڵکی کە بیروڕای خۆیان دەگۆڕنەوە ، هەست و نەستیان بۆ یەکتر دەردەبڕن ، سکاڵای دڵیان بۆ یەك دەکەن ... بە هۆی لەیەکترگەیشتنەوە کاردەکەنە سەر یەك . زمان توانای لەیەکترگەیشتن بۆ مرۆڤ دەڕەخسێنێ و کاری کۆمەکی و هەرەوەزی لەسەرجەمی بواری چالاکیی مرۆڤدا ڕێکدەخا . زمان هەمیشە یەکێك

بووە لەو هێزانەی بوون و پێشکەوتنی کۆمەڵی ڕاگرتووە و هەتا هەتایشە هەروا دەمێنێ .

ئەرکی پێوەندی بەستن ، ئەرکی بنەڕەتیی کۆمەڵایەتیی زمانە . لە ئەنجامی پێشکەوتنی زماندا ، زمان (ئەرکی دەربڕین) و (ئەرکی کەڵەکەبوون)ی بۆ پەیدابووە .

ئەرکی دەربڕینی زمان بریتی‌یە لە توانستی ڕاگەیاندنی هەواڵێك بە گوێگر و کارتێ‌کردنی . ئەرکی دەربڕین وەك یەکێتی دەربڕین و ڕاگەیاندنی هەوڵێك و هەست و بزواندن و جۆشدانی دەروون تەماشا دەکرێ .

زمان تەنیا ئامێری لەیەکترگەیشتنی تاکە تاکەی خەڵك نی‌یە ، بەڵکو هەروەها ئامێری لەیەکترگەیشتنی سەرپاکی هاوولاتیانە و ئامێری پاراستنی تەجروبە و تاقی‌کردنەوە و زانیاریی کەڵەکەبووە بۆ نەوەکانی دواڕۆژ . ئەم ئەرکەی زمان ، کە ڕەنگدانەوەی زانیاریی و پاراستنێتی بە ئەرکی کەڵەکەبوونی زمان ناودەبرێ .

زمان وەك گرنگترین ئامێری لەیەکترگەیشتن و پەیوەندی بەستن بە هۆی نەرم و نیانی دانەکانی و سنوور فراوانی و خێرا گۆڕانی سیستەم و حاڵەتی‌یەوە ئەرکی کۆمەڵایەتیی خۆی بەجێ‌دێنێ .

لە دەربڕین و گەیاندنی هەواڵدا دانەی جۆربەجۆری زمان بە شێوەی جیاواز بەشداری لە بەجێ‌هێنانی ئەرکی کۆمەڵایەتیی زماندا دەکەن - لە کاری گەیاندنی هەواڵدا دانەی (ڕستە و وشەی) ناوی و گوزارەیی ڕاستەوخۆ بەکاردێنرێ . دانەی ناوی تەنیا تاکە تاکەی

وشەی گرنگ و ناسراوی وەك (خانوو ، ڕۆیشتن ، پێنج ، باش ، خێرا) ناگرێتەوە ، بەڵکو دەستەواژەی ناوی و ئیدیۆمیش (چیای پیرەمەگروون ، لە کانگای دڵەوە ...) دەگرێتەوە . هەرچی دانەی گوزارەییشە ، بریتی‌یە لە ڕستەی هەمەچەشن .

وێڕای دانەی پێوەندی بەستن ، زمان خاوەنی دانەی پێکهاتنیشە، کە بۆ ڕۆنانی دانەی ناوێی و دانەی گوزارەیی پێویستە . ئەم جۆرە دانانەی زمان بریتین لە فۆنێم و مۆرفێم ، فۆرمی وشە و جۆرەکانی وشەڕۆنان ، وشەگۆڕی و ڕێکخستنی ڕستە .

کەرەستەی زمان و دانە و جۆرەکانی، بەلای سیستەمی زمان و بیر و مرۆوە ، بۆ قسەکەر و گوێگر و خوێنەر سێ ڕووی پێوەندییان هەیە . دانەکانی زمان لە ڕووی مایەکیەتی (المادیە) و نموونایەتی (المثالیة)یەوە ، فۆرم و ناوەڕۆکەوە لە یەك جیادەکرێنەوە و سەرنجڕاکێشیش ئەوەیە ، لەم لایەنانەی زمان و پێوەندیی لایەنی جیاوازیان ، جیاوازە .

گشت دانەکانی زمان ، وەك هەموو دانەکانی نیشانە خاوەنی ڕووی مایەکێتین . ئەو دانانە پێویستە لە ڕێگای ئەندامەکانی هەستەوە، بەر لە هەرشت بیستن و بینینەوە وەربگیرێن . توانستی وەرگرتنی دانەکانی زمان بە (ئەرکی وەرگرتن) ناسراوە . دانەکانی زمان بۆ یاریدەی گەیاندنی واتا و دیاریکردنی سنووری شتێکی نموونایەتی و مایەکێتی لە کاردان . توانستی دانەکانی زمان لە گەیاندنی واتا و جیاکردنەوەدا (ئەرکی واتاگەیاندن)ی پێدەوترێ .

ڕووی مایەکێتی دانەکانی زمان فۆنێم و مۆرفێم و هەروەها جۆری یەکگرتنیان پێکدێنێ . فۆنێم و مۆرفێم بچووکترین دانەی زمانن و خاوەنی ئەرکی جۆربەجۆرن . بۆ نموونە ، وشەکانی : (بار) و (پار) ؛ (هار) و (هەر) ، (ماڵ)و (مار) یەك فۆنێم جیایان دەکاتەوە وهیچ فۆنێمێکیشیان مۆرفێم نییە . وشەکانی (دابوون) و (ڕابوون) و (هەڵبوون) مۆرفێمی پێشگر لە یەکتریان جیادەکاتەوە ، وشەکانی (زەردی) و (زەردێنە) و (زەرد)یش مۆرفێمی پاشگر دەیان گۆڕێ .

بەپێی ئەو کەرەستەیەی بۆ پێکهێنانی لەیەکترگەیشتن و پێوەندیبەستن کەڵکی لێ وەردەگیرێ ، زمان دەتوانێ دەنگی و نووسینی بێ. بێگومان دەنگی فۆرمی سەرەکیی زمانە ، چونکە وەك دەزانین زمان هەیە هێشتا خاوەنی نووسین نییە . وەك ئاشکراشە ، ئەرکی نووسین مایەکێتی تەواو بە زمان دەدا .

ڕێگەی دی لەیەکترگەیشتن و پێوەندیبەستن (ڕێگەی دەنگی) و (ڕێگەی نووسین)ە . بە وێنە لە تەك ئاخاوتنی عادەتیدا ، ئیشارەتی دەنگیی جۆربەجۆر بەکاردەهێنرێ ، وەك : زەنگ ، هۆڕن ... هەروەها تەکنیکی هەمەڕەنگی هاوچەرخ ، وەك : تەلەفوون، ڤیدیۆ تەلەفزیۆن ، ڕادیۆ، تۆمارکردنی دەنگ .... ئامێری لەیەکترگەیشتن و پێوەندیبەستنن .

وەسیلەیێکی دی لەیەکترگەیشتن ، کە ڕێگەی نووسینە پتر هەمەڕەنگە . هەموو جۆرەکانی نووسین خاوەنی خاسیەتی گۆڕینی فۆرمی دەنگەکانی زمانە بۆ وێنەیێکی بەرچاو . لەنێو فۆرمی نووسینی

زماندا ، وێڕای فۆرمی بنەڕەتی ، کە ئەلفوبێی گشتیی میللەتێکە ، پێویستە هەندێ جۆری دی جیابکرێتەوە :

١ - زمانی یاریدەدەر :

ئەلفوبێی دەستی (daktylos) و پیتی (برایل)[٤٠] بۆ ئەوە سازکران تا لە کەڵك وەرگرتنی زماندا یاریدەدەری کەسانی کەڕ و بێچاویان پێ بدرێ . ئەلفوبێی دەستی لەسەر بناغەی وێنەکردنی دەنگ بە یارمەتیی پەنجە دامەزراوە . لەگەڵ نیشانەکانی پەنجەدا ئیشارەتیش هەیە ، کە یاریدەی جیاکردنەوەی هاوجووتی و هاوشانیی دەنگ دەدا . بۆ نموونە ، دەست لەسەر سنگ دانان نیشانەی دەنگی ئاوازەدارە ، دەست لەسەر سنگ لابردن نیشانەی دەنگی کپە ، ئەو نووسینەی لوون برایل بۆ کوێرانی داناوە ، پیتەکانی بە یاریدەی شەش خاڵ پێکهاتووە .

٢ - سیستەمی نیشانەی تایبەتمەندی :

بۆ نموونە ، ئەلفوبێی بروسکە و لاسلکی (بە تایبەتی پیتەکانی

[٤٠] لوون برایل ، پاریس (١٨٠٩-١٨٥٢) . مامۆستایێکی گەورەی فێرکەری کوێران بوو . خۆی لە تەمەنی سێ ساڵیدا کوێربووە . ساڵی ١٨٢٩ پیتی بۆ کوێران سازکردووە ، کە تا ئەمڕۆش لە گشت جیهاندا بەکاردێنرێ . یەکەم کتێب ، کە بە سیستەمی برایل چاپ کرابێ "مێژووی فەرەنسا" (١٨٢٧)یە . لە ڕووسیاش ساڵی ١٨٨٥ بەم پیتانە دەست کرا بە چاپکردنی کتێب (وەرگێڕ) .

مۆرزی[١] ، نیشانەکانی هاتوچۆ ، نیشانەکانی سەر ئالاّ و فرۆکە و ڕۆکێت ...

٣ - ئیشارەتە زانستی‌یەکان :

وەك : بیرکاری و کیمیا و فیزیا و ژیربێژی ... لە زانستی هاوچەرخدا نیشانەکانی بیرکاریی ژیربێژی بەشێوەیێکی فراوان بەکاردێنرێن . وا هەندێ نیشانە و واتاکانیان دەخەینە پێش چاو :

R - پێوەندی : x – xRY پێوەندی بە Y یەوە هەیە .

⊂ - سەر بە : A ⊂B A سەر بە B یە.

≠ - یەکسان نەبون : A ≠ B ,A یەکسانی B نی‌یە .

ئەگەرچی سەرپاکی ئەو سیستەمی نیشانانەی ناومان بردن ، وەك ڕێگەی جۆر بەجۆر بۆ لەیەکترگەیشتن و پێوەندی بەستن کەڵکیان لێ وەردەگیرێ ، بەلاّم زمان هەموو شت دەگرێتە خۆ و هی هەموو کەسە و لە بەردەوامیی هەزاران ساڵدا گەشەی کردووە و پێگەیوە و وەسیلەی سەرەکیی لەیەکتر گەیشتن و پێوەندی بەستنی سەرجەمی چالاکی‌یەکانی کۆمەڵە . هەرچی زمانی یاریدەدەر و سیستەمی نیشانەی تایبەتمەند و ئیشارەتە زانستی‌یەکانن خاوەنی ئەو خاسیەتانە نین . بواری بەکارهێنانی نیشانەی دەستکردی سیستەمی زمان تەسکە و ئەمەش لە نرخی کۆمەڵایەتی‌یان کەم ناکاتەوە . ئەمرۆ کە سەدەی شۆڕشی تەکنیکە ، دەوری زانستی سروشتناسی و بیرکاری

---

[١] سامۆئیل مۆرزێ (١٧٩١– ١٨٧٢) . هونەرمەندێکی ئەمەریکای‌یە لە مەیدانی دۆزینەوەی تەلەگرافدا دەوری گەورەی هەبووە (وەرگێڕ) .

بەرزبووەتەوە و نیشانەکانی بیرکاری بڵاوبووەتەوە . بەڵام لەگەڵ هەموو ئەوەشدا بواری بەکارهێنانی سیستەمی نیشانە سنووردارە .

## سەرمتايىنكەى زماناسى

Дорожные знаки

بيشانەكالى هاتوچۇ


Железнодорожный переезд без шлагбаума


Пересечение со второстепенной дорогой


Пересечение с главной дорогой


а


б

Опасный поворот


Сужение дороги


Пешеходный переход


Дети


Ремонтные работы


Прочие опасности


Въезд запрещен


Движение запрещено


Велосипедное движение запрещено


Пешеходное движение запрещено



Проезд без остановки запрещен


Поворот налево запрещен


Поворот направо запрещен


Подача звукового сигнала запрещена


Стоянка запрещена


Преимущество в движении встречных транспортных средств


Конец запрещения обгона


Конец запрещения обгона грузовым автомобилям


Обязательное направление движения


Движение легковых автомобилей


Велосипедная дорожка


Дорожка для пешеходов



Конец ограничения максимальной скорости


Скоростная дорога


Конец скоростной дороги



Населенный пункт



Конец населенного пункта


Преимущество в движении перед встречными транспортными средствами


Направление движения по полосам


а


б

Место разворота



Место стоянки



Автозаправочная станция


Пункт медицинской помощи


Полоса движения



Направление объезда


Знак Берегись поезда



Стоп

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| А | Б | В | Г | Д | Е | Ж |
| З | И | Й | К | Л | М | Н |
| О | П | Р | С | Т | У | Ф |
| Х | Ц | Ч | Ш | Щ | Ъ | Ы |
| | Ь | Э | Ю | Я | | |

Ручная азбука

А Б В Г Д Е Ж З И Й К

Л М Н О П Р С Т У Ф Х

Ц Ч Ш Щ Ъ Ы Ь Э Ю Ё Я

# پەیدابوونی زمان

## فەسلی سێیەم

-١-

### یەکێتی پەیدابوونی زمان و فرەزمانیی ئادەمیزاد

پەیدابوونی ئاخاوتنی مرۆڤ کێشەیێکی یەکجار گرانە ، کەوا نەك تەنیا زمانناسی لێی دەکۆڵێتەوە ، بەڵکو زانستەکانی دی _ ئەنترۆپۆلۆژی و دەروونناسی و بایۆلۆژی و ئەتنۆگرافی _ یش خەریکیین . پەیدابوونی زمان پێوەندی بە پەیدابوونی هۆش و کۆمەڵەوە هەیە و ئەمەش کێشەیێکی فەلسەفی‌یە . گرانیی ساغکردنەوەی ئەم کێشەیە لەوەدایە ، کە سەرەتای ئاخاوتنی مرۆڤ و هۆی پەیدابوونی، دەتوانین تەنیا لەسەر بناغەی سەرچاوەی ناڕاستەوخۆ لێکبدەینەوە : زمانی خێڵە سەرەتایی‌یەکان ؛ ئاخاوتنی منداڵ ؛ نیشانەی دەنگیی مەیموونی لە مرۆچوو . جا هەموو ئەمانە ناتوانن ئاخاوتنی مرۆڤ لە واقیعی سەرەتایدا تەواو ڕوون بکەنەوە . بۆیە کێشەی پەیدابوونی ئاخاوتنی مرۆڤ لە سنووری بارودۆخ و هۆی سەرهەڵدانی‌دا تەماشا دەکەین و خاسیەتی توانستی ڕشتەی

ئاخاوتن و پێکهاتن و ئەرکی دانە هەرە دێرینەکانی زمان لێك دەدەینەوە .

پەیدابوونی زمانی ئادەمیزاد و پەیدابوونی زمانانی جیاواز و خێزانی زمانان (بەوێنە هیند و ئەوروپایی) شتی یەکجار جیاوازن و ئەگەرچی هەموو لە یەك پلە و ڕادەدا کێشەی گرنگن . پەیدابوونی زمانی ئادەمیزاد و زمانانی خزم و زمانانی جیاواز لە دەمی جیاواز و هەلومەرجی جیاوازدا ڕووی داوە و هۆی جیاوازی چەسپاو هێناونیيە کایەوە . لە سەرەتادا باسی پەیدابوونی زمان دەکەین و ئەوجا لە پەیدابوونی زمانانی خزم دەدوێین و لە کۆتاییشدا پەیدابوونی تاکە تاکەی زمانانی جیاواز ڕوون دەکەینەوە .

پەیدابوونی زمان بەشێکە لە کێشە ی پەیدابوونی ئادەمیزاد و کۆمەڵی ئادەمیزاد .

مرۆڤ لە ئەنجامی بارگۆڕین و پێشکەوتن و گەشەکردنی دووروودرێژی جیهانی بوونەوەردا پەیدابوو ، بەتایبەتی لە مەیموونی لە مرۆچووەوە . مەیموونی سەرەتایی (کە Proconsul _ شەمپازیی زووی پێ دەوترێ) نزیکەی ٢٥-٤٠ ملیۆن ساڵ لەمەوبەر لەسەر زەوی دەژیا . لویس لیکی زانای ئەنترۆپۆلۆژیی ئینگلیز و مێری خێزانی لە ناوچەی گۆمی ڤیکتۆریا (لە گینیا) بەردەنی (متحجر) پاشماوەی کەللەسەری گیانلەبەرێکی ١٤ ملیۆن ساڵی بەر لە ئەمڕۆیان دۆزیيەوە . ددانەکانی ژێر چاوی ئەم گیانلەبەرە کەمێك لە ددانەکانی تری درێژتر بوون (ئەم ددانانەی مەیموونی مرۆئاسایی زۆر لەوانی تری نزمترن) .

لە ئێسك و پروسکی ئەم گیانلەبەرەدا ئەوەش بەدیکراوە ، کە ژێر چاوی چاڵە (ئەم چاڵی‌یەی ژێر چاو تەنیا خاسیەتی مرۆڤە و تەنانەت لە مەیموونی مرۆئاسایی‌یشدا نی‌یە) . ئەم نیشانانە ڕێگەیان بە دوکتۆر لیکی دا وای لێکبداتەوە ، کە ئەو گیانلەبەرەی ١٤ملیۆن ساڵی بەر لە ئێستا ، دەبێ بەرەو بەئادەمیزادبوون گەشەی کردبێ ، ئەگەرچی لە ڕەسەندا مرۆڤ نەبووە . ئەو جۆرە گیانلەبەرانە هەر لە (australis pithekos – ئاوسترالۆپیتیك)ەوە تا( Pithecanthrope– مەردوومی جاوە) ماوەیێکی دوورودرێژ (نزیکەی ١٢ ملیۆن ساڵ) لە پێشکەوتن و گەشەکردندا بوون بۆ بارگۆڕین بەرەو بە ئادەمیزادبوون .

تەمەنی مرۆڤی هەرە زوو (جۆری Sinanthropos) نزیکەی دوو ملیۆن ساڵ دەبێت[1]. لەچاو مرۆڤی ئەمڕۆ (homo sapiens _ مرۆڤی هوشیار)دا ، کاسەی سەری سینانترۆپ مێشکی کەم تێدابوو ، بەلام لە تەنیشتی‌یەوە ئامێری بەردینی ساکاری لی‌بوو ، کە بە ئاشکرایی ئەوە نیشان دەدەن دەستکردی خۆی بوون و زانیوێتی بەکاریان بهێنێ .

پێشکەوتن و گەشەکردن بەرەو بە ئادەمیزادبوون و پێکهاتنی کۆمەڵ بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە :

١- قۆناغی یەکەم دەستەی پێشکەوتووی ئاوسترالۆپیتیکە ، کە لە بە چوار پەل ڕۆیشتنەوە کەوتە ئەوەی تەنیا لەسەر پێکانی بڕوا و

[1] ئەگەر ئەو دۆزینەوەیەی لە ئەفەریقا و ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە تەرمی قولەڕەش (زنجەنترۆپ)کراوە ، وەربگرین ، ئەوە تەمەنی دێرینترین مرۆڤ (homo habilis) دەکاتە دوو هەزار و پێنج سەد هەزار ساڵ .

وەك ئامێر کەڵك لە دار و بەرد و ئێسکی گیانلەبەران وەربگرێ . ئەمە درێژترین قۆناغە و دووریی لە ئێمەوە دەگەڕێتەوە بۆ ٢ - ٣ ملیۆن ساڵ .

٢ - قۆناغی دێرینترین و دێرینی مرۆڤ _ پەلیانترۆپ (پیتی کانترۆپ ، سینانترۆپ ، نیاندرتال) ، کە ئامێری باش و کۆخیان دروست دەکرد و بە کۆمەڵ ڕاوی گیانلەبەری گەورەیان دەکرد . دووریی ئەم قۆناغە لە ئێمەوە نزیکەی ملیۆنێك ساڵ دەبێت .

٣- قۆناغی مرۆڤی هاوچەرخی بەوزە . ئەم قۆناغە ٤٠-٥٠ هەزار ساڵێك لە ئێمەوە دوورە .

پتر لە ملیۆنێك ساڵ لەمەوبەر (لە دەوری بەرددا ، بەواتاییەکیدی لە پلەی هەرە نزمی کێوێتیدا)، کە ئەو جۆرە مرۆڤانە پەیدابوون ، پێویستیان بە ماوەییەکی زۆر بووە تاخاسیەتی بایۆلۆژی مرۆڤ و خاسیەتی کۆمەڵی ئادەمیزاد وەربگرن . ف . ئێنگلس پلەی هەرە نزمی کێوێتی بە منداڵیی ئادەمیزاد ناودەبا و باسی ئەو دەورەی بەم جۆرە کردووە : " مرۆڤ هێشتا لە شوێنی سەرەتای پەیدابوونیدا دەژیا ، واتە لەجەنگەڵ و دارستاندا . دیارە بەشێکی ژیانیشیان لەسەر دار و درەخت بردووەتە سەر و هەر ئەمەشە بووە بە هۆی پاراستن و مانەوەیان لەنێو گیاندارانی درندەی گەورەدا. خواردەمەنییان بەری درەخت و گوێز و ڕەگ بوو ، دەستکەوت و سەرکەوتنی ئەم دەورە پەیدابوونی ئاخاوتنی ڕەوانە . گشت ئەو میللەتانەی لە مێژووی

ئـەمڕودا ناسـراون ، هیـچ یـەکێکیان لـەو بارودۆخـە سـەرەتایی‌یەدا نەماون"[٢] .

ئاخـاوتنی ڕەوان یارمـەتیی ئـادەمیزادی دا لەجیـهانی گیـانداران جیاببێتـەوە و لە کۆمـەڵدا یـەك بگـرن و گەشـە بە بیر و هـۆش بـدا و بـە یەکەوە کار بکەن . لەگەڵ ئەوەشدا پـەیدابوونی زمان تـەنیا بـەگۆڕانی بایۆلۆژی‌یەوە بەند نی‌یە ، بەڵکو بە دروستبوونی کۆمەڵیشەوە بەندە .

مێـژووی ئـادەمیزاد بەسـەر دوو دەوردا دابـەش دەبـێ : پێـش مێـژوو و مێـژوو (دەوری دووەم ئـەو قۆناغـەی مێـژوو دەگرێتـەوە ، کـە کۆمـەڵی ئـادەمیزاد بەتـەواوی پێکـهاتبوو) . دەوری پێـش مێـژوو ، مێژووی قۆناغی سەرەتایی‌یە _ واتە دەوری سەرهەڵدان و گەلاڵەبوون و خۆگرتنی کۆمەڵی ئادەمیزادە .[٣]

ڕەوەی سەرەتایی مرۆڤ ، کۆمەڵایەتیی بایۆلۆژیی زیندەوەر بوو . لـەم پلەیـەدا ڕەنجدانـی عەفـەوی پێشـکەوت ، بـەڵام بەرهـەمی نـوێ و ئامێری کارکردنی نەهێنایـە ئەنجام ، بەڵـکو تـەنیا فێری بـەکارهێنانی ئەو شتانە بوو ، کە لـە سروشـتدا هـەبوون . ئەم جۆرە شتانەش بوونـە ئامێری بـەرگری لـەخۆکردن و ڕاو . ڕەنجـی عەفـەوی هەلومـەرجی بـۆ پەیدابوونی بیروهۆش و زمان پێکهێنا .

---

[٢] ف. ئێنگلس ، پەیدابوونی خێزان ، دارایی تایبەتی و دەوڵەت . _ ك . مارکس، ف . ئێنگلس ، کارە کۆکراوەکانیان ، چاپی دووەم ، ب ٢١ ، ل ٢٨ _ ٢٩ .

[٣] یو. ی . سیمیۆنۆڤ ، چۆن مرۆڤایەتی پەیدابوو ، مۆسکۆ ، ١٩٦٦ ، ل٢٨ _ ٢٩ .

لە ڕاستیدا چالاکیی ڕەنجی ئادەمیزاد لە کەوتنە بەرهەمهێنانی ئامێری ڕەنجدانەوە دەست پێدەکات . بەپێی دەربڕینی ب . فرانکینی زانا و سیاسی ئەمەریکایی ، مرۆڤیش بەوە لە مەیموونی مرۆ ئاسایی جیادەبێتەوە ، کە ئەو گیانلەبەرێکی ئامێر دروستکەرە – tool-taking animal) . پێویستیی هێنانە بەرهەمی ئامێری نوێ ، کەوا لە مێشکدا نەخشەی دروستکردنی بۆ دەکێشرێ ، چالاکیی هێنانە بەرهەمی پێ لەدایك دەبێ . هێزی بەرهەمهێنان و پێوەندیی بەرهەم تا دەهات پتر فشاریان بۆ پێوەندیی بایۆلۆژیی دەهێنا . قۆناغی یەکەم لەسەرخۆ گۆڕرا بە ڕێبازی خێڵەکی . بەم چەشنە مێژووی مێژووی کۆمەڵی ئادەمیزاد دەست پێدەکات . یەکەم شێوەی پێکهاتنی ئابووری ، کۆمەڵگای سەرەتایی بوو . لەم دەمەدا پرۆتسێسی پەیدابوونی زمانانی خزم دەستی پێکرد .

وەك دەبینین ، لەنێو ئەو بارودۆخەدا ، کە زمانی تێدا پەیدابوو ، هەندێ هۆ پێوەندییان بە گەشەکردنی ئەندامەکانی لەشی ئادەمیزادەوە هەیە و هەندێ هۆی دیش بە بوونی ڕەوەی سەرەتایی بە کۆمەڵ . بۆیە ئەو هەموو شتانەی دەربارەی پەیدابوونی زمان وتراوە ، دەکرێ بەسەر دوو دەستەی بنەڕەتیدا دابەش بکرێن : ١ – تیۆریی بایۆلۆژی ؛ ٢ – تیۆری کۆمەڵایەتی .



ئاوسترالۆپیتێك
Australis pithekos



مەردووی جاوە
(پیتیکانترۆپ)
Pithecanthrope



سینانترۆپ
Sinanthropos



نیاندارتال



مرۆڤی هۆشیار
Homo sapiens

_ ٢ _

## تیۆریی لاسایی‌کردنەوە و دەربڕینی پەژارە و خۆشی

تیۆریی بایۆلۆژی پەیدابوونی زمان وا ڕوون دەکاتەوە ، کە لە ئەنجامی پێشکەوتن و گەشەکردنی ئەندامانی لەشەوە – ئەندامانی هەست ، ئەندامەکانی ئاخاوتن و مێشکەوە - هاتبێتە دی . باشیی ئەم تیۆری‌یەیە لەوەدایە ، وەك ئەنجامی دوورودرێژی پێشکەوتنی سروشت دەڕوانێتە پەیدابوونی زمان و دژی ئەو ڕایە دەوەستێ، کەوا دادەنێ زمان یەکسەر پەیدا بووە و دیاریی خوایە بۆ ئادەمیزاد . لەنێو تیۆری‌یە بایۆلۆژی‌یەکاندا دوانیان پتر ناسراون : تیۆری لاسایی‌کردنەوە و تیۆریی دەربڕینی پەژارە و خۆشی .

تیۆریی لاسایی‌کردنەوە پەیدابوونی زمان بە پێشکەوتن و گەشەکردنی ئەندامەکانی بیستنەوە ، کە هەستکردنە بە دەنگی گیانلەبەران (بەتایبەتی گیانلەبەری ماڵی) . بەپێی ئەم تیۆری‌یە ، زمان وەك لاسایی‌کردنەوەی دەنگی گیانلەبەران (حیلەی ئەسپ و ماین . بۆڕەی گا ، باڕە و باعەی مەڕ و بزن) پەیدابووە ؛ یان دەربڕینی هەست و نەست بەرانبەر دەوروبەر . بۆ نموونە لیبینیس وای بۆچووە ، کە "mel"[٤] بەتام شیرین و ناوەکەی لەبە[illegible] [illegible] دەبێتە "leben _ ژیان" و " lieben _ خۆشویستن"یش نیشانی نەرمونیانی

---

[٤] وشەیێکی لاتینی‌یەواتای (هەنگوین)ە .

بەڵام "lauf_ ڕاکردن" و " löwe _ شێر" توند و ڕەقی ڕادەگەیەنن . لێبنیس و هێردێر و هومبۆڵدت لایەنگیرانی ئەم تیۆرییە بوون .

تیۆریی لاساییکردنەوەی دەنگ لەسەر بناغەی دوو شیمانە (الاحتمال) دامەزراوە : ١) دەستەی یەکەمی هی لاساییکردنەوەی دەنگن ؛ ٢) دەنگ لە وشەدا پێوارەتی (الرمزیە _ Symbolisn)یە و مانای بە سروشتی شتەوە بەندە .

بەڵام ئەم دوو شیمانەیە لەگەڵ هەڵکەوتی ڕووداوەکانی زماندا ناگونجێن . ڕاستە لە هەموو زمانێکدا وشە هەیە ڕەنگدانەوەی لاساییکردنەوەی دەنگ بێ ، بەڵام ئەو جۆرە وشانە زۆر کەمە و سەرەڕای ئەوەش لە زمانانی جیاوازدا جیاوازن و وەنەبێ لە زمانی سەرەتاییدا زۆرتر بێ وەك لە زمانی پێشکەوتوودا . تەنیا لە هەلومەرجێکدا دەکرێ ئەمە ڕوون بکرێتەوە ، کە ددان بەوەدا بنرێ ، وشەی لاساییکردنەوەی دەنگ ئەنجامی پێشکەوتنی زمان بێ .

وشەی لاساییکردنەوەی دەنگ کە لە زماندا جێگیر بووبێ ، خاوەنی دەنگ و فۆرمە . هەر لەبەر ئەوەشە بەلای ڕووسەوە دەنگی مراوی (کریا_کریا)یە و بەلای ئینگلیزەوە (کواك _ کواك)ە و بەلای فەرەنسایییەوە (کان _ کان)ە و بەلای دانیمارکییەوە (پان _ پان)ە و بەلای کوردەوە (قیپە _ قیپ)ە . بە هەمان چەشن ناوی ئەو گیانلەبەرانەش جیاوازن ، کە لە دەوروبەری مرۆڤن ، بەوێنە : مراوی ، قاز ، پشیلە ، سەگ ...

تیۆریی دەربڕینی پەژارە و خۆشی (یان تەکدانەوە _ الانعکاس _ Reflex) پەیدابوونی زمان بەو جۆشە دەروونی‌یانەوە دەبەستێ ، کەوا ئادەمیزاد هەستی پیْیان کردووە . بەپێی ئەم تیۆری‌یە ، دەستەی یەکەمی وشەکانی زمان قیژەی عەفەوی و دەربڕینی پەژارە و خۆشی و تەکدانەوەن . مرۆ کارتیْکردنی ئازار و شادی ، ترس و برسێتی دەربڕیوە . لە ئەنجامی پێشکەوتندا ، ناڵە و قیژە و هاوار ... لای گشت ئەندامانی کۆمەڵ واتای پێوارەتی‌یان وەرگرت . ستێینتال و داروین و پۆتێبنیا و کودریاڤسکی لایەنگیرانی تیۆریی تەکدانەوە بوون .

ئەگەر لە تیۆریی لاسایی‌کردنەوەی دەنگدا جیهانی دەرەوە (دەنگی گیانلەبەران) هێزی بزوێن بووبیْ ، ئەوە هێزی بزوێنی وشە جیهانی ناوەوە بوو _ واتە مرۆ خۆی هەستی گشتێتی لە نێوان هەردوو تیۆریدا بریتی‌یە لەوەی لەتەك زمانی دەنگیدا ، ددان بە بوونی زمانی ئیشارەتدا بنریْ ، کە ڕێکوپێکتر دەردەبڕرا .

بۆ نموونە ، وندت[*] وای داناوە ، لە سەرەتادا دوو زمان هەبووە : زمانی ئیشارەت (جووڵانەوەی دەست و دەم و چاو) و زمانی دەنگ (جووڵانەوەی زمان و لێو) . بە یاریدەی دەنگ هەست و نەست دەردەبڕاو بە یاریدەی ئیشاوەت شت دەناسێنرا . وندت سێ جۆر

---

(*) وندت (١٨٣٢_١٩٢٠) دەروونناس و فیزیۆلۆژ و فەیلەسووف و زمانناسی ئەڵەمانە . ساڵانی (١٨٦٤_١٨٧٤) لە هایدلبرگ پرۆفیسۆری فیزیۆلۆجی بووە . لە ساڵی (١٨٧٥)یشەوە لە لایبزك پرۆفیسۆری فەلسەفە بووە . ئەندامی کارای کۆڕی زانیاری بووە (وەرگێڕ) .

ئیشارەتی جیاکردووەتەوە : نیشاندان ( بۆ نموونە ، پەنجە بۆ ڕاکێشان) ؛ نواندن یان ڕوونکردنەوە (بەوێنە ، دەست ڕاوەشان) ؛ پێوار (الرمز) (وەك پەنجە لەسەر لێو دانان) . بە دەست و بە جوولانەوەی ماسوولکەکەکانی دەموچاو ، ڕێگادان و قەدەغەکردن ، فرمان و داخوازی ؛ هەڕەشە و خۆشی دەردەبڕرا .

لە بەردەوامیی پێشکەوتنی ئادەمیزاددا، زمانی دەنگی تا دەهات پتر ڕەوان دەبوو . هەرچی زمانی ئیشارەتیشە کەوتە ئەوەی پتر دەوری یاریدەدەری ببینێ . ئیشارەت لە دەنگ کەمتر لەبارە و لە شەو و لە تاریکی و لە پشت دار و درەختەوە دیار نییە و لە کاتێکیشدا کە دەست بە کارێکەوە بێ ، ئیشارەت سازنابێ . ئیشارەتەکانی دەنگ چ لەڕێی جیاکردنەوەی دەنگەوە و چ لەڕێی کۆکردنەوەی دەنگەوە توانییان پێش بکەون و پێبگەن . بۆیە وشە ئیشارەتی کوشت .

تیۆریی لاسایی‌کردنەوەی دەنگ و تیۆریی تەکدانەوە کە لە پەیدابوونی میکانیکی قسەکردن دەکۆڵنەوە ، بە شێوەیێکی سەرەکی لە ڕووی دەروونی و فیزیۆلۆژی‌یەوە تەماشای دەکەن . ئاوڕدانەوەی ئەم تیۆری‌یانە لە بەڵگەی کۆمەڵایەتی ، بووە بە هۆی گومان و دوودڵی لێیان : هەندێ بەگاڵتەوە تیۆریی لاسایی‌کردنەوەیان ناوناوە "تیۆریی وەو _ وەو" و بە تیۆریی تەکدانەوەش دەڵێن "تیۆریی تف _ تف" . لە ڕاستیدا لەم تیۆری‌یانەدا لایەنی کێشەی بایۆلۆژی زۆر گەورە کراوە و پەیدابوونی زمان بە تەواوی بە پەیدابوونی ئاخاوتنەوە بەستراوەتەوە .

بایەخی تەواو بەو ڕاستی‌یە نەدراوە ، کە پەیدابوونی مرۆڤ و کۆمەڵی مرۆڤایەتی جیاوازیی تەواوی لە گیانلەبەر و ڕەوەی گیانلەبەر هەیە .

## ـ٣ـ

## تیۆریی کۆمەڵایەتی

تیۆریی کۆمەڵایەتیی پەیدابوونی زمان ، پەیدابوونی زمان بە پێداویستی کۆمەڵەوە لێکدەداتەوە ، کە لە کار و ئەنجامی پێشکەوتنی بیر و هۆشی ئادەمیزاددا سەری‌هەڵداوە . دیۆدۆر سیتسیلییسکی نووسیویە : "قسەی مرۆڤی سەرەتایی ناڕێك و پچڕپچڕ بوو ؛ وەك گیانلەبەری کێوی دەژیا ؛ یەك یەك دەچوونە لەوەڕگە و گیای خۆش و بەری درەختیان دەخوارد . هێرش و شاڵاوی گیانلەبەرانی دڕندە بۆ سەریان ، فێری ئەوەی کردن یاریدەی یەکتر بدەن و لەترسا پاڵ بەیەکەوە بدەن . وردە وردە کەوتنە ئەوەی یەکتر بناسنەوە . دەنگیان هێشتا بێ‌واتا و پچڕپچڕ بوو ، بەڵام ئەو دەنگانە لەسەرخۆ بوونە وشەی واتادار . پێکەوە وەستانیان نیشانەی هەموو شتێك بوو و پێوەندی‌یانی ڕوونکردەوە"[٦].

---

[٦] تیۆریی کۆنی زمان و شێواز ، مۆسکۆ، ١٩٢٦، ل٣٢ .

لەم دەقەدا تیۆریی "پەیمانی کۆمەڵایەتی" خراوەتە پێش چاو : زمان وەك دەربڕینێکی هۆشەکی و بەهرەی ئادەمیزاد تەماشاکراوە . ئەم تیۆرییە لە سەدەی هەژدەیەمدا لەلایەن ژ . دیو . بێللی و ئێ . ب . دیو کۆندیلیاك و ئادەم سمیت و ژ . ژ . ڕۆسۆوە پشتگیری لێ کراوە . پەیمانی کۆمەڵایەتی لای ڕۆسۆ بەندە بە دابەشکردنی ژیانی مرۆڤایەتی بەسەر دوو دەوردا : سروشتییەت و شارستانییەت .

لە دەوری یەکەمدا مرۆڤ بەشێك بوو لە سروشت و زمانیش لە ویست و ئارەزوو و هەست وروژانەوە پەیدابوو . ڕۆسۆ نووسیویە : "زمانی یەکەم دەستەی ئادەمیزاد زمانی ئەندازە (هندسة) نەبووە ، وەك هەندێ کەس وا بیردەکەنەوە ، بەڵکو زمانی شاعیران بووە" ، چونکە "وروژانی هەست تەکانی بە دەربڕینی یەکەم دەنگ داوە" . دەنگ لە سەرەتادا لە خزمەتی ڕەمزی ئەو شتانەدا بووە ، کە کاریان لەسەر بیستن دەکرد . ئەو شتانەی بەچاو دەبینران ، بە ئیشارەت نیشاندەدران . بەڵام ئەمە شتێکی لەبار نەبوو ، بۆیە گۆڕییان بە دەنگ و ڕستە . زیادبوونی ژمارەی دەنگە دەربڕاوەکان بووە هۆی ڕێکوپێك بوونی ئەندامەکانی ئاخاوتن . "دەستەی یەکەمی زمان" لەبەر پێویستیی دەربڕینی "سامانی دەروونی" مرۆڤی سروشتی لە هاوواتاییدا دەوڵەمەند بوو . لەگەڵ پەیدابوونی دارایی تایبەتی (الملكيه الخاصه) و دەوڵەتدا ، پەیمانی کۆمەڵایەتی و گونجانی هەڵسوکەوتی خەڵکی لەگەڵی پەیدابوو و وشە لە بەکارهێنانیدا وای لێهات پتر مانای گشتی بدرێتی . زمان لە دەروونی دەوڵەمەند و

پرهەستەوە بووە شتێکی "وشك و هۆشەکی و شێوازی" . گەشەکردنی مێژوویی زمان وەك هەرەسهێنان و تێكشکان تەماشا دەکرێ .

بانگهێشتنی رۆسۆ "بۆ دواوە بەرەو سروشت" ، "بەرەو زمانی سەرەتایی سروشتی" ڕازی نەبوون بوو لە نارەوایی دەرەبەگایەتی . ڕاستە هۆشی زمان لەسەرخۆ رۆیشتووە ، بەڵام ئەو بیرکردنەوەیە دژی مێژووە ، کە وا ڕادەگەیەنێ ئەقڵ ئەو مرۆڤانەی بەرێوەبردووە ، کە بە بیر و هۆشەوە زمانیان داهێناوە . ڤ . گ . بیلینسکی نووسیویەتی : "مرۆڤ بەرلەوەی تێگەیشتبێ وشە دەزانێ ، وشەی زانیوە . بەهەمان چەشن منداڵ بە ڕاستی و بەپێی ڕێزمان دەدوێ ، بەر لەوەی ڕێزمان بزانێ" .

لە کۆتایی سالانی حەفتای سەدەی ڕابوردوودا (ل . نواریێ)ی فەیلەسووفی ئەڵمانی (تیۆریی کار) لە پەیدابوونی زماندا ، یان (تیۆریی هاواری زەحمەتکێشان "ی هێنایە ئاراوە . ك . بیوخێر لایەنگیریی ئەم تیۆرییەی کرد . ل . نواریێ ڕاست بۆ ئەوە چووە ، کە "لە سەرەتادا بیر و ئیش پێکەوە بەند بوون" . وەك دیارە ، بەر لەوەی ئادەمیزاد فێری دروستکردنی ئامێری کار ببێ ، لە بەردەوامیی ماوەیێکی دوورودرێژدا ئامێری جۆربەجۆری سروشتی لە کاروباری جیاوازدا تاقیکرووەتەوە .

لە بەیەکەوە کارکردندا هاوار و قیژە و چالاکیی زەحمەتکێشان ئاسان دەکاو ڕێك دەخا . کاتێ ژنان تەشی دەڕێسن و سەربازان هەنگاو دەنێن هەردوو لایان "حەزدەکەن کارەکەیان بە ئاوازێك بەرێ بکەن" .

ئەو هاوار و قیژەیە لە سەرەتادا عەفەوەی و بیٔئاگایانە بوو و وردە وردە گۆڕرا و بوو بە ڕەمزی پرۆتسێسی زەحمەتکێشان . لە پلەی یەکەمدا زمان بریتی بوو لە کۆمەڵیٔ ڕەگی کردار .

تیۆریی هاواری زەحمەتکێشان لە ڕاستیدا شێوەیێکی تیۆریی پەژارە و خۆشی‌یە . زەحمەتکێشان وەك هاوشانی زمانی دەنگی تەماشا دەکریٔ . کاری زەحمەتکێشان دەشیٔ بیٔهاوار و قیژە بکریٔ . بەپێی ئەم بۆچوونە کاری مۆسیقا و شیعر بە هاوشان و هاودەنگ دادەنرێن .

گ . گ . پلیخانۆڤ لە تەماشاکردنی کتێبی "کار و هاوسەنگ بوون"دا بە شێوەیێکی ئاشکرا دوولاگرایەتی (الثنوية– Dualism)ی تێدا بەدی کرد . بەتایبەتی لەو کێشەیەدا نووسەرەکەی بەڕاست نازانیٔ کە وای داناوە "بیر جیهان بەڕێوە دەبات" چونکە "هۆشی ئادەمیزاد نەیتوانیوە ببێتە خواوەندی مێژوو ، ئەویش لەبەر ئەوەی خۆی کەرەستەی مێژووە"[(٧)] .

پێشکەوتنی هێزی بەرهەمهێن هۆی بنەڕەتیی پرۆتسێسی کۆمەڵایەتی مێژوویی‌یە" (ل٦٤٧) . زمان وەك هەڵومەرج و ئامێر خۆی دەنوێنیٔ و هۆ و پاشکۆی کۆمەڵایەتی‌یە. بیٔگومان ئادەمیزاد یەکسەر پەیدانەبووە ، بەڵکو بە ڕێگای دووروودرێژی پێشکەوتنی سروشتدا

---

(٧) گ . ڤ . پلیخانۆڤ ، کێشەی گەشەکردنی بیروڕای کلێسە سەبارەت بەمێژوو ، بەرهەمە فەلسەفی‌یە هەڵبژاردەکانی ، ب١ ،ل٦٩١ .

تیۆرپەریوە و داروین ئەمەی نیشانداوە . سەردەمێکی وا بووە ، لە ژیانی باووباپیرانی گیانلەبەرانی لە مرۆچوودا ئامێر ئەو دەورەی بینیبێ ، کە ئەمرۆ چیلکەیێك لە ژیانی فیلێکدا دەیبینێ . بەلاّم مرۆڤ هەر ئەوەندەی پێدەنێتە ژیانی کۆمەلاّیەتی‌یەوە ، ئەو پێشکەوتنەی لە پێوەندی‌یەوە پەیدابووە "بەپێی یاسای ناوخۆی خۆی دەگاتە ئەنجام و کاری ئەو یاسایەش پێشکەوتنی هێزی بەرهەمهێنی هەلومەرجی بزووتنەوەی مێژوویی ئادەمیزاد یان خێرا یان هێواش دەکا" (ل ٦٨٩) .

هێزی بەرهەمهێن پێکهاتنی کۆمەلّ و بیروهۆش و هونەری دیاری دەکا . پلیخانۆڤ بە باوەڕی پتەوەوە ئەوەی نیشانداوە ، کە هەلّپەرکێی ڕاوکەران ڕەنگدانەوەی پرۆتسێسی ڕاوە ؛ هەلّپەرکێی جەنگاوەران شانۆی جەنگە . هونەر بە بەرهەمەوە ئالاّبوو و بریتی‌بوو لە شێوەی ڕاستەوخۆی ، بۆ نموونە ڕەنگدانەوەی جوولّە و لەرەی لەشی گیانلەبەر ، هەمیشە بەشێکی گرنگی ڕاو بوو . گ . پلیخانۆڤ لە بەردەوامیی ئەم باسەدا دەلّێ :" بۆیە شتێکی سەیر نی‌یە ، کاتێ ڕاوکەر سەرلەنوێ ئارەزووی ڕاوکردن دەکا ، خۆشیی بەکارهێنانی هێزی لە ڕاودا وای لێدەکا لاسایی جوولّە و لەرەی لەشی گیانلەبەر بکاتەوە و دەکەوێتە هەلّپەرکێیێکی ڕاویی ڕەسەن "[8] .

[8] گ . ڤ . پلیخانۆڤ ، نامەی بێ ناونیشان ، بەرهەمە فەلسەفی‌یە هەلّبژاردەکانی، ب٧، ل ٣٣٩ .

گەلــێ تــوێژەر پەنجــەيان بــۆ دەورى لاســايى كردنــەوە لــە سەرهەڵدانى هونــەر و زمــاندا و لــە پــەيدابوونيان لــە هاوشــانى و هاوجووتى كارى مرۆڤــى ســەرەتايىيەوە ڕاكێشــاوە. بۆ نموونــە ، ر . پێجيــت لــە لێكۆڵينــەوەى ئاخــاوتنى كــەڕ و لالانــدا گەيشــتە ئــەو ئــەنجامــەى ، كە بــڵێ زمان لــە ئيشــارەتەكانى جووڵانــەوەى دەســتەوە پەيدابووە و دەم بێئاگايانە لاسايى كردووەتەوە .

جووڵانەوەى دەست گۆڕراوە بە جووڵانــەوەى لێــو و بــە هەســتى دەنگەكانى قورگيش بەڕێكراوە .

پەرستنى پەيدابوونى زمانى دەنگى لە تيۆريى كـارى ســيحريــى ن . يا . ماررد دادانى پێدانراوە . مارر واى بۆچووە ، كە لــە سەرەتادا زمان ئامێرى ڕەبەنەكان بووە . مــارر نووسيويە : "پێويستى بە زمانى دەنگى لەگەڵ پێكهاتنى بنچينەى جياوازيى چينايەتىدا پــەيدابوو و لــە ڕێگەى پێوەندى بە سيحرەوە تاقمى تايبــەتىێ هاتە مەيدان ، كە كارى هەڵپــەڕيــن و گۆرانى و يارىيــان سيحرى نــهێنى بــوو لــە پرۆتسێســى قيژە و هاوارى هاوسەنگىياندا وتەى دەنگى دەردەكــەوتن ، كە كۆمەڵە دەنگى واتادار ببنە ڕەمزى وشەى سەر بە سيحر "[٩] .

بــە بــاوەڕى مــارر بــارودۆخى زمــانى زگمــاك كــە دەكاتــە دەورى هونەرى شت لە بەرد دروست كردن و پێكهاتنى زمان ، دەبێتە خاوەنى دوو جۆر زمانى كۆمەلايەتى: جووڵانەوەيى (زمانى ئيشــارەت) و زمــانى

---

[٩] ن . يا . مارر ، كارە هەڵبژاردەكانى ، ب ٤ ، ل ٤٠٩ .

دەنگی . بیر و هۆشیش بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە : سیحراوی ، گەردوونی ، تەکنیکی .

گەلێ هۆز هەیە خاوەنی زمانی ئیشارەت بن . هۆزی ئەراندای ئوسترالی نزیکەی (٤٥٠) ئیشارەتی جیاوازی هەیە ، کە نەك هەر شتی دیاریکراو نیشان دەدەن ، بەڵکو بیروڕای گشتیش دەردەبڕن . زمانی ئیشارەتی خێڵی ئەراندا و خێڵەکانی دی تەواوکەری زمانی دەنگییە و لە حاڵەتی تایبەتیدا بەکاردێنرێ . بێوەژنی خێڵی واراموونگی ئوسترالی بۆ ماوەی ساڵێك قسەکردنی لێ قەدەغە دەکرێت . کوڕی ژنان لە کووچە و کۆڵان بە بێدەنگی دەبینرێ ، کەچی بە پەنجە و دەست و ئانیشك لەگەڵ یەك دەدوێن . هیندییەکانی ئەمەریکا لە پێوەندیی نێوان خێڵی جیاوازدا ، زمانی ئیشارەت بەکاردێنن .

دەنگەکانی کۆنترین ئاخاوتن لە ڕووی چۆنێتی دەربڕین و گەیاندنی واتاوە دابەش نەکرابوون . بەرەو چۆنێتی دەربڕین و گەیاندنی واتا ڕۆیشتن بە جۆری جیاواز بوو ، چونکە لە زۆر کۆندا پرۆتسێسی بنەڕەتیی پێشکەوتنی زمانی خێڵەکان بەیەك گەیشتن بوو . لەم بارەیەوە مارر نووسیویە : " لە خودی پەیدابوون و پێشکەوتنی سروشتیی زماندا ، بەیەك گەیشتن دەوری بنەڕەتی دەبینێ . بەیەکترگەیشتن چەند زیاتر بێت ، هێندە پتر سروشت و فۆرمی لە ئەنجامی ئاخاوتندا پەیدا دەبێ" [١٠] .

---

[١٠] هەمان سەرچاوە ، ب ١، ل ٢١٨ .

تیۆریی کاری سیحری پەیدابوونی زمان ، ئەگەرچی پەیدابوونی زمان بە چالاکیی زەحمەتکێشان و بیرەوە دەبەستێتەوە ، بەڵام بۆچوونێکی ڕاست نییە . گەورەکردنی دەوری زمانی دەست و بەیەکگەیشتن ، دژ بە بیروڕای مێژوویییە سەبارەت بە پێکهاتنی چینایەتی لە کۆمەڵی سەرەتاییدا و لە بیر و هۆشی زوودا . ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ن . یا . مارر بە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی نادروستی مایەکییەتیدا بەرێ .

بەم چەشنە ، گشت تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی پەیدابوونی زمان (جگە لە مارکسییەکە) یەك لایەنی مەسەلەکەیان گرتووە و هەندێ جاریش چەوت سروشتی کۆمەڵایەتیی زمان و پرۆتسێسی پەیدابوونی ڕوون دەکەنەوە .

-٤-

## لێکۆڵینەوەی مارکسییانە لەبارەی پەیدابوونی زمانەوە

لێکۆڵینەوەی مارکسییانە لەبارەی پەیدابوونی زمانەوە پشت بە سەرکەوتن و دەستکەوتی زانستەکانی زوو و زانستەکانی هاوچەرخ دەبەستێ . لەم ڕووەوە کارەکانی ف . ئێنگلس بایەخی شێوازناسییان هەیە و بەتایبەتی : "دەوری ڕەنج لە پرۆتسێسی بە ئادەمیزادبوونی مەیموونندا" (١٨٧٦) ؛ "پەیدابوونی خێزان و دارایی تایبەتی و دەوڵەت" (١٨٨٤) . دەوری کەم هاوتای ئەم کارانە شێوازناسیی

خستنە پێش چاوی تێکڕای کێشەکانی پەیدابوونی زمانە ، کە ڕێگەیان بە زانایان داوە لێکۆڵینەوەی مارکسی‌یانەی پەیدابوونی زمان ناوبنێن (تیۆریی ئێنگلس) .

بنەمای واتای لێکۆڵینەوەی مارکسی‌یانە لەبارەی پەیدابوونی زمانەوە ، خاوەنی ئەم هەل و مەرجانەیە :

١ - پەیدابوونی ئادەمیزاد و کۆمەڵ و زمان پرۆتسێسێکی یەکجار درێژی پێشکەوتنی سروشتی خاون گیانن ، ئەگەرچی پێش پەیدابوونی ئادەمیزاد پرۆتسێسێکی دوورودرێژی پێشکەوتنی ئەقڵی گیانلەبەر بووە ، پەیدابوونی کۆمەڵی ئادەمیزاد بە شێوەیێکی بنەڕەتی پێشکەوتنی گیانلەبەرانی گۆڕیوە : مرۆڤ وەك گیانلەبەرێکی کۆمەڵایەتی لەنێو سەرپاکی گیانلەبەرانی سەر زەمیندا لە بەرزترین پلەی پێشکەوتن دایە . هۆش و ئاخاوتنی ڕەوان و کۆمەڵایەتی خاسیەتی دیاری ئادەمیزادن .

پەیدابوونی زمان تەنیا پرۆتسێسێکی یەکجار دوورودرێژ نی‌یە ، بەڵکو زۆر ئاڵۆزیشە ، کە ئەویش لەبەر چەند هۆیەك . ددان نان بە دوورودرێژیی پرۆتسێسی پەیدابوونی زمان و فرە هۆی ئەو پێشکەوتنە یەکەم هەلومەرجی بنەڕەتیی لێکۆڵینەوەی مارکسی‌یانەیە لەبارەی پەیدابوونی زمانەوە .

ئێنگلس لەم ڕووەوە نووسیوێتی : " لە سەرەتادا ڕەنج ، بەلام دوایی لەگەڵ ئاخاوتنی ڕەواندا پێکەوە بوونە دوو هێزی بزوێنی هەرە سەرەکی ، کە لەژێر تەئسیریاندا مێشکی مەیموون لەسەرخۆ گۆڕرا بۆ

مێشكی ئادەمیزاد ... پێشكەوتنی مێشك و پاشكۆێتی هەست تا دەهات پتر هۆشیان ڕوون دەكردەوە . توانستی تەجریدبوون و ئەنجام وەرگرتن ، كاری پێچەوانەی كردە سەر ڕەنج و سەر زمان و بۆ گەشەكردنی ئایندە پاڵی نوێی بە هەردووكیانەوە دەنا" [11] .

٢ – وێڕای ددان نان بە هۆ و ڕاستی جۆربەجۆردا ، كە كاریان كردووەتە سەر پێكهێنانی ئادەمیزاد و زمانی ، بنەمای كێشەی ماركسی‌یانە لەوەدایە ، لەنێو هەموو ئەو هۆ و ڕاستی‌یانەدا (چالاكیی بەرهەمهێنان) بە ڕابەر دادەنێ ، كە دەشێ تەنیا لەنێو كۆمەڵی ئادەمیزاددا هەبێ . خەڵكی كاتێ بۆ ژیانیان ئامێری پێویست دروست دەكەن ، هەر ئەوەندە نی‌یە شتێك بۆ خۆیان بهێننە بەرهەم ، بەڵكو ژیانێكی مایەكیەتی ، شێوەیێكی دیاری‌كراوی ژیان پێك دێنن .

زمان وەك ئامێری لەیەكتر گەیشتن و وەك وەسیلەی دەربڕین و ڕاگەیاندنی بیر پەیدا دەبێ . ك . ماركس و ف . ئێنگلس لە "ئایدۆلۆژیی ئەڵمان"دا نووسیویانە : " زمانیش هەروەك بیر دێرینە ، زمان وەك چۆن تەجروبە و هەبوونە بۆ خەڵكی‌تر ، هەر ئەو هەبوونەشە بۆ من . واقیعی بیریش هەر بەو جۆرەیە . زمانیش بە چەشنی بیر تەنیا لە پێویستی‌یەوە ، لە فشاری پێداویستیی لەیەكتر گەیشتن و پێوەندی بەستنەوە بە كەسانی دی‌یەوە پەیدابووە" [12] .

---

[11] ك . ماركس و ف . ئێنگلس ، كارە كۆكراوەكانیان ، چاپی دووەم ، ب ، ٢٠ ، ل ٤٩٠ .

[12] هەمان سەرچاوە ، ل ٢٩ .

زمان کە خاوەنی هێڵی بەیەکەوە بەستنەوەیە (ویستنی بەیەکتر وتنی شتێك) ، بەتایبەتی مەرجە لە کۆمەڵدا لەئەنجامی چالاکیی بەرهەمهێنانەوە پەیدا ببێ . بەیەکەوە چالاکی نواندن دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی دەست بکەن بەوەی پێکەوە ببنە خاوەنی ئامێری سروشت و دروستکەری ئامێری کار ، کە ناویان بەسەردا دادەبڕێ .

"... دوای ئەوەی زیادیان کرد و دواتریش پێداویستی خەڵکی و جۆری چالاکی پەرەیان سەند ، کە بەیاریدەیان ئارەزووەکانیان بەجێدێنن ، خەڵك ناوی جیاجیا دەدا بە دەستەیێکی تەواوی ئەو ئامێرانە ، کەوا گەیشتوونەتە ئەوەی لە تەجروبەدا لەگەڵ ئەوانیدی جیهانی دەرەوەدا جیایان بکەنەوە . (...) ئەو ناوە وشەییانە تەنیا لە شێوەی بۆچووندا ئەوە دەردەبڕن ، کە چالاکیی دووپات کردنەوە گۆڕراوە بە تەجروبە ، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسانەی لەپێوەندیێکی کۆمەلایەتیی دیاریکراودا دەژیان ، شتی دەرەکیی دیاریکراو لە خزمەتی دابینکرنی ئارەزووەکانیاندا بوون" [١٣] .

بۆ نموونە لە بەکارهێنانی دار و بەرد بۆ ململانێ لەگەڵ سروشتی دەوروبەردا ، ئادەمیزادی سەرەتایی فێری بەکارهێنانیان و جیاکرنەوەیان لە ئامێریدی بوو . هۆشپەیداکردن لە چالاکیی گشتیدا غەریزەی دەگۆڕێ بە هۆشی ئادەمیزاد . هەرچی بابەتی ئەم هۆشەشە ،

---

[١٣] هەمان سەرچاوە ، ب٣ ، ل ٢٩ .

کە لە ڕەنجەوە پەیدابووە ، ئیشارەتی دەنگی وەردەگرێ و لەسەر ئەم بناغەیە دێرینترین ڕەگ پەیدابوون .

٢ - بۆ لاکردنەوەی مارکسی‌یانە لە کێشەی پەیدابوونی زمان ، وا باوە نەك تەنیا لە ڕووی پێوەندی بە پەیدابوونی ئادەمیزاد و کۆمەڵەوە تەماشا بکرێ ، بەڵکو لەباری پێوەندی بە پەیدابوونی بیریشەوە سەیر بکرێ _ واتە تێگەیشتنی ئادەمیزاد لە بوونی خۆی و لە پێوەندی بە جیهانی دەرەوە و لە پێوەندیی شتی جیهانی دەرەوە لەگەڵ یەکتردا .

بیریش هەروەك زمان تەنیا لە کۆمەڵدا پەیدا دەبێ ، کاتێ مرۆڤ لە پرۆتسێسی چالاکیی بەرهەمی کۆمەڵایەتی‌دا بە بەردەوامی خاسیەتی نوێی شتە سروشتی‌یەکان دەدۆزێتەوە و ناویان لێ دەنێ . زمان ئەم سەرکەوتن و وەدەستهێنانەی چالاکیی ئادەمیزاد پتەو دەکا و هەمان کاریش لەسەر پێشکەوتنی بیر دەکا .

تاقمی دەنگەکانیش ، کە وەك بەرد یان سەگ دەبنە سامانی کۆمەڵایەتی ، دەگۆڕرێن بۆ وشە و ئەم خاسیەتانە وەردەگرن :

١) واتا گەیاندنی پێداویستی‌یێکی کۆمەڵایەتی ؛ ٢) ناوی بۆچوونێکی گشتی ؛ ٣) یەکگرتنێکی بەردەوامی تاقمی دەنگ و واتاکەی لە بیردا . بەهۆی ئەنجامی ئەرکەوە وشە لەسەرخۆ دەکەوێتە ئەوەی واتای شتی لەبەرچاو نەبووش بگەیەنێ .

تاقمی دەنگی گیانداران بە بارودۆخەوە بەندە : واتای شتی بەرچاوی واقیعی دەگەیەنێ و هاوشانیی ڕوودان دەکا . شەمپازی بە

دەگمەن لە ئەندازەی بازدانیدا هەڵە دەکا – واتە لە دیاریکردنی دووریی شت لە خۆیەوە ، بەڵام لە دیاریکردنی دووری لەنێوان شتدا بەئاسانی دەکەوێتە هەڵەوە. وشە کە لە کۆمەڵی ئادەمیزاددا پتەو بووە ، واقیعی هەمەجۆر دەگەیەنێ و لەنێوانیشدا ئەوانەی لە تەجروبەدا کۆکراونەتەوە . وشە دەبێتە بەشێك لە چالاکیی دەروونیی ئادەمیزاد ، بیری ئادەمیزاد وەك هەستی نیشانەی سروشتی .




نەخشەی بەراوردیی (أ) کەللەسەری مەیموون و

( ب) کەللە سەری مرۆڤ ، کە بارودۆخی هاوسەنگی‌یان نیشان دەدا

یەکگرتنی هەمیشەیی تاقمی دەنگ و واتا (مەرجێکی گرنگی پەیدابوونی دێرینترین وشەن) بووە هۆی جووت بوونیان و ئەمەش دیاردەی قەدەغەکردن ئیسپات دەکا . لە کۆندا قەدەغەکردن بە خەیالی ئەفسانەوە ، بە باوەڕی سیحرییەوە ، بە هێزی وشەوە بەند بوو : ئەگەر ناوێك بزانی ، ئەوە مرۆکەش دەناسی و هێزت بەسەریدا دەشکێ . لەبەرئەوە لای گەلێ خێڵ و میللەت قەدەغە بوو ناوی سەرکردە و خواوەند و فریشتە بهێنرێ ؛ نەدەبوو کەس ناوی خۆی بە بێگانە بڵێ ؛ ژن ناوی مێردەکەی ببا . ژن لای هەندێ خێڵ تا ئێستاش نەك هەر مافی ئەوەی نییە بە ئاشکرا ناوی مێردەکەی بڵێ ، بەڵکو نابێ سەرپاکی ئەو وشانەش بڵێ ، کە تاکە برگەیێکی لە ناوی مێردەکەی یان لە ناوی کەس و کاری مێردەکەیدا هەبێ .

٤ – زانستی مارکسییەت کە ددان بە پەیدابوونی ئادەمیزاددا لە جیهانی گیانلەبەرەوە دەنێ ، ناتوانێ گرنگیی پێشکەوتنی بایۆلۆژیی بناغەی چالاکیی ئاخاوتن و بیر – واتە مێشك و ڕشتەی ئاخاوتن ، ئەندامەکانی بیستن و بینین – ڕەتبکاتەوە . بناغەی بیرکردنەوە و چالاکیی ئاخاوتن بریتییە لەپێشکەوتنێکی بالای پێکهاتنی ڕشتەی دەمارە ماسوولکەییەکان . بۆ سەلماندنی شێوەی دەرەوە پەلیۆئەنترۆپۆلۆژی [١٤] زانیاریی گرنگ دەدات . ئەو پەیکەرانەی

---

[١٤] پەلیۆ ئەنترۆپۆلۆژی _ بەشێکە لە زانستی ئەنترۆپۆلۆژی ، کە لە جۆری فیزیایی و پێشکەوتنی ئادەمیزادی کۆنی دۆزراوە دەدوێ (وەرگێڕ) .

ئادەمیزادی کۆن ، کە م . م . گیراسیمۆڤ دروستی کردوون ناوبانگێکی گەورەیان دەرکردووە .

خۆگونجاندنەوەی مەیموون بۆ سەر زەوی و لەسەر دوو پێ ڕۆیشتنی کارێکی گەورەی کردە سەر پێشکەوتنی سروشت . بەپێی قسەی ئێنگلس ، ئەمە هەنگاوی یەکجارەکی بوو بۆ بوونی مەیموون بە ئادەمیزاد . مرۆ لەسەر بناغەی ڕاست ڕۆیشتنی توانی دەستی وەك ئامێری ڕەنج بەکاربێنێ و بزووتنەوەی ڕێكوپێکی پێ بکات ، مێشك و قوڕگی پێش بکەوێ و بە کەڵکی دەربڕینی دەنگی واتادار بێت .

ڕاست ڕۆیشتنی هەمیشەیی ، ڕێكبوونی قەد و بالا ، سەربەرز ڕاگرتن بە ڕادەیێك ، کە بۆریی هەناسە بێ پێچ کار بکا و مێشك لە کەللەسەردا تەخت بووەستێ . ئەمە یاریدەی پێشکەوتنی مێشکیدا ، کاری جووڵانەوەی ڕشتەی هەناسەی ئاسان کرد . پێکهاتنی تونژاڵی مێشك و ڕشتەی ئاخاوتنی پیتی کانترۆپ و سینانترۆپ بەجۆرێکە ، کە توانی بوونی دەنگی واتاداری نەبێ .




باری بۆشایی دەم و ئەوکی (١) مەیموون و (٢) مرۆڤ

لێکۆڵینەوە لە پێکهاتنی شەویلەی مرۆڤی دێرینی دۆزراوە بۆ ڕوونکردنەوەی پەیدابوونی ڕشتەی ئاخاوتن زانیاریی باش دەخاتە ڕوو ، چونکە بۆ دەربڕینی دەنگی واتادار شەویلەی سووك پێویستە ، کە توانای جووڵانەوەی خێرای هەیە . بۆ هێنانەدی دەنگی واتادار پێویستە ڕشتەی هەزم و هەناسە بگۆڕرێن بە ئەندامی ئاخاوتن . هەروەها هەندێ مەرجی دی فیزیۆلۆجیش پێویستن : بچووکبوونەوەی بۆشایی دەم و نزمبوونەوەی ئەوك (الحنجرە) ، کە دەبنە هۆی باش دابەشبوونی ماسوولکەکان و چوونەوەیێکی دیوی ڕەهای دەنگە ژێکان .

شۆڕبوونەوەی بەشی خوارەوەی دەموچاو توانستی بە ڕێکوپێکبوونی هەناسەدان دا . لووزەوی هەوا بۆ ئەنجامدانی دەنگی واتادار بەکاربێنێ . نزم بوونەوەی ئەوك بووە هۆی کورتبوونەوەی پەردەی ئاسمانەی دەم و درێژبوونی ڕەگی زمان . لە ئەنجامی ئەو هەموو گۆڕانکاری‌یەدا پێوەندیی نێزك و پتەوی ئەوك و بۆشایی دەم دامەزرا . بۆشایی دەم فۆرمی پێویستی‌خۆی وەرگرت . بارى ئاسۆیی دەنگەژێکان و ئەستووربوونیان و خڕبوونیان بوونە هۆی دەربڕینی دەنگی بەرز و باش یەکخستنی ئاوازی بنەڕەتی ، کە بە لەرینەوەی دەنگەژێکان سازدەبن ، لەگەڵ ئەو دەنگانەی لە بۆشایی دەم و لووتەوە پەیدا دەبن . بەم جۆرە ڕشتەی ئاخاوتنی ئادەمیزاد پەیدابووە و توانستی دەربڕینی دەنگی جۆربەجۆری ئاخاوتنی وەرگرتووە .

پێشکەوتنی ئەندامەکانی هەست (بەر لە هەر شت بینین و بیستن) و ڕشتەی ئاخاوتن بە هاوشانیی ڕشتەی دەمارەکانی مێشکەسەر بووە . مێشکی ئادەمیزاد قەوارە و سەنگی گەورەی هەیە (مام ناوەندی ١٣٥٠ - ١٤٠٠ گرامە) . ئەگەر ئەو مەیموونانەی پێشتر ناومان بردن ، سەنگی مێشکیان لەچاو سەنگی لەشیاندا (١١٠٦ ، ١١٠٠٢) بێ ، ئەوە ئەم نیسبەتە لای مرۆڤ (١١٠٤)ە . دیوی دەرەوەی مێشکی ئادەمیزاد پڕ خولری و پێچاوپێچە ، کە بە نێوانیاندا چاڵوچۆڵی تێدەپەڕن (ئەمە لای مەیموون زۆر کەمترە) . بەشێکی زۆری کارژی مێشکی ئادەمیزاد کەوتووەتە ناوچەی ناوچەوان و پێشەسەر و تەپڵەسەرەوە و بەشێکی کەمیشی لە ناوچەی پشتەسەر دایە . پرۆتسێسی بیرکردنەوە و ئاخاوتن بەو ناوچانەی مێشکەسەرەوە بەندە . ئەم ناوچانەی مێشك لای مەیموون بێهێزە .

پەیدابوون لە پرۆتصێسی هۆشەکی چالاکیی بەرهەمهێنانی کۆمەڵایەتیی ڕشتەی ئاخاوتن و مێشکی ئادەمیزاد بووە هۆی ڕێکوپێك بوونی تەکدانەوەی چالاکیی ئادەمیزاد و دروستبوونی سیستەمی دووەمی نیشانە .

بەپێی لێکۆڵینەوەی ی . ب . پاڤلۆڤ سیستەمی یەکەمی نیشانە ، کە خاسیەتی ئادەمیزاد و گیانلەبەرانە ، بریتییە لەوەی شتێکی کارتێکەری دەرەکی لە ڕێگای ئەندامەکانی هەستەوە کار دەکاتە سەر مێشك و دژەکردلر (رد فعل)ێکی عەفەوی لێ پەیدا دەبێ . بۆ نموونە ، نەڕەی شێر نیشانەی نزیکبوونەوەی مەترسییە لە

گیاندارانی دی (گیاندارانی بچووك ، کە ئەم نیشانەیە وەردەگرن ، بۆ پاراستنی ژیانیان خۆیان دەشارنەوە) . لوورەی گورگ گەلەگورگ کۆدەکاتەوە تا بە هێزێکی گەورەوە پەلاماری نێچیرەکەیان بدەن . سیستەمی یەکەمی نیشانە سیستەمێکی پێزانینی راستەوخۆیە بە دەوروبەر و ، خاسیەتێکە لە گشت گیانلەبەرێکدا هەیە . سیستەمی یەکەمی نیشانە ، سیستەمی هەستکردن و تێگەیشتنی شتی چەسپاو و دیاردەی واقیعی جیهانە . چالاکیی ئەندامەکانی هەست سیستەمی یەکەمی نیشانە پێك دێنیٚ .

سیستەمی دووەمی نیشانە تەنیا بە چالاکیی ئەندامەکانی هەست پێك نایەت ، بەڵکو بە مێشکیش ، کە ئەمیش چاری زانیاریەکانی ئەندامەکانی هەست دەکات و دەیانگۆڕێت بەنیشانەی سیستەمی دووەم و دەبنە زانیاریی بیری ئادەمیزاد . بیریش خاوەنی خاسیەتی چالاکی و دەست پێشکەرییە ، کە لە گیانداردا نییە . ی . پ . پاڤلۆڤ لەم بارەیەوە نووسیویٚتی : " گیاندار تا پەیدابوونی homo sapiens هەڵسوکەوتی لەگەڵ جیهانی دەوروبەردا تەنیا لەرێی سەرنجی راستەوخۆی لە شتی هەمەجۆری کاریگەری سەر ئەندامی جیاجیای و چوونی بۆ شانەکانی رشتەی دەمارە ناوەندییەکانییەوە بووە . لای ئادەمیزادی دوارۆژ نیشانەی پلەی دووەم سەری هەڵدا و

گەشەی کرد و ڕێك کامڵ بوو . نیشانەکانی ئەم نیشانە سەرەتایییانە ، لە شێوەی وشەی دەربڕاوی بیستراو و بینراودا بووە"[١٥].

سیستەمی دووەمی نیشانە "ئیزافەبوونێکی یەکجاری میکانیکیی چالاکی دەمارەکانە" [١٦]. ئەمەش لە ئەنجامی لەسەر بناغەی کۆمەڵایەتیی چالاکیی بەرهەمهێنانەوە هاتووەتە کایەوە و لە شێوەی وشەدا بووە . سیستەمی دووەمی نیشانە خاوەنی هەلومەرجی تەکدانەوەی کاتیی پێوەندیی ئەو دەمارانەیە ، کەوا ئەنجامی زانیاریی ڕاستەخۆی هەست دەگەیەنن و بە یاریدەی سیستەمی یەکەمی نیشانەوە وەرگیراون . سیستەمی دووەمی نیشانە نەك تەنها بارودۆخ بۆ پێوەندیی دووپات بووەوە و کاتیی دەمارەکان دابین دەکا، بەڵکو بیری تەجرید و دیالێکتیکییش بۆ هۆشی ئادەمیزاد ساز دەکا .

٥ - لە کۆتاییدا هەلومەرجی گرنگی لێکۆڵینەوە لەبارەی پەیدابوونی زمانەوە بریتییە لە ددان نان بەو ڕاستییەدا ، کە زمانی سەرەتایی ئادەمیزاد ساکار و هەژار بوو و تەنیا لە بەردەوامیی پێشکەوتن و مێژوودا گۆڕا بە ئامێرێکی ناسك و دەوڵەمەندی لەیەکترگەیشتن و پێوەندیی بەستن .

ئاخاوتنی سەرەتایی ئادەمیزاد پێکهاتبوو لە دەنگی پەرت و بڵاوی تێکەڵ بە ئاواز و ئیشارەت . لە هاوار و قیژەی مەیموون یان ئەو

(١٥) ی . پ . پاڤلۆف ، بەرهەمە کۆکراوەکانی ، ب٣ ، کتێبی ٢ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ ، ل ٣٤٥ .
(١٦) هەمان سەرچاوە ، ل ٥٦٨ .

دەنگانەی ئێستا بەرانبەر گیانلەبەر بەکاردێنرێن ، دەچوو : هەچە - بۆ کەر ، چغە - بۆ سەگ ، ختتە - بۆ پشیلە ...

تـاقمی وشـە بـووە بـە دانـەی بنـەرەتیی زمـان ، کـە دەکـرێ بـەو جۆرەی خوارەوە خاسیەتی نیشان بدرێ :

ا) تـاقمی وشـەی سـەرەتایی یـەك پارچـەیی بـوو . دەنگـەکانی کەمبوون و باش لـە یـەك جیا نەدەکرانـەوە و بـە شـێوەیێکی سـەرەکی کۆنسـۆنانت بوون . ئاخـاوتنی واتاداری ئـادەمیزاد لـە بەرانبـەر یـەکتر وەسـتانی کۆنسـۆنانتی لێوەکـی و کۆنسـۆنانتی پشـتەوەی زمـان و هـەروەها دەمـەکی و بیڤلۆکیـیـەوە دەسـت پێدەکـات . پـەیدابوونی کۆنسـۆنانتی پێشـەوەی زمـان و لـە یـەکتر جیاکردنـەوەیان ، هـەروەك جیاکردنـەوەی کۆنسـۆنانتی لێوەکـی دواتـر ڕوویداوە و هـەنگاوێکی گـەورە و دیـاری سـازبوونی ئاخـاوتنی ئـادەمیزاد و ڕێکـوپێـك بوونـی لانەی زمان بوو .

ب) پەدەکی تاقمی وشە هەروەها زۆر نەبوو ، بۆیـە وشـەی دێریـن لە ڕووی واتاوە پەرت و بڵاو بوو و لەبارودۆخی جیاوازدا جیاواز بوو . چۆن منداڵ دەست بە گروگاڵ دەکا، ئادەمیزادیش بە هـەمان چەشـن دەستی بە قسە کردووە [17] . ئەوەتـە منداڵیـش ، کـە دەڵـێ (دا) لـەکاتی

---

[17] دیارە ئەم بەراوردکردنە زۆر تەواو نییە ، چونکە دەنگەکانی منداڵ لەگەڵ دەنگەکانی سەرەتایی ئاخاوتنی ئادەمیزاددا جیاوازن ، هیچ نەبێ لەبەر ئەوەی منداڵ لەدایکبوونەوە پشتەی ئاخاوتنی پتر ڕێکوپێکە و وێڕای ئەوەش ئاخاوتنی ئادەمیزاد دەبیسێ و لاسایی دەکاتەوە .

جیـاوازدا واتـای جیـاواز دەدات و وەك ئیشـارەتی گشـتی خـۆی دەنوێنێ : دایە وەرە ، دایە ڕۆیشت ، دایە هاتەوە .

ج) پەرت و بڵاویی ڕووی واتایی و دەنگی وشـەی دێریـن بـووە هـۆی دوویاتبوونـەوە و خستنەسـەریەکی دێرینـترین ڕەگ ، کـە کەرەستەی سـەرەکیی پێکـهاتنی فۆرمـی وشـە بـوو . جیاکردنـەوەی فۆرمی وشە بەهۆی پەیدابوونی بەشـەکانی ئاخاوتن و حاڵەتـەکانیان و ئەرکی هەمیشـەیی ڕستەسازییانەوە بـوو . بەرانبـەر یـەکتر وەسـتانی نـاو و کـردار و پـەیدابوونی جێنـاو و ئـامراز ڕێگـەی بـۆ سـازبوونی حالاتی لێکسیکی و ڕێزمانی خۆشکرد .

پێکهاتنی دەنگی و ڕێزمانی و هەروەها وشەکانی زمان _ ئەو سێ بەشـەیە ، کـە پـەیدابوونیان لـە پـەیدابوونی پێکـهاتنی زمـان دەدوێ . پـەیدابوونی زمـان وەك ئـەندامێکی پێکـهاتوو و کۆمەڵایـەتی کەوتـە پێشکـەوتن و ڕێکوپێـك بـوون و کـامڵبوون . کێشـەی ئـادەمیزادیش گۆڕرا بە کێشەی پەیدابوونی میللـەت – واتـە پـەیدابوونی میللـەتانی جیاواز و زمانیان .

* * *

# فەسڵی چوارەم

# کار لەیەکترکردنی زمانان و یاسا و دەستووری پێشەکەوتنیان

## -١-

## ترازانی زمان و نزیکەوتنەوەی زمانان

فۆرمی زووی مرۆی ئەمڕۆ (مرۆی هۆشیار- Homo sapieons) لە چەند ناوچەیێکی خاوەن ئاو و هەوای باشی سەر ئەم زەمینەدا پێگەیشت : لە ناوچەی دەریای سپی ناوەڕاستدا ، بەتایبەتی ئاسیای نێزیك ، خوارووی ڕۆژهەلاتی ئەورپا و سەرووی ئەفریقیا... چۆلێی گەلێ هەرێمی پان و بەرینی ئاسیا و ئەورووپا و نزمی بەرهەمی ڕەنج ، مرۆی سەرەتایی‌یان ناچارکرد بەسەر ڕووی زەمیندا پەرت و بلاوببنەوە و کۆمەلی مرۆی تایبەتمەندی خاوەن خانەداری و زمانی جیاواز پەیدا بن . کۆچکردن لە ناوچەی ئاو و هەوای گەرم بۆ ولاتانی سارد ، پێویستیی نوێی لە خانووبەرە و جلوبەرگدا ؛ لە ئاژەلْ و بواری ڕەنجدا هێنایە ئاراوە . ڕەنج خۆی لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیێك تا دێ پتر هەمەچەشن و ڕێکوپێکتر دەبێ . لە ئەنجامی پێشکەوتنی دوور و

درێژی ئاخاوتنی پەیدابووی مرۆوە ، زمانی جیاواز و دیالێکتی جۆربەجۆر پەیدا دەبن .

مێژووی زمانی ئادەمیزاد لە فرەچەشنیی دیالێکتی هۆزەکان و یەکبوون و دابەشبوونی دواییانەوە دەستپێدەکات . نەک تەنیا ڕەگەزی دایک ، بەڵکو هۆزی سەرەتاییش لەسەر بناغەی توخمی خوێن و زمان – زمانی خێڵ یان دیالێکت – یەکی گرت . ف . ئێنگلس نووسیویە : " لەواقیعدا خێڵ و دیالێکت لە کرۆک و بنەڕەتدا یەک دەگرنەوە "[1] .

پەیدابوونی چەند زمانێکی کەم ، بارودۆخی ئادەمیزاد بوو لە دەمی پەیدابوونیدا و ئەو جۆرە بارودۆخەش تەنانەت لەنێو هەندێ میللەتانی سەردەمی نوێشدا دەبینرێ . ن . ن . میکلووخە مەکەلای[2]، ساڵی ١٨٧١ کە لە باکووری ڕۆژهەلاتی گینیای نوێ بوو ، نووسیویە دەڵێ :

---

(١) ک. مارکس ، ف . ئێنگلس ، کارە کۆکراوەکانیان ، چاپی دووەم ، ب ٢١ ، ل ٩٣ .

(٢) میکلووخە _ مەکەلای زانا و گەڕیدەی ڕووس ، ساڵی ١٨٤٢ لە هەرێمی نۆڤگۆرد لەدایکبووە و ساڵی ١٨٦٣ لە زانکۆی پیتربورگ وەرگیراوە .

ساڵانی ١٨٦٦_١٨٦٧ گەشتێکی بە دورگەی کەناری و مەغریبدا کرد . ساڵی ١٨٦٩یش دوای گەڕانەوەی لە گەشتی ڕۆخی دەریای سوور ، یەکەم بەرهەمی زانستیی دەربارەی چەند جۆرە ماسییێکی دەریایی بلاوکردەوە .

هەر لە سەرەتای کارکردنییەوە ، گرنگی بە کولتوور و داب و نەریتی میللەتانی ئەو وڵاتانە داوە ، کە بینیونی . دواتر ئەنترۆپۆلۆژی و ئەتنۆگرافی و لێکۆڵینەوەی دانیشتوانی ڕەسەنی باشووری ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ئوستراليا ... سەرنجی ڕاکێشاوە . دوو ساڵ و نیو لە باکووری ڕۆژهەلاتی کەناری گینیای نوێ ژیاوە... (وەرگێڕ) .

" نزیکەی هەر دێیێکی ئەو ناوچەیە بەشە دیالێکتی خۆی هەیە . لەو گوندانەدا ، کە بە پێی چارەکە سەعاتێك لە یەکدی دوورن ، چەند وشەیێکی جیاواز بۆ ڕاگەیاندنی واتای تاکە وشەیێك دەبیستریٚ . خۆ دانیشتوانی ئەو گوندانەی دووری‌یان لەیەکەوە بە پیادە سەعاتێك دەبێ ، هەندێ جار بە بەشە دیالێکتی هێندە لەیەك جیاواز دەئاخێون ، کە نزیکەی لە یەکدی تێ‌ناگەن " [٣]

دابەش‌بوونی زمان (دیالێکت) و یەکگرتنی زمان و دیالێکت – دوو پرۆتسێسی بنەڕەتیی درێژەییێکی مێژوویی گەشەسەندنی زمانە . ئەم پرۆتسێسانە بە دوو زارلوەی تایبەتی (ترازان–Differentiation) [٤] و (نزیك کەوتنەوە – Intergration) [٥] ناونراون . (ترازان) بەو دابەش‌بوونە ناوچەیی‌یەی زمان دەوترێ ، کە لە ئەنجامیدا زمان و دیالێکتی خزم پەیدا دەبن . (نزیك کەوتنەوە) بەپێچەوانەوە ئەو پرۆتسێسە مێژوویی‌یەیە ، کە یەکگرتن و یەکبوونی زمانان و دیالێکت جێ‌بەجێ دەکا . ترازان ژمارەی زمان زیاد دەکا و نزیککەوتنەوە ژمارەیان کەم دەکاتەوە . حاڵەتی تایبەتی نزیککەوتنەوە بریتی‌یە لە پێوەندیی زمانان ، کە دەبێتە هۆی لەیەك وەرگرتنی وشە و پێکهاتنی

---

(٣) ن . ن میکلوو‌خە _ مەکەلای ، گەشت ، ب ١، مۆسکۆ _ لینینگراد ، ١٩٤٠ ، ل ٢٤٣ .

(٤) لە (differo)ی لاتینی‌یەوە وەرگیراوە ، کە واتای (بڵاودەکەمەوە ، جیای دەکەمەوە) دەگەیەنێ .

(٥) لە (intergrare)ی لاتینی‌یەوە کەوتووەتەوە و مانای (یەکخستن ، بەیەککردنەوە) دەدات .

وشەی هاوبەش لە نێوانیاندا (بەشێوەییێکی بنەڕەتی لە بواری زاراوەدا) .

ترازان و نزیک کەوتنەوە پرۆتسێسی کۆمەڵایەتین ، چونکە جیابوونەوە و یەککرتنی زمانان بەهۆی ئابووری و جەنگی و ڕامیاری و ڕووناکبیری لێکدەدرێتەوە . بەوێنە حاڵەتی ڕوودانی ترازان لە سیستەمی کۆمەڵگەی سەرەتاییدا بە ڕادەی نشێوی و کزیی هێزی بەرهەمهێنان و کەمیی ژمارەی تیرە و خێڵ و نزمیی پلەی چڕیی دانیشتوان ڕوون دەکرێنەوە . ئەم سێ ڕاستییە وایان لە مرۆی زوو کردبوو بە بارودۆخی جوگرافی و ئاو و هەواوە پتر بەند بێ . گەڕان بەدوا خواردن و بەرگری لەخۆکردن (دارستان ، چیا ، ڕوبار) بوونە هۆی کۆچکردنی هۆز و عەشرەت ، یان گیربوونیان لە شوێنێک . بەوێنە دارستانی ساکسۆن لەنێو خێڵە جەرمانی و سلاڤییەکاندا ، ناوچەی بێلایەن بوو و بە سلاڤی (برانیبۆر – دارستانی پاراستن)ی پێدەوترا (لەگەڵ "براندینبورگ"دا بەراوردی بکە ) .

ک . مارکس نووسیویێتی : "ویست و ئارەزووی بەردەوام بۆ دابەشبوون لە ماکی پێکهاتنی ڕەگەزدا ڕەگی داکوتا و ئەمەش ویست و ئارەزووی بۆ پەیدابوونی جیاوازیی لە زماندا بەهێز کرد ، بێ خۆڕزگارکردن لە بارودۆخی کۆمەڵایەتییان (واتە – کێوێتی و درندەییێتی خێڵەکان) و فراوانکردنی ئەو ناوچانەی لێی دەژیان . ئەگەرچی زمانی ئاخاوتن لە بواری وشەدا باش جێگیر دەبێ و لەباری قاڵبی ڕێزمانیشەوە باشتر خۆی دەگرێ ، بەلام ناتوانێ لە حاڵەتی

نەگۆڕاندا بمێنێتەوە . سنوور شکاندنی گیربوون و بڵاوبوونەوە بە تێپەڕبوونی کات بووە هۆی پەیدابوونی جیاوازیی لە زماندا .ئەمەش ڕێی بۆ ئارەزووی سەربەخۆیی تەواو خۆش کرد"[٦] .

-٢-

## خزمایەتیی زمان و یەکێتیی زمان

بڵاوبوونەوە بە دەورووبەردا و پەلهاویشتن بۆ دوور ، کە ئەنجامی ماوەی دوور و درێژی کۆچکردن بوو ، جیاوازیی لە زماندا هێنایە ئاوانەوە . بەڵام ئەو زمانانەی دەگەڕێنەوە سەر یەك سەرچاوە ، بنەما و ئافیکس ؛ یاسای فۆنەتیکی ...یان پاراستووە . خاسیەتی پێشکەوتنی زمانی مرۆ بریتی‌یە لە هاتنەکایەی زمانانی خزم . یەك زمانی دەبێتە بەڵگەی گشتێتیی پەیدابوون . کۆبوونەوەی خێڵەکان لە ڕۆژانی جەژنی هاوبەش و شیعری میللی ، بەکارهێنانی گشتێتیی یەکێتی زمانانی خێڵی خزمی ڕاگرتبوو .

ئا . ڤ . دیسنیتسکایا نووسیویە : " لە ژیانی کۆمەڵگەی دواتردا ، کە تێیدا نووسین تەنانەت ئەگەر لە سنوورێکی تەسکیشدا بۆ هەندێ پێویستی بەکارهێنرابێ ، بەڵام هێشتا نەیتوانیوە ئەرکی کولتووری هەمەکی بەجێبێنێ . شیعری سەرزار کە ئاوێنەی

[٦] ك . مارکس ، کورتەی کتێبی لویس گ . مۆرتان ، "کۆمەڵگای کۆن" _ ئەرشیفی مارکس و ئێنگلس ، ب ٩ ، مۆسکۆ ، ١٩٤١ ، ل ٧٩ .

ئایدۆلۆژیی ئارەزووی جەنگاوەران و پارێزەران و سەروەران بوو، دەورێکی یەکجار گەورەی بینی و کاتی بێئیشیانی دەڕازاندەوە و دەبووە هەوێنی هێز و سەرکەوتنی نوێ ...

زمانی ئەو بەرهەمانەش ، زمانی شیعریی دیالێکتی ڕووکەش بوو ، کە خۆی جیادەکردەوە لە کۆمەکی ڕێژە و تایبەتی و وشەی کۆن و هەروەها زۆری یان کەمیی جیابوونەوەی لە ڕێزمان و فۆنەتیکی ئاخاوتنی ڕۆژانە"[٧] . بڵاوبوونەوەی زمان بە دوو ڕێگادا ڕۆیشتوە : لە لایەکەوە لە ڕێگای زۆربوونی سروشتیی مرۆ و کۆچکردنی بەشێك لە تیرە و خێڵەکان بۆ ناوچەی چۆڵ . لە لایەکی دیەوە لە ڕێگای تەنگهەڵچنینی زمانێك بە زمانێکی دی . وەك ئا . س . پوشکین دەڵێ :

میللەت جێی میللەتی گرتووەتەوە

ڕووی مرۆش زەمین گۆڕیویە

بەشێکی گرنگی پێکهاتنی مێژووی زمانی ئەم سەر زەمینە ، بریتییە لە پەیدابوون و بڵاوبوونەوەی زمانە هیند و ئەورووپییەکان . ئەم پرۆتسێسە لە دەمێکی یەکجار دێریندا دەستی پێکردووە و ئێستاش هەر لەکاردایە ، بەڵام لە شێوەی بڵاوبوونەوەی زمانی کامڵ و پێگەیشتوودا . وەك : زمانی ئینگلیزی و ڕووسی و ئیسپانی و هی دی .

---

[٧] ئا . ف . دیسنیتسکایا ، فۆرمی زمانی ئاخاوتنی دیالێکتی ڕووکەش و دەوری لە مێژووی زماندا ، مۆسکۆ ، ١٩٧٠ ، ل ١٧ .

لە دەوری بەردی كۆندا سەقامگیر بوونی باووباپیرانی زووی ئەو هیندوئەورووپاییانەی نێوان ڤۆلگا و دونای ، دەكرێ بەو ڕاستی و بەڵگەیە بسەلمێنرێ ، كە (ڤۆلگا ، دۆن ، بووگ ، دونای ، بەڵكان ، كەرپات ، چۆرنەیە مۆرێ "دەریای ڕەش - وەرگێڕ" ) بریتین لە وشەی هیندوئەورووپایی . هەروەها (بیریۆزا)[8] تاكە ناوی هیندوئەورووپایی درەختە ، كە ڕەنگدانەوەی هەرێمێكی خاوەن ئاووهەوای تایبەتی تێدا بێ . نزیكەی (١٥) هەزار ساڵ لەمەوبەر چەرخی سەهۆڵبەندان كۆتایی هات و دەوری دروستبوونی خێڵە هیندوئەورووپاییەكان دەستی پێكرد . بێگومان ئەمەش ئەوە ڕوون دەكاتەوە ، كە وشەی "زیما" (زستان) و "سنێگ" (بەفر) هیندوئەورووپایین . لە زۆر زمانی هیندوئەورووپاییدا ناوی وێكچووی گیانلەبەر : "ئەڤتسا" (پەز) ؛ "ئەلێن" (ئاسك) ؛ "یۆژ" (ژیشك) ... باڵندە "ئۆریۆل" (هەڵۆ) ؛ "ژوراڤل" (زەرافە) ... مێش و مەگەز و گەزندە : "مووخە" (مێش)...

لە نیوەی یەكەمی دەوری بەردا ، بەر لە ٤ - ٣ هەزارەی پ . ز . دا ، سێ هەرێمی زمانە هیندوئەورووپاییەكان دروستبوو : ١_ سەروو ؛ ٢_ ناوەندی ؛ ٣_ خوراوو .

زمانی ئیترووسی ئیتالیای كۆن (كە دوایی زمانی لاتینی بەتەواوی تەنگی پێهەڵچنی) ، لیكی ، لیدی ، لووڤی ، هیتی ، زمانەكانی

---

[8] درەختێكە لە شێوەی چناردا (وەرگێڕ) .

ئاسیای بچووك ... هەرێمی خواروو[٩] پێك دێنن . نووسینی مێخیی هیتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ١٨ - ١٣ ی پ . ز . و بەڵگەنامەی نووسراوی هەرە دێرینی زمانە هیندوئەورپاییەکانە . نووسینی هیرۆگلیفی هیتییەکان دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ١٤ - ١٣ پ . ز .

هەرێمی ناوەندی پەلی زیاتری گرتبووە خۆ : لە لایەکەوە پەلی ئیتالی (ڕۆمانی) و جەرمانی جیادەبێتەوە . لە لایەکیدییەوە ئیلیری – فراکی (کە ئێستا بووەتە زمانی ئەڵبانی) ؛ گرێکی ؛ هیندوئێرانی (کە دابەشدەبێ بەسەر پەلی ئێرانی و هیندیی زمانە هیندوئەورپاییەکاندا) . پەلی جەرمانی و ڕۆمانی و سلاڤیانی سەر بە هەرێمی سەروون (سلاڤیانی لە نێوانیاندا زۆر دیارە) و کۆمەڵی زمانانی خزم پێکدێنێ .

ئێستاش چاوێك بە پێکهاتنی سێ گرووپی زمانە سلاڤییەکاندا دەخشێنین : سلاڤیانیی ڕۆژئاوایی ؛ سلاڤیانیی باشووری ؛ سلاڤیانیی ڕۆژهەلاتی .

زمانی سلاڤیانیی گشتی لە دیالێکت و هەرێمی دیالێکتی خزمی نێزیك پێکهاتبوو ، کە ناوچەی خواروو (پریپیات) لەنێوان ڕۆژئاوای (بووگ) و نێوەندی (دنیپر)ی گرتبووەوە . لە ڕۆژئاوا و باکووری

---

[٩] لەتەك زمانە هیندوئەوروپاییەکاندا لە سەرووی دەریای سپی ناوەڕاستەوە ، هەروەها زمانە پیرێنییەکان و زمانە قەفقاسییەکان و ... بلاوبووبوونەوە .

سـلاڤیانی‌یەکانەوە ، بەڵتیقی‌یـەکان دەژیـان ؛ لـە ڕۆژهـەڵات و باکووریانەوە : خێڵەکانی فینۆئوگۆر ؛ لە باشوریانەوە ئێرانی‌یەکان .

سلاڤیانیی گشتی چەندین سەدە وەك خۆی مایەوە . لە نیوەی دووەمی هەزارەی یەکەمی پێش زاینەوە تا سەدەکانی ٦ - ٧ی پاش زاین . میراتی هیند و ئەورووپایی نەك تەنیا خۆی پاراست ، بەڵکو خۆیشی گونجاند . لەگەڵ بەردەوامیی پەل‌هاویشتنیشدا سیمای گشتیی خۆی نەگۆڕی . ئەوەتە لە سەدەکانی ٦ - ٧دا خێڵە سلاڤیانی‌یەکان بە ناوچەیێکی یەکجار پان و بەریندا بلاوبوونەوە : لە (ئیلمین)ەوە لە باکوور تا (یۆنان) لە باشوور ؛ لە (ئۆکا)وە لە ڕۆژهەڵات تا (ئێلبا) لە ڕۆژئاوا .

بلاوبوونەوەی سلاڤیانی‌یەکان بە ناوچەی زۆر و فراواندا بووە هۆی پەیدابوونی سێ گرووپی زمانی سلاڤیانی و لە دەنگەکان و دەستووری وشەگۆڕیی سلاڤیانیی گشتی‌دا جیاوازی لەنێوانیاندا سەری هەڵدا . هەروەها وشە و ڕەگ و یاسای فۆنەتیکی و ڕێزمانیی نوێ پەیدابوو . بۆ نموونە ناوی (کارلی مەزن) – پادشای فرانك ، کە لە ساڵی (٨٠٠)ەوە ئیمپراتۆر بوو ، وەك نازناوی پادشا لە زمانە سلاڤیانی‌یەکاندا فۆرمی فۆنەتیکی جیاوازی وەرگرت : پۆڵۆنی (کرۆڵ) ؛ سلۆڤاکی (کراڵ) ، چیکی (کرۆڵ) ؛ سێرب و کەرواتی (کرال) ؛ ڕووسی کۆن و نوێ و ئۆکرانی (کەرۆل) ... گونجاندنی عادەتیی ئەمە بریتی‌یە لە پێکهاتنی برگەی کراوەی زمانە سلۆڤاکی‌یەکان و کۆنسۆنانێتی زمانە سلاڤیانی‌یە ڕۆژهەڵاتی‌یەکان .

بڵاوبوونەوەی زمانە سلاڤیانی‌یەکان لە بەڵقان ، بووە هۆی ئەنجامدانی زمانە سلاڤیانی‌یە باشووری‌یەکان (بەلگاری ، مەگدۆنی ، سێرب و کەرواتی ، سلۆڤاکی) و یەکێتی زمانە بەڵقانی‌یەکان ... زمانانی خزم تایبەتێتی بنەچەیی خۆیان دەپارێزن . تایبەتێتی گشتیی یەکێتی زمان لە ئەنجامی پێوەندیی دووردرێژی زماناندا و لە سەقامگیری یەك ناوچەیی ، یان لە یەك نێزیکی ، یان دراوسێیتی‌دا دروست دەبێ .

یەکێتی زمانە بەڵقانی‌یەکان، ئەو زمانە هیند وئەوروپاییانە دەگرێتەوە ، کەسەر بە پەلی جیاوازی ئەم خێزانانەن :

ئەلبانی ، بەلگاری، مەکەدۆنی ، یۆنانیی نوێ ، ڕۆمانی (زمانی ڕۆمانی لەسەر بناغەی لاتینیی میللی سازبوو ، کە کۆلۆنیستەکان لە داکی و نیمچە دورگەی بەڵقان قسەیان پێ دەکرد) . تایبەتێتی ڕێزمانیی یەکێتی زمانە بەڵقانی‌یەکان بریتی‌یە لە : نیشانەی کۆتایی ؛ پێکهاتنی کاتی ئایندە بە هاریکاری کرداری یاریدەدەری (خەتێت) ؛ گۆڕینی چاوگ بە فۆرمی شیکاری ؛ شیکاری لە گۆڕینی دۆخی ناودا .

نموونەی نیشانە لە ڕۆمانیدا "ئۆتول" مرۆڤ - لە ille homo ەوە) ؛ "فراتێللی" (برا) - (لە ille frater ەوە) ... لە بەلگاری‌دا "چۆڤێکت" (مرۆڤ)؛ مۆمتیستی (لاوان)؛ مۆماتا (کچ)؛ مۆمچێتا) (کوڕ)؛ "مۆمیچێتۆ" (کیژۆڵە) ... نموونەی کاتی ئایندە : ڕۆمانی "ڤۆن سینتا" یان "سینتا ڤۆی" (گۆرانی دەڵێم) - "ڤۆی" لە "ڤۆیۆ < Voleo" (حەزدەکەم) ... بەلگاری "شێ پێیا" (گۆرانی دەڵێم) ؛

"شیٚپیێش" (گۆرانی دەڵێ) . ئامرازی (شیٚ) فۆرمی مەیوی کەسی سێیەمی تاکی کرداری "شیٚ" (حەزکردن)ە .

نەك تەنیا مێژووی زمانە هیند وئەورووپاییەکان ، بەڵکو مێژووی خێزانی زمانەکانی دیش ، ئەوە نیشان دەدەن ، کەپێکهاتنی زمانانی خزم پلە بە پلە پێگەیووە و توندوتۆڵ بە مێژووی میللەتانەوە ، واتە – خاوەنی ئەو زمانانەوە – بەندە . دروستبوونی دیالێکتی خێڵەکان و لەسەر بناغەیان پەیدابوونی خێزانی زمانانی خزم و گرووپی زمانان ، بەڵگە و ڕاستییەکی گرنگە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا و بە هەمان چەشنیش پەیدابوونی ئاخاوتنی مرۆڤ .

لە کۆتاییدا سێیەم قۆناغی بنەڕەتیی گەشەسەندنی مێژووی زمانان بریتییە لە دروستبوونی زمانی میللەت و دواتریش زمانی نەتەوە . ئەم پرۆتسێسە لە سەدەکانی ٩ –١٠ی زاینەوە دەستی پێکرد و تا ئێستا بەردەوامە . لەو قۆناغەدا ، چۆن ڕوودانی دروستبوونی زمانانی نوێی خزم ، وەك (فەرەنسی ، مۆڵداڤی ، ڕووسی ، ئۆکرانی...) لە جموجۆڵدا بوون . هەروەها بەکارهێنانی زمانانی پێگەیشتووش ، وەك زمانی نوێی میللەت یان نەتەوە ، بەوێنە (میللەتانی خاوەن زمانی ئیسپانی و نەتەوەکانی باشووری ئەفەریقا) کەوتبوونە گەڕ .

-٣-

## پەیدابوونی زمانی میللەتان و دیالێكت و بەشە دیالێكتی ناوچەیی

میللەتان و زمانیان ، دیالێكت و بەشە دیالێكت لە هەرەس‌هێنانی دەسەلاتدارێتی خاوەن كۆیلەكان و دەولەتانی زووی دەرەبەگایەتی‌دا پەیدابوون . كرۆك و بنەرەت بریتی‌یە لە یەكگرتنی خەلك بەپێی ئەو خاكەی لێی دەژین ، نەك پێوەندیی خزمایەتی . بەپێی بۆچوونی ف . ئێنگلس : " میللەت بەر دابەش‌كردن نەكەوت ، بەلكو خاك و زەوی كەوتە ژێر ئەو بارەوە" و لە شوێنی یەكبوونی تیرە و هۆزەكان "یاسای دەولەتی نوێ پێكهێنرا ، كە لەسەر بناغەی دابەش‌كردنی خاك و جیاوازیی دارایی دامەزرا"[١٠] . بەوێنە لە ئەوروپا گرێكی و فەرەنسیی كۆن و رووسی كۆن و میللەتانی دی پەیدابوون و بە شێوەیێكی سەرەكی بە زمانی هیند وئەوروپایی قسەیان دەكرد . تەماشای دوو نموونە دەكەین :

خاكی فەرەنسا لە كۆتایی هەزارەی یەكەمدا خێلە كەلتی‌یەكانی تێدا دەژیان . لە سالانی ٥٨ - ٥١ ی پ . ز . دا یوولی تسیزار ، كالیا (كە ئەو سەردەمە بەو ولاتەیان دەوت)ی داگیركرد و خستی‌یە سەر ولاتی رۆما . بەرێوەبەرایەتیی رۆما و قوتابخانەكان بە زۆر شوێندا

[١٠] ك . ماركس ، ف . ئێنگلس ، كارە كۆكراوەكانیان ، چاپی دووەم ، ب ٢١ ، ل ١٢٩ .

پەلیان هاویشت ، بەتایبەتی لە باشووردا ، زمانی لاتینیش - لە قالْبی لاتینیی میللیدا - بەکارهێنرا . لە کۆتایی سەدەی پێنجەمدا لەلایەن خێڵەکانی ئەڵمانیای ڕۆژئاواوە (فرانکە سالیکییەکان) کالیا داگیر کرا . لەسەرخۆ و بەتایبەتی دوای جیابوونەوەی پادشایەتی فەرەنسا (ساڵی ٨٤٣) ، فرانکەکان لەگەڵ خەڵکی ناوچەکەدا - گالۆ - ڕۆمایی باووباپیرانی زوویاندا - تێکەڵ بوون .

کۆتایی سەدەی دەیەم لە فەرەنسا دوو شێوە زمانی فەرەنسایی کۆن پەیدابوو : باکووری (نۆرماندی و پیکاردی و دیالێکتی دی) و پرۆڤانسالی (گاسکۆنی و لانگێندۆیی و دیالێکتی دی) : داستانی قارەمانێتیی فەرەنسی لەدایك بوو (لەنێوانیاندا "گۆرانیی ڕۆلاند") . بەلام لەگەڵ ئەوەشدا تاسەدەی پازدەیەم زمانی فەرەنسی وەك دیالێکتی نێوەندیی - ئیل دیْ فرانس - مایەوە . هەرچی دەرەوەی شار و گوند بوو ، بەتایبەتی لە پرۆڤانس و لۆتارینگ بە زمانی خۆیان دەدوان .

لە سەدەی (١٦)دا یەککرتنی فەرەنسا هاتە ئەنجام ؛ پادشایەتیی رەها دەرکەوت ؛ ئەدەبی راپەرینی (ف . رابلیْ ، م . مۆنتێن ، پ . ڕۆنسار) پەیدابوو . ساڵی ١٦٩٤ ئەکادیمیەی زانستی فەرهەنگی بلاوکردەوە ؛ دەستووری زمانی ئاشکرا و ڕاست خرایە بەرچاو . زمانی فەرەنسی بە گشت هەرێمەکاندا بلاوبووەوە . لە بناغەی زمانی فەرەنسیدا لاتینیی میللی هەیە ، کە لە سەردەمی سەرهەڵدان و پەیدابوونییەوە گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتبوو . گۆڕانی هەرە

بنەڕەتی – گەشەسەندنی شیکاری و بیناکردنەوەی پێوەندیی چەندێتیی بزوێنەکانە . لە جێگای بزوێنی درێژ و بزوێنی کورت ، بزوێنی کراوە و بزوێنی داخراو پەیدابوو . بزوێنی بێ هێز (نبرە– Stress) بەرەو نەمان چوو ؛ کۆنسۆنانتی کۆتایی وشە لە تەلەفوزکردن کەوت .

میللەتی ڕووسی کۆن ، لەسەر بنکەی یەکگرتنی هۆز و خێڵە سلاڤییەکانی ڕۆژهەڵات پەیدابوو . لە ساڵی ١٨٨٢دا (ئۆلێگ)ی میری نۆڤگۆرۆد ، (کیف)ی لەژێر دەستدا بوو و کردی‌یە پایتەختی (کیفی ڕووسی) – دەوڵەتی پۆلیانی[١١] و کریڤیچی[١٢] و سلۆڤینی[١٣] و میرەکانی کیف وردە وردە کەوتنە ژێر دەستەڵاتی دێریڤلیانی[١٤] و سێڤیریانی[١٥] و رادیمیچی[١٦] و ئولیچی[١٧] و تیڤرسی[١٨]. دواتریش لە

---

(١١) ئەو خێل و تیرە سلاڤیانی‌یە ڕۆژهەڵاتی‌یانەن ، کە لە هەردوو بەری ڕوباری دنیپر بڵاوبووبوونەوە (وەرگێڕ) .

(١٢) یەکگرتنی ئەو خێڵ و هۆزە سلاڤیانی‌یە ڕۆژهەڵاتی‌یانەیە ، کە لە سەدەکانی ٦ _ ١٠ دا پێکهاتووە ... لە ناوچەی پان و بەرینی‌باکووری دنیپر و ڤۆلگا و خۆرئاوای دڤینا و هەروەها باشووری باس دەژیان (وەرگێڕ) .

(١٣) یەکێکە لە خێڵە ڕووسە دێرینەکان، کە لەدەوروبەری کەناری دەریاچەی ئیلمێن دەژیان (وەرگێڕ).

(١٤) ئەو خێڵانەن ، کە لە سەدەی ١٤دا لە سەرووی ڕۆژهەڵاتی ڕووسیادا دەژیان و لەوێوە بۆ شوێنی دی کۆچیان‌کرد (وەرگێڕ) .

(١٥) هەندێ تیرە و هۆزی سلاڤیانیی ڕۆژهەڵاتین . لە کۆتایی یەکەم هەزارەی زایندا لە دەوروبەری ڕوباری دیسنا و سێیما و سولا و هەندێ ناوچەی دی سەقامگیر بووبوون (وەرگێڕ) .

سەرووی ڕۆژهەڵاتەوە : ڤیاتیچی[19] ؛ لە خوارووی ڕۆژئاواشەوە ڤۆڵنیایی[20] (دەلیبی) و کەرواتی سپی . کیفی ڕووس لە ململانێیەکی قورسدا لەگەڵ تیرە و خێل و دەوڵەتانی دراوسێیدا خۆی ڕاگرت و دەوڵەتی دامەزراند و کولتووری خۆی بەرزکردەوە ، زەمینەی بۆ گۆڕینی هۆزە سلاڤیانییە ڕۆژهەڵاتییەکانی بە میللەتێکی یەکگرتوو خۆشکرد – واتە میللەتێکی خاوەن زمانی ڕووسیی کۆن (سلاڤیانیی ڕۆژهەڵاتی پەیدابوو .

ڤ . پ . فیلین نووسیویێتی : ( یەکێتیی زمانی ڕووسیی کۆن ، کە لە سەردەمی دابەشبوونی سیستەمی ڕەگەزایەتی و بەرەو کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتی چووندا بووە ، شتێکی بێگومانە . ئەم یەکێتییە بەهۆی هەلومەرجی جیاوازی دوور لە زمانەوانییەوە سازبووە : نەبوونی

---

(١٦) یەکگرتنی ئەو خێڵە ڕووسییە دێرینانەیە ، کە لە هەزارەی یەکەمی زایندا لە خاکی ڕادێمچیدا دەژیان و شوێنی هەرە چڕیان باشووری دنیپر بوو (وەرگێڕ) .

(١٧) گروپێکی خێڵە سلاڤیانییە ڕۆژهەڵاتییەکانە ، کە لە خوارووی دنیپر و دەوروبەری دەریای ڕەش دەژیان (وەرگێڕ) .

(١٨) یەکگرتنی هەندێ خێڵی سلاڤیانیی ڕۆژهەڵاتییە ، کە لە ناوچەی دنیپرەوە تا دەریای ڕەش بلاوبووبوونەوە (وەرگێڕ) .

(١٩) چەند خێڵێکی کۆنی ڕووسە ، کە لە ناوچەکانی باس و ئۆکی دەژیان (وەرگێڕ) .

(٢٠) ئەو خێڵ و هۆزە سلاڤیانییە ڕۆژهەڵاتییانەن ، کە لە کۆتایی هەزارەی یەکەم و سەرەتای هەزارەی دووەمی زایندا لە هەرێمەکانی ڤۆڵینی ، لەمبەر و ئەوبەری کەناری ڕووباری بوگا و هەندێ ناوچەی دی جێگیر بووبوون (وەرگێڕ) .

سنووری خاك لەنێوان خێڵە سلاڤیانییە رۆژهەڵاتییەکاندا و لە پاشیشدا نەبوونی سنووری پتەوی زەویوزاری دەرەبەگەکان ، گەشەکردنی زمانی رووکەشی شیعری میللیی خێڵ و پێوەندی توندوتۆڵی بە زمانی کولتووری ئاینییەوە ، کە لە گشت هەرێمەکانی سلاڤیانییە رۆژهەڵاتییەکاندا بڵاوبووبووەوە و بووبووە هۆی سەرەتای پەیدابوونی زمانی کۆمەڵگە و بە تایبەتی ، کە لە بەستنی پەیمان و رێکەوتنی نێوان خێڵەکان و حوکمدان و یاسا و دەستووردا بە ئاشکرا دەردەکەوت"[٢١] .

میللەت وەك کۆکەرەوەی مێژوویی خەڵك ، گونجانی کۆکەرەوەی خاك و کولتوور و زمانە . بناغەی ئابووری و دەوڵەتی میللەت دەشێ جیاواز بێت . لە رووی مێژووەوە ، میللەتی میسری کۆن و چینی کۆن و هێللینیی کۆن یەکەم کۆمەڵانی میلەت بوون ، کە لە ناو جەرگەی کۆمەڵگەی کۆیلایەتییەوە سەریان هەڵداوە . لە بارودۆخی کۆمەڵگەی دەرەبەگایەتیدا میللەتی فەرەنسیی کۆن و رووسیی کۆن پێگەیشتوون .

گشتێتیی خاك هەلومەرجی پێکەوە ژیانی خەڵکی هۆزی جیاوازی پێکهێنا و کولتووری گشتی و زمانی گشتی سازکرد . بەڵام بۆ دەرەبەگایەتی لەتەك دەوڵەتی گشتی و زمانی گشتیدا ، تایبەتێتی گەشەسەندنی زەویوزاری دەرەبەگایەتی و دیالێکتی ناوچەیی هەیە .

---

[٢١] ف . پ . فیلین ، پەیدابوونی زمانی رووسی و ئۆکراینی و رووسی سپی ، لێنینگراد ، ١٩٧٢ ، ل ٦٢٥ .

پێشتر پەنجەمان بۆ ئەوە ڕاکێشا ، کەوا سەدەکانی ١٠ - ١٤ لە فەرەنسا جیاوازییێکی گەورەی دیالێکت هەبوو . ئەو جیاوازییە هێندە بەرچاوبوو ، هەندێ تۆژەری وا لێکردبوو بە دوو میللەت (فەرەنسیی سەروو و ناوەڕاست) و (فەرەنسیی خواروو و ناوەڕاست) ناویان بەرن . ڕووسیی کۆن (سلاڤیانیی ڕۆژهەلاتی) خاوەنی تایبەتێتی دیالێکتی بوو ، کە ئەویش میراتی سەردەمی سلاڤیانییەکانی کۆن و دەمی دابەشبوونی خێلە سلاڤیانییە ڕۆژهەلاتییەکان بوو . لە ڕووخانی کیفەوە ، وەك شاری پایتەخت و گەشەسەندووی پێوەندیی دەرەبەگایەتی ، جیاوازی دیالێکتی پەرەی سەند ، بەتایبەتی لە خاکی گالیسکۆ - ڤۆلین و کیف و چێرنیکۆڤ و ڤلادیمیره - سوزدەل و پینسکۆ - تورۆڤ ... هتد . بۆ نموونە لە یادگارە نووسراوەکانی نۆڤگۆرۆدی کۆن و پسکۆڤی کۆندا ژمارەیێکی زۆری تایبەتێتی فۆنەتیکی و سیمانتیکیو لێکسیکی دیالێکتی بەرچاو دەکەوێ .

چارەنووسی دیالێکت و بەشە دیالێکتی ناوچەیی ، کە لە سەردەمی دەرەبەگایەتی و سەرەتای قۆناغی سەرمایەداریدا پەیدابوون ، جیاوازن . لە لایەکەوە ، کاتی شێوەی خۆشیان دەگۆڕن ، هەروەك دیالێکتی ئەو زمانە دەمێنێتەوە و ئەمەشمان لە نموونەی زمانی ئەڵەمانی و ڕووسیدا باس کرد . زمانی پێوەندی بەستن و لەیەکترگەیشتنی نێو تیرە و خێڵەکان هی مەڵبەندی ئابووری و ڕامیارییە و ئەو دیالێکتانەی دەوریان داوە وەك کەرەستەی زمانی میللی خۆیان دەنوێنن . دیالێکتی ڕۆما بناغەی زمانی لاتینییە .

دیـالێکتی فلۆرێنـت - هـی ئیتالیـیە ؛ دیـالێکتی کـارتلیی ڕۆژهـەڵاتی گورجستان – هـی گۆرجییـە ؛ دیالێکتی کازاخی – هـی تەتارییـە ... هتد . لە لایێکـی دییـەوە ، ئـەو دیالێکتـە ناوچەییانـەی لـە خزمـەتی جەماوەری میللەتدان ، دەتوانن ببنە بنکەی زمانانی جیاواز .

بۆ نموونە ، بەم چەشنە لەگەڵ هەندێ دیالێکتی زمانی ڕووسیی کۆندا ڕوویدا . بێگومان زمانە سلاڤیانییە ڕۆژهەڵاتییـەکانی ئـەمڕۆ زادەی ڕاستـەوخۆ و پێوەندیـی بـەردەوامیی زمانـانی خێـڵات و خـاکی دەرەبەگایـەتی نییـە ، بـەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا ، گومـان لـەوە نـاکرێ ، گشـتێتی هـــەرە کـۆن و تایبـەتێتی دیـالێکتی ، وەك خاسـیـەت لـە سەدەکانی ١٤ – ١٥دا پـەیدابووە و بڵاوبوونەتـەوە و ڕادەی جیـاوازیی سێ زمانی سـلاڤیانیی ڕۆژهـەڵاتی و دیـالێکت و بەشـە دیالێکتـەکانی پارێزراوە .

پەیدابوونی میللەتی ڕووس (ڕووسی مەزن) لەسەر خاکی سەرووی ڕۆژهـەڵاتی ڕووس بـەندە بـە دروسـتبوون و پتـەوبوونی دەوڵـەتی مۆسـکۆوە . ڕووسـەکانی بـاکوور و بەشـە دیالێکتـەکانی مۆسـکۆ و دەوروپشتی ڕووسەکانی ناوەڕاست، کۆمەڵێك خاسیەتی ڕووسەکانی باشووریان وەرگرت ، بەتایبەتی کردنـی (ۆ) بـە (ا) . بەشـە دیـالێکتی ڕووسی ناوەڕاسـت بـووە بناغـەی زمـانی ئاخـاوتنی میلليـی ڕووسـی مـــەزن ، کـەوا لەگـەڵ هیـچ دیـالێکتێکدا یـەك ناگرنـەوە و لـە زمـانی نووسینی کارگێڕی و کتێبە سلاڤیانییەکاندا کاری تەواوی نییە .

دروستبوونی میللەتی ئۆکراینی لەسەر خاکی خوارووی ڕۆژئاوای ڕووسا دەستی پێکرد – بەر لە هەر شوێن لە ناوچەی کیف . میللەتی ڕووسی سپی لەسەر خاکی سەرووی ڕۆژئاوای ڕووسیا سەری هەڵدا .

-٤-

## دروستبوون و گەشەکردنی زمانی نەتەوایەتی

لەگەڵ ئەوەشدا ، کە میللەتان و زمانی میللەتان تەنانەت لەم چەرخەشدا دروست دەبن ، بەلام لە هەمان کاتدا لە ولاتانی پێشکەوتووتردا زمانی نەتەوایەتی پێدەگا . چوونیەک نەبوونی گەشەکردنی زمانان لە جیهانی ئەمڕۆدا ، ئەنجامی جیاوازیی پێشکەوتنی ئابووری و ڕامیاریی ولاتانی جیاوازە . ئەمەش جارێکی دی نیشانی پێوەندیی هەمیشەیی زمان و میللەت ، زمان و کۆمەڵ دەدات .

ئەم یاسا گشتی‌یەی دروستبوون و گەشەسەندنی زمانی میللەت و زمانی نەتەوایەتی لە تایبەتێتی گشتی دی و گەلالە بوونیاندا ڕەنگدەداتەوە . دروستبوونی زمانی نەتەوایەتی بە هەمان چەشنی سازبوونی زمانی میللی بە سێ ڕێگادا تێپەڕیوە : ڕێگای گەشەکردنی کەرەستەی ئامادە ؛ ڕێگای جێگیربوونی دیالێکت ، ڕێگای تێکەڵبوونی دیالێکت و زمان . دیارە هەر ڕێگەیێك سەنگی خۆی هەیە لە جیاوازیی مێژوویی سەردەمی جیاوازدا . زمانێکی وا نی‌یە ، کە تەنیا ڕێگایێك بووبێتە هۆی دروست بوونی .

بـۆ نموونــە لــە دروســتبوونی میللــەتی ئینگلــیز و نەتــەوەی ئەمـەریکی‌دا پەنجـە بـۆ تیکـەڵبوونی نـەژاد ڕادەکێشـرێ . سـەرەتا لـە دورگەی بەریتانیای مەزن خێڵە کەلتی‌یەکان سەقامگیر بوون . لە نیوەی دووەمی سەدەی شەشەمدا خێڵە جەرمانی‌یە باکووری‌یەکانی ئانگل و ساکس و یـوت بەشـی زۆری دورگەکـەیان گرتـەوە و لـە ڕۆژئـاوا و باکوورەوە لە ویلز و سـکۆتلەندە تـەنگیان بـە کەلتی‌یـەکان هـەڵچنی . ساڵی ١٠٦٦ دەرەبەگـە نۆرمانی‌یـەکان چوونـە نـاو ئینگلتـەرەوە و زەوی‌وزاری خانەدانـە ئەنگلۆساکسـۆنەکانیان کـردە مڵکـی خۆیـان . دەسەڵاتی پادشایەتی و دەرەبەگی نەژادی جۆربەجۆر زۆر بەهێز بوو . دوو زمانیی چین و توێـژ دروسـت بـوو : جوتیـار و دانیشـتوانی شـار زمـانی زگمـاکی (ئینگلـیزی)یـان بـەکاردەهێنا و دیـالێکتی نۆرمـاندیی بـاکووری ناوەڕاسـتی زمـانی فەرەنسـی‌یش بـووە زمـانی نووسـین . زۆربــەیان هــەردوو زمانەکــەیان دەزانــی . دیــالێکتی لــەندەن لــە "چیرۆکــەکانی کێنتیــبری" (١٣٨٦ - ١٤٠٠)ی چۆســێردا ڕەنگــی داوەتـەوە . لـە زمـانی ئینگـیزیی ئـەمڕۆدا بەشـێکی زۆری وشـەکان خاوەنی بناغەی ڕۆمانین . جیابوونـەوە لـە خێڵـە جەرمانی‌یەکانی دی و بەیەکەوە ژیانی خێڵە جەرمانی‌یەکان لە ئینگلتەرە ، ئەنجامی نەك تەنیا پـەیدابوونی میللـەتی ئینگلـیز بـوو، بـەڵکو پـەیدابوونی زمـانی نوێـی جەرمانیی خزمیشی گرتەوە .

نەتـەوەی ئەمــەریکی لـە ئـەنجامی پێشـکەوتنی سـەرمایەدارێتی ئەمـەریکاوە پـەیدا بـووە . ئەمەریکایی‌یـەکان وەك میللـەت لـە ئـەنجامی

تێکەڵبوونی ئەو کۆچکردوانەی لە گەلێ وڵاتەوە هاتبوونە ئەمەریکا ، دروستبوو ، کە بنەچەکەشی ئەو یەکەم کۆلۆنیستانە بوون ، کە لە ئینلگتەرە و ئێرلەندە و سکۆتلەندەوە هاتبوون . کۆلۆنیستی یەت خەریکی جەنگی بێوچان بوو لەگەڵ هیندی یەکان و داگیرکردنی خاکیان و بەرەو ڕۆژئاوا ڕاونانیان و لەناوبردنیان . پەیدابوونی نەتەوەی ئەمەریکی واتای پەیدابوونی زمانێکی نوێ ناگەیەنێ : زمانی ئینگلیزی بوو بە زمانی نەتەوەیێکی نوێ . لە باری پلەی بەرزی گەشەسەندنی ئابووریدا یەکێتی ئەمەریکایی یەکان ساز نەبوو و ئەوەتە جیاوازیی داب و نەریت ، دوژمنایەتی و نەبوونی یەکسانیی نەتەوایەتی نێوان ئەوانەی لە وڵاتانی جیاوازەوە هاتوون؛ جیاوازیی نێوان ڕەگەزی ڕەش پێست و سپی پێست ...

خاسیەتی گشتی دووەم لە دروستبوونی زمانی میللەت و نەتەوەدا ، ئەوەیە زمانانی نەتەوایەتی بەپێی کاتی پەیدابوونیان و بەهێزبوونیان جیاوازن . گەشەسەندنی سەرمایەداری و پەیدابوونی نەتەوە لە ئەورووپا لای ئەو گەلانە دەستی پێکرد ، کە بە زمانانی هیند و ئەورپایی دەدوان . لە خۆرئاوای ئەورووپا ئەم پرۆتسێسە لەگەڵ دروستبوون و جێگیربوونی دەوڵەتی نەتەوایەتی ئینگلتەرە ، فەرەنسا ، ئیتالیا - دا جووت و هاوشانە . لە خۆرهەڵاتی دروستبوون و جێگیربوونی دەوڵەتانی گەورەی پێویست بۆ بەرگری کردنی وڵات لە هێرش و پەلاماردان ، پێش دروستبوونی نەتەوە کەوت و دواتریش هەر وڵاتێک بووە دەوڵەتی چەند نەتەوەیێک . لە

ئاسیا و سەروو و خوارووی ئەمەریکا و ئەفەریقا بوونی میللەتە سەرەکی‌یەکان بە نەتەوە ، کەوتە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەم .

لەنێوان پێکهاتنی زمانی میللی و زمانی نەتەوەیی‌دا جیاوازیی بنەڕەتی نی‌یە . تەنیا ئەوەندە هەیە لە ڕوانگەی مێژووەوە زمانی نەتەوەیی درەنگتر پەیدابووە و لە زۆریی وشەدا دەوڵەمەندترە و سیستەمی ڕێزمانی ڕێکوپێکترە . زمانی نەتەوایەتی لە مەسەلەی پێوەندیی گشتیی یاسا و سنووری زمان بە دیالێکتەکانی و بە فۆرمی ئەدەبی و نووسینەوە لە زمانی میللی جیادەبێتەوە .

زمانی میللی لەنێوان ماوەی (زمانی ئابووری و جەنگی‌و ڕامیاریی مەڵبەند) و (دیالێکتی خێڵ و ناوچەدا) خاوەنی جیاوازییێکی گەورە و دیارە (بەتایبەتی لە شوێنی دوور لە مەڵبەند بە دیالێکتی خۆیان دەئاخێون) . بەڵام لە ماوەی نەتەوایەتی‌دا چڕبوونی هەرێمی ئابووریی زمانی گشتی بەرەو بڵاوبوونەوە بە هەموو لایەکدا دەبات و جیاوازیی دیالێکتەکان دەسڕێتەوە .

شتێکی بەرچاوە ، شۆڕشی بۆرژوای فەرەنسا (١٧٨٩-١٧٩٤) کارێکی گەورەی لە گەشەسەندنی پێوەندیی سەرمایەداری سەرپاکی ئەورپا کردووە . لیژنەی نەتەوایەتیی هەڵبژاردن لە ڕووکردنە میللەتدا ڕێگەیێکی تایبەتی گرت ، ئەوەبوو خەڵکی بۆ تێکۆشان و نیشتمان‌پەروەری هاندەدا و داوای لە جەماوەر دەکرد "دیالێکێت وەک دوا پاشماوەی دەرەبەگایەتی و یادگاری کۆیلایەتی فڕێبدەن" .

جیاوازیی گەورەتری زمانی نەتەوایەتی لە زمانی میللی لەوەدایە ، کە زمانی نەتەوایەتی دەبێ زمانی ئەدەبی هەبێ و ئەو فۆرمی زمانی نووسینەش وابێ ، لە زمانی ئاخاوتنی خەڵکەوە نزیک بێ تا لە گشت شوێن بەئاسانی بڵاوبێتەوە . زمانی میللی دەتوانێ خاوەنی زمانی نووسین بێ ، کە بۆ کاری کارگێڕی و مەبەستی ئاینی کەڵکی لێ ببینێ . هەرچی ئەو زمانەشە ، کە بۆ مەبەستی پەرستن بەکاردێنرێ ، دەشێ زمانێکی بێگانە بێ . بەوێنە لە پۆڵۆنیا و لای کاثولیکەکانی ئەڵەمانیا زمانی کڵێسە ، لاتینی بوو . لە وڵاتەکانی سەر دەریای بەڵتیك و لای چیکی‌یەکان بە زمانی ئەڵەمانی بوو . لای گەلێ لە زمانە تۆرانێکان و ئێرانێکان - بە زمانی عەرەبی ... هتد .

زمانی گشتیی زارەکی یەکسەر گەڵاڵە نابێ و ماوەیێکی درێژ جیاوازیی دیالێکتی دەپارێزێ . بۆیە جێگر و نوێنەر و دیاردەی ڕاستیی زمانی نەتەوە بریتی‌یە لە زمانی ئەدەبی . لەم بارەدا پێویستە ئەوە لە بەرچاو بگیرێ ، کەوا بۆ زمانی نەتەوە هەر ئەوەندە پێویست نی‌یە ، کە زمانێکی ساکاری نووسینی هەبێ ، بەڵکو دەبێ خاوەنی زمانێکی ئەدەبی بەربڵاو و فرە ئەرك بێ . بەربڵاوی زمانی ئەدەبی و بەکارهێنانی بۆ بەجێ‌هێنانی ئەرکی جۆربەجۆریش ، بێ‌سیستەمی دیموکراتیانەی ڕووناکبیری و چاپکردن مەحاڵە .

بەو وتراوەدا دەردەکەوێ ، نەتەوە تەنیا لە هەل‌ومەرجی سەرمایەداری‌دا پەیدا دەبێ ، واتە کاتێ چڕبوونی هەرێمی ئابووری سەرهەڵدەدا و بازاڕی ناوخۆ ساز دەبێ و بۆ ئەمەش وەك ڤ . ئی .

لینین دەڵێ : "... پێویست بە چڕبوونی خاکی دەوڵەتە لەگەڵ ئەو دانیشتوانەی بە یەك زمان دەدوێن و هەموو ئەو جۆرە گیروگرفتانە وەلاوە بنرێن ، کە لە ڕێی پێشکەوتنی ئەم زمانەدان و زمانەکەش لە ئەدەبدا پتەو بکرێ"[٢٢]

پرۆتسێسی دروستبوون و پتەوبوونی نەتەوە و زمانی نەتەوایەتی لە ئەوروپا ، بەتایبەتی لە سەدەکانی ١٦ - ١٩دا خێرا و بە گوڕ دەڕۆیشت . بۆنموونەی ئەمە ، تەماشای دروستبوونی زمانی نەتەوایەتی لە فینلەندە دەکەین .

لە زەمانێکی یەکجار کۆندا لە خاکی فینلەندا دوو خێڵی (سووم) و (یام) ی ئوگرۆ - فینی هەبوون . نۆرمانە سویدی‌یەکان هێرشیان هێنایە سەریان و بەسەریاندا زاڵ بوون و خستییاننە ژێر دەسەلاتی پادشایەتیی سویدی‌یەوە . دواتریش کەوتنە ژێر دەستەلاتی ئیمپراتۆری‌یەتی ڕووسەوە . بەم جۆرە میللی‌یەتی فینلەندی و لەپاشیشدا نەتەوە لەسەر بنەچەی دەوڵەتی دراوسێ دروست بوون[٢٣] . دیالێکتی شاری (تورکو)ی پایەتەختی کۆنی فینلەندە بناغەی ئاخاوتنی زمانی فینلەندی‌یە . لە ناوەڕاستی سەدەی ١٦دا م . ئاگریکۆلا "ئامۆژگاریی نوێ"و هەندێ بەرهەمی دی ناوەڕۆك ئاینی وەرگێڕایە سەر زمانی فینلەندی . دەوری گەورە بۆ چەسپاندنی

---

[٢٢] ف . ئی . لینین ، سەرجەمی کارە کۆکراوەکانی ، ب . ٢٥ ، ل ٢٥٨ .

[٢٣] سەربەخۆیی و خۆ بەڕێوەبەرایەتیی فینلەندە ساڵی ١٩١٧ لەلایەن حکومەتی سۆڤیتی‌یەوە ددانی پێدا نرا و بە پەیمانی ساڵی ١٩٢٠یش پتەوکرا .

ئـەدەب و زمـانی نەتەوایەتی، داسـتـانی "کالیڤالا" (١٨٣٥ - ١٨٤٩)ی ئی . لیۆنرۆت بینی ، کە لە زمانی فینی و ئیژۆر[٢٤] و کارێلەوە تۆماری کردبوو . لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە بە زمانی فینلەندی بەرهەمی گەورە گەورەی ئەدەبیو زانستی بلاوکرایەوە ، زمانی ئەدەبیی فینلەندە تەنیا لە فینلەندە بەکارنایەت بەڵکو لە کارێلی سۆڤێتیش (لەتەك ڕووسیدا) زمانی خوێندن و نووسینە .

گەشـەکردنی نەتـەوە و زمـانی لـە هەلومـەرجی سیسـتەمی سـەرمایەداری و سۆشیالیستیدا بەشـێوەی جیـاواز دەڕوات . ئەگـەر سۆشیالیزم هەموو هەلومەرجێك بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی گشـت نەتەوەیێکی سوشیالیستی و زمانی بڕەخسێنێ ، ئەوە سـەرمایەدارێتی (بەتایبـەتی لـە دەوری ئیمپریالیسـتیدا) سیاسـەتی چەوسـانەوەی میللەتانی کەمپێشکەوتوو بەکاردێنێ و دەبێتە کۆسپ و تەگەرە لە ڕێی پێگەیشتن و گەشەکردنی نەتەوە و کولتوور و زمانیدا .

بۆیە ئیمپریالیزم لە دەمی پەیدابوونییەوە و لە ولاتـان خستنە ژێـر دەستی خۆیەوە ، بووەتـە هـۆی لـە دایکبوونـی بزووتنـەوەی خـەباتی نەتەوایـەتیی گـەلانی ولاتـانی ژێـر دەسـت . لـەنێو ئامـانجی ئـەو تێکۆشانانەدا : مافی خوێندن بە زمانی زگمـاك ؛ دیموکراتـی کردنـی زمانی نووسین و بیناکردنەوەی لەسەر بناغەی زمانی ئاخاوتنی میللەت (یاخود نزیککردنەوەی نووسین و زمـانی ئاخـاوتن ، لە حـاڵێکدا ئەگـەر

---

[٢٤] گەلێکی بچووکە لە ناوچەی لۆمۆنۆسۆڤ و کینگلێپ لە هەرێمی لێنینگراد دەژی . لە زوودا خاکیان سەر بە نۆفگۆرۆدی مەزن بوو (وەرگێڕ) .

زمانی ... ـێن هەبێ) ؛ یەکسانیی زمانان ... هەیە. ڤ . ئی . لینین نووسیوێتی : "دەوڵەتی دیموکراتی ، بێگومان دەبێ دان بە ئازادیی تەواوی زمانانی جیاوازدا بنێ و دژی هەموو جۆرە فەزڵدانی زمانێك بەسەر زمانی دیدا بووەستێ"[25] .

## ـ٥ـ
## دەستووری دەرەکی و ناوەکیی پێشکەوتنی زمان

هەموو ئەوەی پێشتر وترا ، ئەوە نیشاندەدا ، کە پێشکەوتنی زمان بە شێوەیێکی یەکجار توند و تۆڵ بە مێژووی کۆمەڵەوە بەندە ؛ بەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییەوەی تێیدا زمان بەکاردێنرێ و هەروەها بەو ئەرکە کۆمەڵایەتییەوەی زمان بەجێیاندێنێ . ف . پ . فیلین نووسیوێتی : "ئەرکە کۆمەڵایەتییەکانی زمان ، تەنیا بریتی نین لە پێکهاتنی نیسبی دەرەکی و پێوەندیی سیستەمی و رێك و رەوانیی پێشکەوتنی . پێویستە ئەوە بزانین ، کە زمان وەك پێکهاتن شتێکە و بەکارهێنانی لەکۆمەڵدا بەتەواوی شتێکی دییە"[26] .

---

[25] ڤ . ئی . لینین ، سەرجەمی کارە کۆکراوەکانی ، ب ٢٥ ، ل ٧١ _ ٧٢ .

[26] ف . پ . فیلین ، کێشەی بارودۆخی کۆمەڵایەتیی زمان چییە ؟ هەمان گۆڤار ، ١٩٧٥ ، ژ ٣ ، ل ٩ ، ف . ئا . ئەڤرۆرین ، بابەتی کۆمەڵایەتیی زمانناسی ، هەمان گۆڤار ، ١٩٧٥ ، ژ ٤ ، ل ١٧ .

باروبۆخی کۆمەلایەتی و سروشتی کۆمەلایەتیی گۆڕانکاریی زمان لە نموونەی زۆردا بەرچاو دەکەوێ . ئەوەتە پەیدابوونی شێوازی زمانی ئەدەبی دەبێتە هۆی پەیدابوونی وشەی هاوواتا و فۆرمی شێوەی شێوازی وشە و ڕێگای نوێی ڕۆنانی وشە . بەوێنە ، لە سەرەتادا دەنگی (ف) لە زمانی ڕووسیدا بەتایبەتی لەو وشانەدا هەبوو ، کە لە زمانی بێگانەوە وەرگیرابوون ، وەك : فیلۆسۆف ، فیڤرال (لە زمانی یۆنانییەوە) ... فەنار ، فۆرمە ... هتد ، بە تێپەڕبوونی کات ، دەنگی (ف) بوو بەوەی وەك شێوەی فۆنێمی نەتەوایەتیی (ڤ) خۆی بنوێنێ ... ئەو وشانە بوون ، کە لە زمانی بێگانەوە وەرگیرابوون . پاش ماوەیێك ژمارەی ئەو جۆرە وشانە زیادیکرد و وشەی ڕووسی چوونە پاڵیان .

سروشتی کۆمەلایەتیی گۆڕانکاریی زمان ، ئەوە ناگەیەنێ کەوا یاساکانی پێشکەوتنی زمان ، یاساکانی دیاردە کۆمەلایەتییەکانی دی یان دیاردەی سروشتی دووپات دەکەنەوە . بەپێچەوانەوە ، زمان وەك دروستبوونێکی تایبەتی چەسپی مێژوویی خاوەن یاسا و دەستووری پێشکەوتنی مێژوویی ، گۆڕانی حالاتی زمان و فۆرمی زمانی خودی خۆییەتی . ئەو خاسیەتە سروشتییانەی پێشکەوتنی زمان ناونرا یاسای پێشکەوتنی ناوەکیی زمان .

فۆرمی بنەرەتیی یاسای ناوەکیی پێشکەوتنی کەرەستەی زمان بریتییە لە یاساکانی فۆنەتیك و پرۆتسێسەکانی وشەسازی . ئەم

پێشکەوتنەی یاسا و دەستوورەکانی زمان لە لێکۆڵینەوەی بەراوردیی مێژوویی زماندا دۆزرایەوە و لە قاڵبی زانستیدا نیشاندرا .

گۆڕانی مێژوویی پێوەندی بە گشت ڕوویێکی سیستەمی زمان ـ دەنگەکان ، پێکهاتنی ڕێزمانی ، وشەکانی زمان ـەوە هەیە . لەگەڵ تێپەڕبوونی ڕۆژگاردا ئەو گۆڕانانە هێندە جێیان دیار دەبێ ، مرۆ ناچار بێ وەك دوو زمانی خزم باسیان بکات ، کە پێوەندیی مێژوویی پێکەوەی گرێدابن . لەم جۆرە پێوەندییانە ، دەتوانین زمانی گریکیی کۆن و بیزەنتی، لاتینی و ئیتالی ؛ گۆتی و ئەڵەمانی ، ڕووسیی کۆن و ڕووسیی نوێ ... بکەینە نموونە .

ئەگەر هەندێ یادگاری ئەدەبیی زمانی ڕووسیی کۆن و هەندێ بەرهەمی زمانی ڕووسیی نوێ لەتەك یەك دابنێین ، هێندە جیاوازییان لە نێواندایە ، کە لە دوو زمان بچن و تەنانەت یادگاری ئەدەبیی زمانی ڕووسیی کۆن بۆ نەوەی نوێ پێویستی بە وەرگێڕانە .

هەرچەندە زمانی ڕووسیی کۆن و ڕووسیی نوێ هەر یەك زمانە ، بەڵام لە نێوانیاندا جیاوازیی گەورە لە دەنگەکان و پێکهاتنی ڕێزمانی و وشەکانی زماندا هەیە .

پێشکەوتنی گرنگی سروشتیی مێژوویی زمان بریتییە لە درێژایی ماوەی پاراستنی بناغەی زمان ، ڕێك بەدوا یەکتردا هاتنی هەلومەرجی مێژوویی کۆن و نوێ لە دروستبوونی زمانانی خزمدا . چوونیەکی ڕەگی وشە ، مۆرفێم و یاسای فۆنەتیکی نێوان زمانانی خزم لە هەل وەرجی ئەمڕۆیاندا .

## فەسلی پێنجەم

# زمانی ئەدەبی

## -١-

## مەفهومی زمانی ئەدەبی

لە قۆناغی دیاریکراوی پێشکەوتنی کۆمەڵ و میللەتدا (بەتایبەتی لە دەوری دروستبوونی میللەت و بەتەئکید نەتەوە)دا زمانی ئەدەبی پەیدادەبێ و ئەرک دەبینێ . لێکۆڵینەوە لەبارەی زمانی ئەدەبی‌یەوە ، بێ‌گومان بەشێکە لە تیۆریی زمانناسیی ئەمڕۆ . توێژینەوە لە زمانی ئەدەبی بۆ یەکەمجار ڕاستەوخۆ لە کاری شیرینکارانی زمانی ئەدەبی ، بەنموونە وەك : دانتێ و لۆمۆنۆسۆڤ و ڕوستاڤێلی و ڕۆنسار....دا چەکەرەی دەرکرد . زمانی ئەدەبی بەتایبەتی لە زمانناسیی سۆڤیەتی‌دا بناغەی دامەزرا و چالاکانە گەشەی کرد .

زمانی ئەدەبی بریتی‌یە لە فۆرمی خۆشکراوی پێکهاتنی زمانی میللی یان زمانی نەتەوایەتیی ئەنجامی کاری مێژوویی . زمانی ئەدەبی وەك فۆرمی بەرزی زمان خاوەنی خاسیەتی دەوڵەمەندی وشەی

فەرهەنگی و ڕێکوپێکی پێکهاتنی ڕێزمانی (لەنێوانیاندا ڕێنووس ، خاڵبەندی ، دەستوور) و سیستەمی پێشکەوتووی شێوازە .

ف . پ . فیلین ، کاتێ خاسیەتە گرنگەکانی زمانی ئەدەبی دیاری کردووە ، نووسیویێتی : " بە بۆچوونی من ، لەنێو خاسیەتە زۆرەکانی زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆدا ، بەر لە هەر شت پێویستە ئەمانەی خوارەوە دەستنیشان بکرێن :

١ – توانستی دەربڕینی سەرجەمی ئەو زانیارییانەی لە گشت بوارێکی چالاکیی مرۆڤایەتی‌دا کەڵەکە بووە و هەمەکی واتایان ، کە زەمینەی تێکڕای مەیدانەکانی ئاخاوتن خۆش بکا .

٢ – پێویستیی بوونی گشتێتی‌ی کێش وەك نموونە بۆ هەموو ئەوانەی دەیزانن و بەکاری‌دێنن ، بێ بوونی پێوەندی بە باری کۆمەڵایەتی و پیشەیی و ناوچەیی‌یانەوە .

٣ – دەوڵەمەندیی شێواز شتێکی بنەڕەتی‌یە بۆ ڕاگەیاندنی یەك مەبەست بە شێوەی جۆر بەجۆر .[١]

## زمانی نووسین و زمانی ئاخاوتن

زمانی ئەدەبی دەقاودەق واتای "زمانی نووسین" دەگەیەنێ . لە زمانی لاتینی‌دا ( Littera ) بەمانای (نامە) دێ و ( Litterae )یش - (نووسین) . لە زمانانی دیشدا ، ئەم زاراوەیە جووت و هاوشانی

---

[١] ف . پ . فیلین ، لە بارەی پێکهاتنی زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆوە ، گۆڤاری "کێشەی زمانناسی" ، ١٩٧٥ ، ژ ٢ ، ل ٣ – ٤ .

لاتینی‌یەکەیە . بەوێنە لە ئەڵمانیدا (Schriftsprache ) – (زمانی نووسین) ؛ لە چیکیدا ( Spisovny jazyk ) – (زمانی نووسین)ە .

بەڕاستی زمانی ئەدەبی بە نووسین جێگیر دەکرێ و دەچەسپێنرێ . بەڵام یەکسانی کردنی مەفهوومی (زمانی نووسین) و (زمانی ئەدەبی) شتێکی ڕاست نی‌یە : ۱ ) هەموو نووسراوێکی تۆمارکراو زمانی ئەدەبی نی‌یە ؛ ۲ ) زمانی ئەدەبی تەنیا لە فۆرمی نووسیندا خۆی نانوێنێ ، بەڵکو لە فۆرمی ئاخاوتنیشدا دەردەکەوێ – واتە زمانی ئەدەبی خاوەنی دوو فۆرمە .

زمانی ئەدەبی – تەنیا زمانی نووسین ( بەرهەمی هونەری ؛ لێکۆڵینەوەی زانستی ؛ ڕۆژنامە و گۆڤار) نی‌یە ، بەڵکو زمانی ئاخاوتنی دەوڵەت و دەزگای کۆمەڵایەتی ؛ قوتابخانە و شانۆ ، ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیشە . زمانی ئەدەبی هەروەها لە کاروباری ڕۆژانە و پێوەندی و تێکەڵیی خێزانی‌دا بەکاردێ .

لەنێوان زمانی نووسین و زمانی ئاخاوتندا جیاوازیی شێواز و پێکهاتن هەیە . لەو حاڵەتانەدا ، کە لە نێوان نووسین و ئاخاوتنی زمانی ئەدەبیدا تەنیا جیاوازیی شێواز و ئەرکبینین بەدی دەکرێ ، نووسین پتر و وردتر خاسیەتی گوێ بە یاسادان و هەڵبژاردنی وشە و دارشتنی ڕستە دەدات .

جیاوازیی نێوان فۆرمی ئاخاوتن و نووسینی زمانی ئەدەبی دەشێ لەوەش زیاتر بێ . بەوێنە لە زمانی چیکیدا جیاوازیی نێوان زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین ئەوەندە زۆرە ، هەندێ لە زمانەوانان

وەك پێکهاتنی جیاواز تەماشای دەکەن ، واتە وەك - زمانی نووسینی چیکی و زمانی ئاخاوتنی چیکی . فر . تراڤنیچك لە پێشەکی کتێبی "ڕێزمانی زمانی ئەدەبی چیکی"دا ، بەتایبەتی ئەو باسە دێنێتە ناوانەوە ، گوایا "زمانیی ئەدەبی ئاخاوتن بەشی خۆی وا گرتووەتە خۆی، کە تایبەتی ڕێزمانی‌یە سەرەکی‌یەکانی دەچنە نێو کەرەستەی دەربڕینی زمانی ئەدەبیی گشتی‌یەوە ، یان ناچنە نێوی و گەلێ جار لە شێوەی پەراوێزدا دەردەکەون ."[٢]

جیاوازی فۆرمی ئاخاوتن و نووسینی گشتیی زمان دەتوانێ ببێتە هۆی ئەوەی لە لێکۆڵینەوەی زمانی زگماکدا (ئەمە وەك لەچین و ژاپۆن دەبینرێ) دەقی هەڵبژاردە بە دوو شێوە - نووسینی ئەدەبی و ئاخاوتن - بەکاربهێنرێ . جیاوازی لە نێوان ئاخاوتنی میللی و زمانی نووسیندا بەتایبەتی لە هندستان تەواو بەرچاوە . لە وڵاتە عەرەبی‌یەکاندا ئەو جیازای‌یە تەنیا لە وشەدا نی‌یە ، بەڵکو لە ڕێزمانیشدایە . بۆ نموونە ، لە زمانی نووسینی عەرەبی‌دا فۆرمی دۆخی ناو پتر پێڕەوی دەکرێ : (کتابُ) ؛ (کتاباً) ؛ (کتابٍ) ، بەلام لە ئاخاوتندا تەنیا فۆرمی (کتاب) بەکاردێنرێ .

## زمانی ئەدەبی و کێشی زمان

زمانی ئەدەبی بەرانبەر دیالێکت و تاکایەتی و فرەچەشنی دژ ڕادەوەستێ . ئەو دیالێکتە دژ بەرانبەر وەستاوانەش بە زمانی (گشتیی

---

[٢] فر . تراڤیچیك ، ڕێزمانی زمانی ئەدەبیی چیکی ، پراگ ، ١٩٥١ ، ل ٨ .

میللی) ، یان (گشتی) ناودەبرێن (لەگەڵ "Langue Commune" ی فەرەنسایی و "Gemeinspreche"ی ئەڵمانی‌دا بەراورد بکە) . زمانی ئەدەبی ، زمانی هەموو ئەوانەی بە زمانێك دەدوێن ، یەك دەخا و توند بەیەکیانەوە دەبەستێ . لە هەمان کاتیشدا لە کێشێکی ڕێکوپێك و ڕاست و پێویستدا خۆی دەنوێنێ .

پەسەندکردنی بەکارهێنانی دیالێکت تەنیا دەبێتە خاسیەتی بەهرەکی بۆچوون دەربارەی ڕاستی و ناڕاستی ؛ بێ‌هێزبوونی داخوازی ؛ زیادبوونی شێوە ؛ بەندنەبوون بە شێواز و هێڵی گەیەنەری ناوچەکان . زمانی ئەدەبی کێشدار و یاسادارە و لە فەرهەنگ و ڕێزمانی زمانی ئەمڕۆدا جێگیر کراوە .

کێشی زمانی ئەدەبی پتەو و خۆگرە . ل . ڤ . شێریا نووسیویێتی : "چیەتی (ماهیة) هەر زمانێکی ئەدەبی لە توێتکە گرتنی دایە ، لە چاولێکەری کردنیدایە" [٣] . کێشی زمانی ئەدەبی گشت جۆرە جیاوازیێکی زمان و سامانی شێوازی و دیالێکتی جۆربەجۆری و لادانی شێوەی پیشەگەری لەیەکێتی‌یێکی تەواودا یەك دەخا . بەم واتایە کێشی زمانی ئەدەبی بریتی‌یە لە زمانی گشتیی میللەت . بۆیە پتەوبوون و بڵاوبوونەوەی کێشی زمانی ئەدەبی دەبێتە کەرەستەی مشوورخواردنی تایبەتی‌ی کۆمەڵ .

دەوری قوتابخانە لە پتەوکردنی کێشی زمانی ئەدەبیدا مەزنە .

---

[٣] ل . ڤ . شێربا ، زمانی ئەدەبیی ڕووسیی ئەمڕۆ ، کارە هەڵبژاردەکانی باسی زمانی ڕووسیی ، مۆسکۆ ، ١٩٥٧، ل ١٢٦ .

کێشی زمانی ئەدەبی پەنا دەباتە بەر پەسەندکردنی بەکارهێنانی زمان ( واتە زۆری و بەردەوامیی وشە بەکارهێنان) و لایەنگیریی ئەو بەکارهێنانەی وشە لەلایەن دەستەی ڕووناکبیرانی کۆمەڵگەوە . لە ئایندەشدا ئەو دیاردە مێژوویی‌یە چەسپاوەی کێشی زمانی ئەدەبی دەگۆڕێ و لەچۆنەکی کۆنەوە بۆ چۆنەکی نوێ دەبزوێ .

کێشی ئەدەبی لە بواری نووسیندا پێڕەویی یاسا دەکات و پێوەی بەندە ، بەڵام لە هەڵومەرجی وتن و گۆڕینی وشە و ڕیزبوونی وشەدا پتر سەربەخۆیە . شێوەگۆڕی و هاوواتایی زمانی ئەدەبی دەکەنە کەرەستەی بەتوانای لەیەکترگەیشتن و دەربڕینی مەبەست .

ئەو کێشی ئەدەبی‌یەی بە بەربڵاویی بەکارهێنانی و سەرچاوەی بایەخداری بەرز (نووسەر ، بەڕێوەبەرانی دیاری دەوڵەت ، زانا و مامۆستا) پتەو دەبێ ، کار دەکاتە سەر پێشکەوتنی خودی زمانەکە . ئەو دوو لاگرایەتی سروشتی کێشی ئەدەبی‌یە (لە پراکتیکەوە وەرگیراوە و لە پراکتیکەوە ڕاگەیەنراوە) . لە لایەن م . ف . لۆمۆنۆسۆڤەوە باش لێکدراوەتەوە : (تێکچوونی ئاواز ؛ شێواندنی شیعر ؛ فەلسەفەی بێ‌بنچینە ؛ مێژووی ناهەموار ؛ یاسا و حوکمی بە گومانی بێ ڕێزمان . ئەگەرچی ئەمانە لە بەکارهێنانی گشتیی زمان لادەدەن ، بەڵام ڕێگەی بەکارهێنان نیشاندەری ئەو ڕاستی‌یەیە" [٤].

---

(٤) م . ف . لۆمۆنۆسۆف ، سەرجەمی کارە کۆکراوەکانی ، ب ٧ ، مۆسکۆ _ لینینگراد ، ١٩٥٢ ، ل٢٩٢ .

# زمانی ئەدەبی و زمانی هونەری ئەدەبی

لە پەسندکردن و وەرگرتن و بڵاوبوونەوەی کێشی ئەدەبی ، دەورەی گەورە دەکەوێتە سەر شانی نووسەران . بەوێنە مێژووی زمانی ئەدەبی ڕووسی بە بەرهەمی لۆمۆنۆسۆڤ و فۆنفیزین ؛ کەرەمزین و کریلۆڤ ، پوشکین و لێرمەنتۆڤ و گۆگۆل ؛ تۆلستۆی و نیکراسۆڤ و چیخۆڤ ؛ گۆرکی و مایکۆڤسکی و شۆلۆخۆڤ ... گەشە و باڵای کرد . نووسەران وەستای هونەری وشەن و نیشانی دەدەن ، چۆن زمانی میللەتەکەیان پێبگەیەنن و پەروەردەی بکەن ؛ چۆن سامانی ئەدەبی بەکاربهێنن .

ئەو دوو لاگرایەتی‌یە پێوەندی کێشی ئەدەبی (لەگەڵ داب و نەریت و زمانی ئاخاوتندا) لەلایەن ئا . س . پوشکینەوە هەستی پێکرا و بووە ڕابەری چالاکی‌یە کارەکی (پراکتیکی)یەکانی . ئا . س . پوشکین نووسیویێتی : " زمانی ئاخاوتنی خەڵکی ساکاریش هەروەها لیکۆڵینەوەی یەکجار قووڵ هەڵدەگرێ . ئەلفیێری لە بازاڕی فلۆرەنسا فێری زمانی ئیتالی بوو . خراپ نی‌یە ، ئەگەر جاروبار گوێ لە ئاخاوتنی پەروەرشی کڵێسەی مۆسکۆ بگیرێ . ئەوانە بە شێوەیێکی سەرنجڕاکێش بە زمانێکی پاراو و ڕاست دەدوێن"[٥] پوشکین ئەوەشی یادداشت کردووە ، کە "زمانی نووسین دەقیقە بە دەقیقە بەو

---

[٥] ئا . س . پوشکین ، سەرجەمی بەرهەمە کۆکراوەکانی لە (١٠) بەرگدا ، ب ٧ مۆسکۆ _ لینینگراد ، ١٩٥٨ ، ل ١٧٥ .

دەربڕینانەی لە ئاخاوتندا لەدایك دەبن ، دەبووژێنەوە ، بەڵام نابێ واز لەوە بێنێ ، کە لە ماوەی چەند سەدەیەکدا وەدەستی هێناوە . تەنیا بە زمانی ئاخاوتن نووسین – واتای زمان نەزانینە" .

نووسەران دەوری گەورەیان لە رەگداکوتان و بڵاوبوونەوەی کێشی ئەدەبیدا هەیە . ئەدەب لە ژیانی کۆمەڵایەتی‌دا هەندێ جار بیر بۆ ئەوە رادەکێشێ ، کە زمانی ئەدەبی – زمانی هونەری ئەدەبی بێت . بێگومان ئەمەش شتێکی راست نییە .

زمانی بەرهەمی هونەری وەنەبێ تەنیا ئاخاوتنی ئەدەبیی کێشدار بگرێتە خۆ ، بەڵکو شێوازی تاکایەتیی نووسەر و پاڵەوانانی چیرۆك (کە لەلایەن نووسەرەوە دانراون)یشیان تێکەڵ کراوە . شێوازی هونەریی دەق و قسەی بەشداران ئەگەرچی لە کێش لادانە ، بەڵام کەرەستەی رازاندنەوەی بەرهەمە . بۆ نموونە ، ئەوەتە (داڵگە) لە رۆمانی "کۆردەرە"ی مامۆستا خوسرەو جافدا دەڵێ : "بێناموس ، گەل .. ریامە گۆڕ باوك ئەو کەسە منی دایە شوی ... ئەڕا زینەگیم ... رۆڵە ... رۆڵە رۆڵە ئەڕاتان کەم ... چەند گلە وتم نان مەدزن ... " (ل ٧) ... "رۆڵە دەردتان بکەفێتە تەوق سەرم قەزاتان لە لێم کەفێت ئیلاهی" (ل ٨) ...

خوێنەر لە وتەکانی (داڵگە)دا هەست بە لادان لە کێشی زمانی ئەدەبی دەکا . ئەمە کە خاسیەتی کەسێتی (داڵگە) نیشان دەدا ، لە هەمان کاتدا دەبێتە بەڵگەی بوونی کێشی زمانی ئەدەبی . هەر لەم رۆمانەدا ، نووسەر نەك تەنیا لە گێڕانەوەی قسەی بەشدارانی

ڕۆمانەکەیدا ، بەڵکو هەندێ جار لە وتەکانی خۆشیدا و شە و دەستەواژە و یاسای ڕێزمانیی ناوچەیی بەکارهێناوە :"..... بە سکی برسی‌یەوە دەهاتین بە حاڵاو گلێر دەبووینەوە ... چاوی بێ ڕەمەقەوە ..." ( ل ٧) ... "بەتەمابووین ڕیشوی لە قولایی‌دا بچێنێ و چڵەکانی چووزەرە دەرکا و گەڵا دەربهێنێ و لەژێر سێوەری پڕوکڕدا منداڵە وردیلەکان کۆببنەوە" (ل ١٨٥) .

دووەم جیاوازیی زمانی بەرهەمی ئەدەبی و زمانی ئەدەبی لەوەدایە ، کەوا زمانی ئەدەبی تەنیا بریتی نی‌یە لە کەرەستەی هونەریی ڕەنگدانەوەی واقیع و بزواندنی هەست . زمانی ئەدەبی وەك ئامێری لەیەکترگەیشتن خۆی دەنوێنێ و هەروەها لە مەیدانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و زانستدا لە کاردایە . زمانی ئەدەبی ئەرکی زۆری هەیە و ئەمەش شێوازی زۆری زمانی ئەدەبی دروست دەکا ، کە بۆ بواری جیاوازی لەیەکتر گەیشتن و دەربڕینی پێوەندی بەستنی هەمەجۆر لەگەڕدایە .

زمانی نووسین ، جگە لە زمانی هونەری ئەدەبی ، خاوەنی شێوازی کارگێڕی و شێوازی زانستی‌یە . لە تێکەڵبوونی شێوازی زانستی و شێوازی هونەری‌دا ، شێوازی زانستیی بەربڵاو پەیدادەبێ و لە بەیەکگەیشتنی شێوازی کارگێڕی و شێوازی هونەری‌دا ، شێوازی ڕۆژنامەگەریتی پێکدێ .

- ٢ -

## زمانی ئەدەبیی بەر لە نەتەوایەتی و زمانی ئەدەبیی نەتەوایەتی

وەك پێشتر باسمان کرد ، زمانی میللی دەتوانێ فۆرمی ئەدەبی - نووسینی هەبێ . پێشکەوتنی یەك دەوڵەتی و کولتووری ، پێویستی بە زمانی نووسینە . بەم جۆرە زمانانی ئەدەبی - نووسین لە کۆمەڵگای خاوەن کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی و سەرمایەدارێتی و سۆشیالیستیدا پەیدا دەبن .

دەکرێ زمانی یۆنانیی کۆن و زمانی لاتینی بکرێنە نموونەی ئەدەبی - نووسین ، کە لە کۆمەڵگەی خاوەن کۆیلایەتیدا پەیدابوون .

میللەتی یۆنانیی کۆن لەسەر بنەچەی یەککگرتنی سێ خێڵ - ئیۆنی ، دۆری ، ئیۆلی - پەیدابوو . دواتر دیالێکتی خێڵی ئیۆتی ، کە ئەتیکی بوو پێشکەوت . کاتێ لە سەدەکانی ٧ - ٦ی پ . ز . دا شار و دەوڵەت پەیدابوون ، ئەتینا بووە مەڵبەندی سیاسی و ئابووریی ئەتیکی . لەسەر بناغەی دیالێکتی ئەتیکی لە سەدەکانی ٧ - ٦ی پ . ز . دا زمانی ئەدەبیی یۆنانیی کۆن پێشکەوت . زمانی داستانی قارەمانێتی "ئیلیادە"و "ئۆدیسە" بووە زمانی ئەدەبی . زمانی داستانەکانی هۆمیرۆس لە ماوەی دوو هەزار ساڵدا زمانی سەرجەمی داستانی قارەمانێتی یۆنانی بوو .

پاش جەنگی نێوان یۆنان و فارس ، ئەتینا بووە پێشڕەوی گشت یۆنان . ئەدەبی ئەتینا لە سەدەی (٥) ی پ . ز . دا لە هەلومەرجی

دیموکراتیی کۆندا پەیدابوو ، کە بەر لە هەر شت لە شێوازی تراجیدی ئیسخولۆس ، سۆفۆکلێس ، یڤریپیێد و کۆمیدی ئەرسیتۆڤانیس و پەخشانی هیرادۆت ، پلاتۆن ، هیپۆکرات و ڕەوانبیژیی دیمۆسفین ...دا خراوەتە ڕوو .

دوای هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنی ، زمانی یۆنانیی کۆن بووە زمانی گشتیی هەموو جیهانی هیللینی (لە سەدەی ٣ی پ. زایینەوە تا سەدەی ٢ی ز.) ، دواتریش لە سەدەکانی ٥ - ١٠ی زاییندا بووە زمانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی . زمانی ئەدەبیی یۆنانیی کۆن ، هەروەها کاری کردە سەر پێشکەوتنی گەلیّ لە زمانەکانی ئەوروپا و لە ناویاندا زمانی ڕووسی . هەر بەو جۆرەش دەوری لە گەشەسەندنی زاراوەی زانستیدا بینی .

میللەتی لاتین و زمانەکەی لە ڕێبازی داگیرکردنی (کە لە ناوەڕاستی سەدەی ٧ی پ. زایینەوە دەست پیّدەکات) کۆماری ڕۆمای ئیتالییەوە پەیدابوو . بنکەی دیالێکتی بووە زمانی خێڵە لاتینییەکان و زمانە ئیتالییەکانی دی (ئۆك ، ئومبر) . هەرچی خێڵە نائیتالییەکانی (ئێترو، گالل)ە تەنگیان پیّهەڵچنرا .

ستسیپۆن ئەدەب وەك کەرەستەی کارگەیی ئیدیۆلۆژی ڕێك دەخا . ڕێگەی وشەی مردە و سەر بە دیالێکت نادا بچنە نێو زمانی ئەدەبییەوە . ئی . م . ترۆنسکی نووسیویّتی : " دەربارەی هەست کردن و هێزی کار بۆ کێشدانانی زمان ، لەتەك پراکتیکی ئەدەبی ، ئەو ڕاستییەش شاهیدی دەدا ، کەوا نزیکەی گشت نووسەرانی دیاری

سەدەی (٢)ی زاینی ڕۆما لەو ڕایەدا بوون ، پێویستە تا ڕادەیێك لە مەسەلەی تیۆریی زمانیشدا ڕەنگ بداتەوە . نووسەرانی زووی ڕۆما لە هەمان کاتدا ڕێزماننناسیش بوون" [٦] . لە سەدەکانی (٢ – ١)ی پ . ز . دا لە سەدەی زێڕینی ئەدەبی ڕۆمادا، کۆمیدیای پلاْڤت و پەخشانی تیزار و داستانی ڤێرجیلیوس نووسراون...

کەوتنی ئیمپراتۆرییەتی ڕۆما بووە هۆی دروست بوونی زمانە ڕۆمانییەکان (لە سەدەی ٨ – ٩)دا . زمانی لاتینی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەردەوامیی بوونی تەنیا لە فۆرمی زمانی نووسینی کلێسە و زانست و یاسا و پزیشکیدا نەبوو ، بەڵکو وەك زمانی ئاخاوتنی ئایینداران و زانایان و پارێزەران و فەرمانبەران و پزیشکان ...یش بوو . لاتینیی سەدەکانی ناوەڕاست زۆر لە زمانی لاتینیی قۆناغی کۆن جیاواز بوو . لاتینی وەك زمانێکی مردوو تا ئەمڕۆش لە خواپەرستیی کاتۆلیکەکان و پزیشکی و هەندێ زانستی سروشتیی دیدا بەکاردێنرێ . زمانی لاتینی هەروەك زمانی یۆنانیی کۆن ، کارێکی گەورەی کردە سەر پێشکەوتنی زمانە ئەورووپاییەکان و زاراوەی زانستی .

دروست بوونی زمانی ئەدەبیی نووسین لە کۆمەڵگای دەرەبەگایەتیدا ، دەکرێ بە نموونەی زمانی نووسینی ڕووسیی کۆن و

---

[٦] ئی . م . ترۆنسکی ، لەبارەی مێژووی زمانی لاتینییەوە ، مۆسکو _ لێنینگراد ، ١٩٥٣ ، ل ١٨٥ .

ڕووسیی ناوەڕاست ، فەرەنسی ئینگلیزی ، ئەڵەمانی لەگەڵ میللی‌یەتیاندا نیشان بدرێ .

میللەتی ڕووسی کۆن خاوەنی زمانی نووسین بوو . زۆربەی نووسینەکانیشی بریتی بوون لە بەرهەمی شێوە ئاینی و لە نووسینی کارمەندیی "ڕاستیی ڕووسی"دا بڵاوبووبوونەوە . ئەم بەڵگانەش لەلایەن پسپۆڕانەوە بە جۆری جیاواز لێک دراونەتەوە : ئا . ئا . شاخمەتۆف لە ڕوانگەی دەستەڵاتی نەریتی نووسینی کڵێسەی سلاڤیانی‌یەوە تەماشای مەسەلەکەی کردووە و سەبارەت بنەمای بەڵگاریی کۆن لە زمانی ئەدەبیی ڕووسیی کۆندا دواوە ، کەوا لە ڕەوتی پێشکەوتنی مێژوویی‌دا بە ڕووسی کراوە . س . پ . ئۆبنۆرسکی بە پێچەوانەوە باسی بنەمای ئاخاوتنی میللی زمانی ئەدەبیی ڕووسیی کۆنی کردووە ، کە لە کۆتایی سەدەی ١٤ەوە (واتە لە دەمی دووەم کارتێکردنی سلاڤیانی باشوورەوە) کەوتووەتە تاقی‌کردنەوەی کارتێکردنی زمانی کڵێسەی سلاڤیانی کۆن .

لەنێو ئەو بیروڕا نێوان ئاسمان و ڕێسمانەدا ، هەروەها بیرۆکەیێکی دی هەیە ، کە دەڵێ : لە ڕووسیای زوو دوو زمانی نووسینی ئەدەبی هەبوو – کڵێسەی سلاڤیانی (زمانی سلاڤیانی کۆنی ڕووسی) و ڕووسیی کۆنی تایبەت (بە شێوەیێکی سەرەکی زمانی ئەدەبی کارگێڕی) . ف . پ . فیلین لایەنگیری ئەم تیۆری‌یەیە و دەڵێ : " هەر لە سەرەتای نووسینەوە ، لەنێوان ئەو دوو زمانەدا پرۆتسێسی ئاڵۆزی کارلەیەکترکردن ڕووی‌داوە . لە "داستانی کاتەکانی ساڵ" دا و

ساڵنامەی "وتە لەبارەی ئیگۆری سەرکردەوە" ؛ "نوێژ و پاڕانەوەی دانیێل زاتۆچنیک)دا گەلێ نەژادی نموونەی ڕەسەنی داستانی شکۆمەندیی سوپا و جۆری دی تەواو تێکەڵبووی ڕووسیی کۆن و کڵێسەی سلاڤیانی بوونەتە سەرەتای جۆرێکی نوێی زمانی ئەدەبی و داڕشتەی زمانی شیعری . ئەم ڕێڕەوەی زمان لە سەدەکانی ١٠ - ١١ تا سەدەی ١٨ وەك هێڵێکی سووری چالاکیی زمانی باووباپیران ، دەمێ بە بەرزی و بەهێز ، دەمێکیش بە نشێوی و نزمی تێپەڕیوە و زەمینەی بۆ زمانی ئەدەبیی ڕووسیی هاوچەرخ خۆشکردووە[٧] .

دروستبوونی زمانی ئەدەبیی فەرەنسیی‌یش بە هۆی چەند هەلو مەرجی مێژوویی‌یەوە : سەرکەوتن بەسەر ئینگلستان‌دا لە شەڕی سەد ساڵەدا ؛ یەککگرتنی هەرێمەکانی لە کۆتایی سەدەی پازدەیەمدا ؛ بەدوا ئەمانەشدا جێگیربوون و پتەوبوونی مەڵبەندی دەوڵەت و شانبەشانیشی گەشەسەندنی کولتوور تێیدا . ساڵی ١٥٣٩ ئۆردۆنانس فرانسیسکای یەکەم فەرمانی بەکارهێنانی زمانی فەرەنسی لە دادگاکان و دەزگا کارگێڕیی‌یەکان دا . ساڵی ١٥٤٩ ژ . دێو بێللی بەیاننامەی "پارێزگاری و پەرەپێدانی زمانی فەرەنسی"ی بڵاوکردەوە . خۆی و پ . ڕۆنسار بە زمانی فەرەنسی شیعریان نووسی . لە هەمان کاتدا ڕۆمانی "گارکەنتیوا و پانتەگرۆئێل"ی فرانسۆ ڕابلێ بڵاوکرایەوە . لێرەدا زمانی فەرەنسی بە هەموو شەوق و

---

[٧] ف . پ . فیلین ، سەبارەت ڕیشەی زمانی ئەدەبی ڕووسی ، گۆڤاری "کێشەی زمانناسی" ، ١٩٧٤ ، ژ ٣ ، ل ١٢ - ١٣ .

هەمەڕەنگی‌یەوەی دەرکەوتووە . لە سەدەی دواتر (لە ساڵی ١٦٣٥)دا ئەکادیمیای فەرەنسی دامەزرا ، کە دەبوو فەرهەنگ و ڕێزمانی فەرەنسی بنووسێ .

پەیدابوون و پێشکەوتنی زمانانی ئەدەبیی قۆناغی نەتەوایەتی لە دەمی جیاواز و هەل و مەرجی جیاوازی دروستبوونی خودی نەتەوەدا ، بە شێوەی جیا ڕوودەدات . پێویستە دوو ڕێگەی بنەڕەتیی دروستبوونی زمانی ئەدەبیی قۆناغی نەتەوایەتی جیابکەینەوە : پێشکەوتنی زمانێکی ئەدەبی ، کە هەبووە و یەکبوونی لەگەڵ زمانی ئاخاوتنی میللیدا . لە لایەکی دی‌یەوە سازدانی زمانی ئەدەبیی پەیدابووی میللەتێك ، بۆ زمانی ئەدەبی نەتەوەییکی دی .

مێژووی زمانی ئەدەبی ڕووسی و فەرەنسی و ئیتالی و سێربە کرواتی ... دەتوانن ببنە نموونەی دروستبوونی زمانی ئەدەبیی نەتەوە لەسەر بناغە و کەرەستەی ئەو زمانی ئەدەبی‌یەی پێشتر لە ئەنجامی گەشەسەندنی میللی‌یەت بۆ نەتەوەدا هەبووە . لەم ڕەوتی پێکهاتن و چوونیەك بوونی کێشی ئەدەبی دەکەوێتە کۆششی دیموکراتی کردنی و ئەرکی زۆر پی‌دانی ! لەیەك نێزیكخستنەوەی زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین ... شتێکی ئاسایی‌شە ، لەو بارودۆخانەدا ڕەوتی چەسپیوی دروستبوونی کێش و بەکارهێنانی دەشێ جیاواز بێ .

دروستبوونی نەتەوەی ڕووس لە کۆتایی سەدەی (١٧)ەوە دەستی‌پی‌کرد . ئەم پرۆتسێسە بەتایبەتی لە نیوەی دووەمی سەدەی

هەژدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمەوە تیژڕەو بوو . لەو ماوەیەدا ڕێزمان نووسرا و فەرهەنگ دانرا ؛ ئەدەبی ڕووسیی مەزن و شێوازی جۆربەجۆری زمانی ئەدەبی خۆی گرت .

لە دروستبوونی زمانی ئەدەبیی ڕووسی قۆناغی نەتەوایەتیدا م . ڤ . لۆمۆنۆسۆڤ ، ئا . پ . سۆمارۆکۆڤ ، د . ئی . فۆنڤیزین ، ن . م . کەرەمزین ، ئا . ئی . کریلۆڤ، ئا . س . گریبۆیێدۆڤ ، ئا . س . پوشکین ، م . یو . لێرمۆنتۆڤ ، ن . ڤ . گۆگۆل ، ڤ . گ . بیلینسکی ... دەوری گەورەیان بینی . بەتایبەتی دەوری چالاکی پوشکین زۆر مەزنە و هەر بۆیەش پوشکین بە ڕۆنەر و سازکەری زمانی ئەدەبیی قۆناغی نەتەوایەتی ناودەبرێ .

ن . ڤ . گۆگۆل نووسیویێتی : " لە ناوهێنانی پوشکیندا ، یەکسەر وێنەی شاعیری نەتەوەیی ڕووس دێتە پێش چاو . بەڵێ لە شاعیرانی ئێمە کەس لەو بەرزتر نییە و کەس نەیتوانیوە لەو نەتەوایەتیتر بێ . ئەو مافە هی ئەوە و دەمەتەقێی لەسەر نییە .

بەرهەمەکانی بوونەتە فەرهەنگی سەرپاکی سامانی وشە و هێز و توانست و لەباریی زمانەکەمان . ئەو پتر لە هەموان ، دوورتر لە گشت سنووری فراوانکردووە و دەوروبەری نیشان داوە"[8] .

مەکسیم گۆرکیش وتوویە: "گەل ڕۆنەری زمانە . دابەشکردنی زمان بەسەر ئەدەبی و میللیدا تەنیا ئەوە دەگەیەنێ ، کە ئێمە خاوەنی

---

[8] ن . ڤ . گۆگۆل ، سەرجەمی بەرهەمە کۆکراوەکانی ، ب ٨ ، مۆسکۆ ، ١٩٥١ ، ل ٥٠ _ ٥١ .

زمانی (خاو) و زمانی شەنوکەوکراوی وەستایانین . یەکەم کەس ، کە لەمە باش تیگەیشت پوشکین بوو و هەر ئەویش بۆ یەکەمجار چۆنێتی بەکارهێنانی کەرەستەی ئاخاوتنی میللی و پێویستیی لە کەودانی نیشان داوە" [٩].

زمانی ئەدەبیی ڕووسی لە درێژایی سەدەی نۆزدەیەم و سەرەتای سەدەی بیستەمدا لە گەشەسەندندا بەردەوام بوو ، بەتایبەتی دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ئۆکتۆبەری سۆشیالیستیی مەزن، تەواو گوڕی دایە خۆ ... بەڵام ئەو سێ بنەمایەی پوشکین بۆ کێشی زمانی ئەدەبی خستبوویە بەرچاو، وەك ماکی هێزی بەپێزی ئەو کێشەیە هەر ماونەتەوە : ١) زمانی ئاخاوتنی میللەت شایستەی گرنگی پێدانە ؛ ٢) تەنیا بە زمانی ئاخاوتن - نووسین - واتای زمان نەزانین دەگەیەنێ ؛ ٣) چێژی ڕەسەن بریتی نییە لە ڕەتکردنەوەی بێلێکدانەوەی وشەیێك یان دەربڕینێك ، بەڵكو لە هەستی گونجاو و هاوتایی و هاوسەنگی دایە .

رێگەیێکی دی دروستبوونی زمانی ئەدەبیی نەتەوە ، دەکرێ لە نموونەی بەکارهێنانی زمانی ئەدەبیی ئینگلیزی و ئیسپانی لە دەرەوەی ئینگلستان و ئیسپانیا تەماشا بکرێ . بە هەمان چەشنیش زمانی عەرەبی لە جەزایر و مەغریب و میسر و هەندێ وڵاتی دیدا .

بڵاوبوونەوەی زمانی ئینگلیزی لە سەدەی حەڤدەیەمدا دەستی پێکرد . ئەویش لە ئەنجامی چوونی ئینگلیز بوو بۆ باکووری

---

[٩] ئا . م . گۆرکی ، کارە کۆکراوەکانی لە ٣٠ بەرگدا ، ب ٢٤ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٣ ، ل ٤٩١ .

ئەمەریکا و داگیرکردنی . لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا گەلی ئەمەریکا دەستی کردە شەڕی ئازادبوون لە ئینگلستان . لە سالی ١٧٧٦دا بانگی ئازادی و دامەزراندنی حکومەتی سەربەخۆی ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا درا . زمانی ئینگلیزی کرا بە زمانی دەولەت و بوو بە زمانی ڕشتەی سیاسەت و فەلسەفە ؛ زانست و هونەری ئەدەبی - زمانی مارك توین و تیۆردۆر درایزەر و جاك لەندەن . بەم چەشنە دوو نەتەوەی خاوەنی زمانی ئینگلیزی (ئینگلیز و ئەمەریکی) پەیدابوو ؛ بە دوو شێوە زمانی - ئینگلیزی (ئەمەریکایی و بەریتانی) هاتە کایەوە . ئەو دوو شێوە (British English) و (English American)ی تاکە زمانێك ، کە خاوەنی ماکی گشتیبن ، نەك تەنیا لەباری چەندێتییەوە ، بەلکو لە ڕووی ئەرکی واتاگەیاندنیشەوە ماکی جیاوازیان بۆ پەیدا بوو" [١٠] .

بەکارهێنانی زمانی ئیسپانی وەك زمانی دەولەت و ئەدەبیی گەلانی ئەمەریکای لاتینی (جگە لە بەرازیل و گایتی ، کە زمانی پورتوگالی و فەرەنسی ئەو ئەورەیان تێدا دەبینین) پتر بەلگەی بەرچاوە . زمانی ئیسپانیی ئەمەریکا - کۆمەلێ شێوەی ئیسپانییە ، کە دیسان بوونەتە زمانی دەولەت و ئەدەبی چەند نەتەوەیێکی پێشکەوتوو ، وەك : مەکسیکی ، ئەرجەنتینی ، کۆلۆمبی ، کووبی ، فەنزوێلی .

[١٠] ئا . د . شفێیتسێر ، زمانی ئەدەبیی ئینگلیزی لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا و ئینگلستان ، مۆسکۆ ، ١٩٧١ ، ل ١٩٠ .

گ . ڤ . ستیپانۆڤ نووسیویتی : " شێوەی هەمەجۆری زمانی ئیسپانیی ئەمەریکا ، بە هەمان چەشنی زمانی خودی ئیسپانیا لە دوو فۆرمدا ئەرك دەبینێ : ئاخاوتن و نووسین . فۆرمی ئاخاوتنی شێوەی ئەمەریکایی زمانی ئیسپانی پێکهاتووە لە یەککەوتنێکی ئالۆزی دابەش بوو بەسەر دیالێکت و بەشە دیالێکتدا ، دەر لە کێشی زمانی ئەدەبی . زمانی نووسینی ئەمەریکایی (زمانی ئەدەبی) ، لەتەك هەموو هاوشانییێکی لەگەڵ زمانی ئەدەبیی ئیسپانیدا ، بەڵام هێشتا یەکێتی تەواو پێك ناهێنێ . کارلەیەکترکردنی زمانی ئاخاوتن و زمانی نووسین لە هەر وڵاتێکی ئەمەریکای لاتینی بووەتە هۆی ئەوەی لە ماوەی چەند سەدەیەکدا لەو وڵاتانە کێشی تایبەتی خۆیەکی زمانی ئەدەبیی ڕاست ساز ببێ"[٢٠] .

- ٣ -

## زمانانی پێوەندیبەستن و لەیەکترگەیشتنی نێونەتەوەیان و نێودەوڵەتان

لەو ژمارە یەکجار زۆرەی زمان و دیالێکت ، نزیکەی (٣٠٠)یان خاوەنی نووسینن و وەك وەسیلەی هێڵی گەیەنەری جەماوەر بەکار دێنرێن . لە نێوانیاندا نزیکەی (٢٠٠) زمانیان لە خزمەتی میللەتی پتر لە ملیۆن کەس دایە .

ئەو زمانانەی ئەمڕۆ پتر بڵاوبوونەتەوە ، ئەمانەن [١١] :

| زمان | ژمارە | ژمارەی ئەوانەی پێی دەدوێن (بە ملیۆن) | ڕادەی سەنگ (بە ٪) |
|---|---|---|---|
| چینی | | ٦٩٠ | ٢٢,٢ |
| ئینگلیزی | | ٢٩٠ | ٩,٤ |
| ڕووسی | | ٢٥٠ | ٨,١ |
| ئیسپانی | | ١٨٠ | ٥,٨ |
| هیندستان (هیندی و ئوردو) | | ١٨٠ | ٥,٨ |
| ژاپۆنی | | ١٠٠ | ٣,٢ |
| ئەڵەمانی | | ٩٠ | ٢,٩ |
| عەرەبی | | ٩٠ | ٢,٩ |
| پرتوگالی | | ٩٠ | ٢,٩ |
| فەرەنسی | | ٦٠ | ١,٩ |
| ئەوانی دی | | ١٠٨٠ | ٣٤,٩ |
| ئەنجام | | ٣١٠٠ | ١٠٠ |

(١١) ئەو زمانانەی ئاخێوەرانی ١٠ ملیۆنێك كەس بن ، بەپێی "ئەتڵەسی میللەتانی جیهان" (١٩٦٤) ژمارەیان لەسەر ڕووی زەمین ٣٠٦٨,٤٧ ملیۆنە .

پێویستە ئەوە یاداشت بکرێ ، کە ژمارەی ئاخێوەران بە زمانێك و ژمارەی نەتەوەی خاوەنی ئەو زمانە وەك یەك نییە ، بەتایبەتی بۆ زمانی ئینگلیزی و ئیسپانی .

دیارە لەو حاڵەتەدا ، کە تاکە زمانێك چەند میللەتێك دەگرێتە خۆ ، شێوەی نەتەوەیی ئەو زمانە پەیدا دەبێ و هەروەها تەواوی دانیشتوانی ئەو شوێنە ناگرێتەوە ، کە ئەو زمانە دەبێتە زمانی نووسینی ئەدەبی (یاخود وەك هەندێ جار دەوترێ : زمانی دەوڵەت) . بۆ نموونە سکۆتلەندییەکان لە کۆندا بە زمانی سکۆتلەندی (یان گێلی) دەئاخاوتن ، کە سەر بە گرووپی کەلتی بوو . لە سەدەی نۆیەمدا ، دوای تێکەڵبوونی پادشایەتیی پیکت و ئیرلەندە ، زمانی سکۆتلەندی زمانی سەرانسەری وڵات بوو . ئێستا زمانی سکۆتلەندی وەك دیالێکتێك ماوەتەوە و وازی لە مافی خۆی بۆ زمانی ئینگلیزی هێناوە .

مەکسیکییەکان وەك میللەت لە ئەنجامی تێکەڵبوونی ئەو ئیسپانییانەی بۆ مەکسیك هاتبوون لەگەڵ دانیشتوانی هیندیی ناوچەکەدا ، پەیدابوون . بەڵام تەنانەت ئێستاش نزیکەی ۳ ملیۆن هیندی ماوە ، کە بە زمانی زگماکی خۆیان قسە دەکەن .

بەو چەشنە ، لەپاڵ ئەو زمانانەی زۆر بڵاوبوونەتەوە ، زمانی ئەوتۆش هەیە کەم پەلیان هاویشتووە . ئەم زمانانەش لە خزمەتی میللەتانی خۆیاندان – زمانی خێڵێك یان میللەتێکی بچووکن . تەنانەت زمانی دوو یان یەك گوندیش هەیە . بەوێنە لە داغستان ، هی دوو

گوندی ، وەك زمانی بۆتلیخی (زمانی دانیشتوانی گوندی بۆتلیخ و میارسووە) . هی یەك گوندی ، وەك زمانی گینوخی (زمانی گوندی گینوخی ناوچەی سینتینە) : ئێستاکە سەرپاکی گینوخەکان نزیکەی دوو سەد کەسێك دەبن و زمانی سیزس باش دەزانن . زۆریشیان فێری ئاڤاری بوون ، کە زمانی خوێندن و قوتابخانە و ژیانی کۆمەلایەتی یانە .

دەوری کۆمەلایەتی زمان کاتێ پێدەگا و گەشەدەسێنێ ، کە فۆرمی نووسین و ئەدەبی هەبێ . بلاوبوونەوەی تەنیا لە ئەنجامی پێوەندیی ڕاستەوخۆوە (بە شێوەیێکی بنەڕەتی لە کاری بازرگانییەوە) دەست ناکات بە هاتنەدی ، بەلکو یاریدەی کتێب و لەم سەردەمەی ئێمەشدا ڕادیۆ و تەلەفزیۆنیش دەوری گرنگ دەبینن .

بلاوبوونەوەی زمان ئەرکی نوێ بۆ زمان پەیدا دەکا . وەك پەیدابوونی زمانی پێوەندی بەستنی نێونەتەوەیی و زمانی جیهانی ، کە دەوری زمانی پێناو (وسیط) دەبینن .

زمانی لەیەکترگەیشتنی نێونەتەوەیی ، بەو زمانە دەوترێ ، کە وەك وەسیلەی پێوەندیبەستنی کەسانی نەتەوە ، یان میللەت ، یان نەژادی جیاواز بەکاردێنرێ . پێویستی بوون بە زمانی پێوەندیبەستنی نێونەتەوەیی لە ئەنجامی پێوەندیی هەمیشەیی گەلانەوە دێتە مەیدان ، بەتایبەتی لەو دەولەتانەی لە یەکگرتنی چەند نەتەوەیێك پەیدابووە .

دوو زمانی و پەیدابوونی زمانی ناوچەیی نێونەتەوەیی دەشێ لە نموونەی زوودا نیشان بدرێ . ئەم پرۆتسێسە ئێستا چالاکتر لە کاردایە . بۆ نموونە ، زمانی ئاکووتی وەك زمانی لەیەکتر گەیشتنی نێوان ئاکووت و ئێڤینك و ئێڤین خۆی دەنوێنێ . زمانی لەیەکترگەیشتنی ناوچەیی گەلانی داغستان ، زمانی ئاڤاری‌یە . زمانی گورجی وەك زمانی لەیەکترگەیشتنی نێونەتەوەیی گورج و ئەرمەن و ئەبخاز و یۆنان و میللەتانی‌دی سەقامگیربووی کۆماری گورجستانی‌سۆڤێتی بەکار دێنرێ . لە ئوزبەگستانی سۆڤێت ، زمانی ئوزبەگی هەمان دەور دەبینێ . ئوزبەگ و ئویگور و تورکمان و تەتەر و تاجیك و میللەتانی‌دی ئەم کۆمارە بە زمانی ئوزبەگی دەدوێن . زمانی عەرەبی لە عیراق بووەتە زمانی پێوەندی بەستنی گەلی عەرەب و کورد و تورکمان و ئەرمەن و ئاسوور ... زمانی فارسیش لە ئێران وەك زمانی لەیەکترگەیشتنی فارس و کورد و ئازەر و بلووج ... لەکاردایە .

بەئاشکرا دەبینین ، کە بیری نەتەوایەتی لە بەرزبوونەوەدایە و کۆلۆنیالیزم لە هەرەس هێناندایە . گەشەسەندنی بزووتنەوەی ڕزگاری‌خوازی یاریدەی پەیدابوونی زمانی نێونەتەوەیی ناوچەیی دەدات . ئەمڕۆ لەم دەورەدا ، زمانانی وەك عەرەبی و هیندی و سواحیلی ... لە ناواندان .

لەم دە ساڵەی دواییدا بەتەواوی دیاردەیێکی نوێ سەری هەڵدا ، ئەویش پێکهاتنی پێوەندی بەستنی مێژوویی نوێی گەلانی یەکێتی سۆڤێت و بوونی زمانی ڕووسی‌یە بە زمانی پێوەندی بەستنی

نێونەتەوەیی و هاوکاریکردنی گشت گەلانی ئەو وڵاتە . زمانی ڕووسی وەك زمانی کولتوور و زانستی و جیهانی .... و هەروەها وەك زمانی پێناو بۆ کار لەیەکدیکردن و کەڵك لەیەك وەرگرتنی میللەتان دەوری دیار دەبینێ و ئەرکی گەورە بەجێدێنێ .

لەتەك زمانانی لەیەکترگەیشتنی نێونەتەوایەتی ، زمانانی سنوور فراوانتر و ئەرك هەمەڕەنگتر پەیدادەبن . بەم جۆرە زمانانە دەوترێ زمانی نێومیللەتان یاخود زمانی جیهانی (Weltsprache, World Language) . زمانی جیهانی لە ئەنجامی هەرەسهێنانی سنووری نەتەوایەتیدا پەیدا دەبێ ، کە خاسیەتی پێشکەوتنی ئابووری و ڕامیاری و کولتووریی دوا سەدەکانە . لە سەدەکانی ١٧ - ١٨دا زمانی ئیسپانی و فەرەنسی و ئەڵمانی بلاوبوونەوەی نێومیللەتانیان وەدەستهێنا . لە سەدەی ١٩دا زمانی ئینگلیزی. زمانی ڕووسیش لە سەدەی ٢٠دا ، ئەگەرچی لە سەدەی (١٩)ەوە بووبووە سەرنجڕاکێش ، ئەویش وەك ف . ئێنگلس دەڵێ : نەك تەنیا لەبەر خودی زمانەکە ، بەڵکو لەبەر تێگەیشتنیش لە ئەدەبەکەی .

پ. ن . دێنیسۆڤ و ڤ . گ . کۆستۆمارۆڤ لە دیاریکردنی مەفهوومی "زمانی جیهانی"دا ، وەك دۆخێکی مێژوویی سەدەی بیستەم ، نووسیویانە : " ئەم دۆخە وەك دیاردەیێکی کۆمەڵایەتیی زمانناسی لەباری چۆنەکییەوە چاکترە لە زۆر دیالێکتی ڕووکەش و پێکهاتنی زمانیی نەتەوایەتیی کۆمەڵایەتی چەشن جیاواز و لە وڵاتانی جیاواز و لە چەرخی جیاوازدا : زمانی گشتیی سانسکریتی لە

هیندستان و وڵاتانی بوودیزم ؛ گرنگیی دێرین لە ئەورووپای کۆن . عەرەبیی کلاسیکی لە جیهانی موسوڵماناندا ؛ لاتینی سەدەکانی ناوەڕاست ؛ فەرەنسی لە زانستدا (سەدەکانی ١٧-١٨) ؛ زمانی ڕووسی لە ژیانی دیپلۆماسی و پێوەندیبەستنی ئەمڕۆی وەك (وەرگێڕی سەرانسەری سۆڤێت) و (دووەم زمانی زگماك)ی گەلانی یەکێتی سۆڤێت ... هتد ... هیچ کات دەوریان وەك دەوری (زمانی جیهانی) مەزن نەبووە . بەتایبەت لە بارودۆخی ئێستادا ، کە لە پێشکەوتن و سەرکەوتنی زانست و تەکنیکی گشتیی مرۆڤایەتیدا ؛ لە لووزەوی تیژڕەوی دەنگوباس و چاپەمەنی و ڕادیۆ و تەلەفزیۆن...دا مرۆ سەری گێژ دەخوا" [١٢] .

زمانی ئینگلیزی و ڕووسی لە جیهانی هاوچەرخدا شوێنێکی تایبەتییان هەیە . ئەویش نەك تەنیا بە بڵاوبوونەوەیان لە دەرەوەی سنووریان ، بەڵکو بە هەمەڕەنگێتی و پتەو بەجێهێنانی ئەرکیش [١٣] .

زمانی ڕووسی تەنیا لە یەکێتی سۆڤێت بەکار ناهێنرێ ، بەڵکو لە هەندەرانیش دەور دەبینێ ، بەتایبەتی لە وڵاتانی بەرەی سۆشیالیستیدا . ڤ . ڤ . ڤینۆگرادۆڤی سەرۆکی کۆمەڵەی نێونەتەوەیی مامۆستایانی زمان و ئەدەبی ڕووسی ، وتوویە :" دەشێ هەست بەوە بکرێ ، کە ئێستا لە جیهاندا کەم یان زۆر نزیکەی ملیارد و

---

(١٢) زمانی ڕووسی لە جیهانی هاوچەرخدا ، مۆسکۆ ١٩٧٤ ، ل ٥٦ - ٥٧ .

(١٣) ئەرکی زمانی چینی لە مەیدانی نێودەوڵەتاندا سنووردارە ، لەبەرئەوەی بەکارهێنانی بە شێوەیێکی سەرەکی لەنێو خودی چینییەکاندا ماوەتەوە .

نیوێك کەس زمانی ڕووسی دەزانن و بۆ (١٥٠) ملیۆنیان زمانی زگماکە"[١٤] .

دیاردەی گرنگ ئەوەیە ، ژمارەی ئەو کەسانەی زمانی جیهانی بەکاردێنن ، لەوانە زیاترن ، کە زمانە جیهانییەکە زمانی زگماکیانە . سەرنجڕاکێش ئەوەیە ، ویست و ئارەزووی خەڵکی بۆ فێربوونی زمانی جیهانی لە برەو و گەشەسەندندایە .

سەرەتای بڵاوبوونەوەی زمانی ڕووسی دەگەڕێتەوە بۆ پێوەندیبەستنی نێوان میللەتە سلاڤیانییەکان . زمانی ڕووسی بووە زمانی دەرزوتنەوەی قوتابخانە و زانکۆ . وزە و دەسەڵاتی "زمانی بێگانە"ی پەیداکرد . لە کۆتایی سەدەی ڕابردووەوە لە هەموو زانکۆ سلاڤیانییەکان و هەروەها زانکۆی پاریس و ڤیەننا و بەرلین و کالیفۆرنیا و شیکاغۆ و گەلێ شاری دی خۆی گرتووە .

زمانی ڕووسی تەنیا یەکێك لە زمانە هەرە تەشەنەکردووەکانی هاوچەرخ نییە ، بەڵکو لە هەمان کاتدا یەکێکە لە زمانە هەرە دەوڵەمەند و پێشکەوتووەکانی زمانانی جیهان . م . ڤ . لۆمۆنۆسۆڤ زۆر زوو هێزی ئەرك و شێوازی زمانی ڕووسیی یادداشت کردووە .

دەوڵەمەندی و جوانی ؛ هێز و پێز و مەزنی زمانی ڕووسی لە لایەن گەلێ نووسەر و زانای ڕووس و بێگانەوە باس کراوە . ڤ . ئی . لێنین زمانی ڕووسی بە زمانی نووسەران و زانایانی پێشکەوتنخوازی

---

(١٤) ڤ . ڤ . ڤینۆگرادۆڤ ، زمانی ڕووسی لە جیهانی هاوچەرخدا ، مۆسکۆ ، ١٩٦٨ ، ل ٢٣ .

مەزن و توانا ناوزەدبا[١٥] . ف . ئێنگلس وای داناوە ، کە زمانی ڕووسی "یەکێکە لە زمانە هەرە بەهێزەکان و هەرە دەوڵەمەندەکانی زمانە زیندووەکان" [١٦] . لەو نامەیەی ف . ئێنگلس (٦)ی مارتی ١٨٨٤ بۆ ڤ . ئی . زاسوولیچی ناردووە و دەربارەی وەرگێڕانی بەرهەمەکانی ك . مارکس و ف . ئێنگلسە بۆ سەر زمانی ڕووسی ، نووسیویەتی : "یەکجار چاك نامیلکەکەتان وەرگێڕاوە . ئای کە زمانی ڕووسی قەشەنگە" [١٧] . ئانتاناس ڤێنتسلۆڤی نووسەری لیتوانی ، کاتێ لەوە دەدوێ ، کە چۆن فێری زمانی ڕووسی بووە ، وتوویە : "زمانی ڕووسی دەروازەی جیهانێکی مەزنی نوێی بیر و جوانی بۆ والاکردم . ئەو جیهانەش متێ هەژاند ! ".

## - ٤ -

## زمانی دروستکراوی نێودەوڵەتان

لەتەك بەکارهێنانی زمانێك وەك زمانی واقیعی و سروشتیی نێونەتەوە و جیهانی، هەوڵی هەمەجۆر بۆ دانانی زمانی جیهانیی دروستکراو دراوە . بیرۆکەی زمانی دروستکراوی نێو میللەتان - زانستی و گشتی - گەلێ فەیلەسووف و زمانناسی بزواند و نزیکەی (٥٠٠) نەخشە هەیە .

---

[١٥] ڤ . ئی . لێنین ، سەرجەمی کارە کۆکراوەکانی ، ب٢٤ ، ل٢٩٤ .

[١٦] ك . مارکس ، ف ، ئێنگلس ، کارە کۆکراوەکانیان ، چاپی دووەم ، ب ١٨ ، ل ٥٢٦ .

[١٧] هەمان سەرچاوە ، ب ٣٦ ، ل ١٠٦ .

ساڵی ١٩٦٠ کۆنفرانسی نێومیللەتان لە پاریس ، زمانی پێڕۆی ژمارەی دەدە (نظام العد العشري – Algorithmic Language)ی پەسەند کرد . ئەم زمانە پێوارەتی (الرمزية)یە بریتی‌یە لە وەرگرتنی دەستەیێك پیتی (لاتینی – گەورە و بچووك) ؛ ژمارەی عەرەبی لە"٠"ەوە تا "٩" ؛ نیشانە و خشتەی ڕاستیی بنچینەیی و نیشانەی پێوارەتی دی (نیشانەی کردە ، دابەشکردن ، کەوانە) . هەروەها چەند وشەیێکی یاریدەدەر (بە زمانی ئینگلیزی ، بە نموونە ( if – ئەگەر ؛ then – ئەوجا) . زمانی پێڕۆی ژمارەی دەدە لە دانانی دەدە ژماردن و بەرنامە بۆ ئامێری ژمارەژمێری ئەلەکترۆنی‌دا بەکاردەبرێ .

لەنێو زمانە دروستکراوەکاندا ، ئەوەی باش بڵاوبووەتەوە ، دوو زمانی ڤۆلیاپیوك و ئەسپیرانتۆیە . ڤۆلیاپیوك ساڵی ١٨٨٠ ئی . م . شلێر داینـاوە و پتر لە دووسەد هەزار کەس فێری بوون . ئەسپیرانتۆ[١٨] پتر ناوبانگی دەرکرد و زۆرتر بڵاوبووەتەوە ، بەتایبەتی لە بەلگاریا و ڤێتنام و ژاپۆن و پۆلۆنیا و وڵاتەکانی ئەسکەندەناڤیا و

(١٨) ئەسپیرانتۆ لەلایەن ل . م . زامینگۆف (١٨٥٩ – ١٩١٧)ی پزیشکی فەرەزمانزانەوە دانراوە . ناوی ئەم زمانە لەو ناوە خواستە وەرگیراوە ، کە ساڵی ١٨٨٧ لە یەکەم کتێبی‌دا "Lingva internacia" (زمانی نێومیللەتان) داینـاوە . Esperanto واتای (ئاوات‌خواز ، هیوادار) دەگەیەنێ . هەر لەو ساڵەدا لە وارشۆ ژمارەیێك کتێب بۆ خوێندن و فێربوونی ئەو زمانە دروستکراوە ، بڵاوکرایەوە . زامینگۆف فەرهەنگ و کتێبی دەقی ئەدەبی دانا ؛ (پشکنەر)ی گۆگۆل و (جۆرج داندێن)ی مۆلێر و (هاملێت)ی شکسپیر...ی وەرگێڕایە سەر ئەو زمانە نوێیە ، زامینگۆف ئەوەشی بۆ کرێکاران و جوتیاران ڕوون کردەوە ، کە زمانی نوێی یاریدەدەر خاسیەتی لەیەکترگەیشتنی میللەتیشی گرتووەتە خۆی .

ئینگلستان و ڕۆمانیا و چیکۆسلۆڤاکیا و فەرەنسا . یەکێتی ئەسپیرانتۆی نێو میللەتان نزیکەی پەنجا یەکێتی زمانی نەتەوەیی دەگرێتە خۆ و پێوەندی بە هەشتا وڵاتەوە هەیە و کۆنگرە و کۆنفرانسی نێومیللەتانی بۆ دەگیرێ . بیستوپێنج ئێستگە بە ڕێکوپێکی بە زمانی ئەسپیرانتۆ بەرنامە بڵاودەکەنەوە . بەم زمانە ڕۆژنامە و گۆڤار دەردەچێ . ئەسپیرانتۆ نەك تەنیا ئەدەبی ڕەسەنی گرتووەتە خۆ ، بەڵکو ڕۆمان و شانۆنامە و شیعری وەرگێڕاو و بەرهەمی زانستی و نامەی دوکتۆریشی لە ئامێز گرتووە . گەورەترین کتێبخانەی ئەسپیرانتۆ لە لەندەن ، پتر لە سی هەزار سەرچاوەی تێدایە . یەکێتی ئەسپیرانتۆ لەیەکێتی سۆڤێت لەساڵی ١٩٢١ ەوە هەیە . ئێستا ئەسپیرانتۆناسەکان لە وڵاتی سۆڤێت لە دەزگا ڕۆشنبیری و یانەکان ، لە خوێندنگا بەرزەکانی سەرلەبەری وڵات کاردەکەن .

سیستەمی ئەسپیرانتۆ ئاسان و ژیربێژانەیە . زمانەکە هەموی (١٦) یاسای ڕێزمانی و نزیکەی (٤٠) پێشگر و پاشگر و پێشبەندی هەیە . هەر وشەیێك چۆن دەنووسرێ وا دەخوێندرێتەوە ، لەبەرئەوەی بۆ هەر فۆنیمێك پیتێکی سەربەخۆی لاتینی دانراوە :

(a , b , c , ĉ , d , e , f , g , ĝ , h , ĥ , i , j , ĵ , k , l , m , n , o , p , r , s , ŝ , t , u , ŭ , v , z ).

هێز (النبرة – Stress) هەمیشە دەکەوێتە سەر پێش دوابڕگەوە .

وشەگۆڕی و فۆرمڕۆنان و وشەڕۆنان بە ڕێبازی پێوەلکانی گیرەکەوە ئەنجام دەدرێ [١٩] . بەشەکانی ئاخاوتن و فۆرمیان بە فۆرمڕۆنانی پاشگرییەوە دەناسرێتەوە . بەوێنە ئەگەر وشەیێك کۆتایی بە (ۆ) بێت ، ئەوە ناوە ، وەك : "پاترۆ" (باوك) ؛ "ڤێلیچۆ" (شادمانی) ... بێتو کۆتایی بە (ا) بێت ، ئەوە ئاوەڵناوە ، وەك "پاترا" (باوکانە) ؛ "ڤێلیچیا" (شادمان) . هاتوو (ێ) بووە کۆتایی وشە ، ئەوە دەبێتە ئاوەڵکردار ، وەك "پاترێ" (باوك ئاسایی) ؛ "ڤێلیچێ" (بەشادمانی) .

جنس فۆرمی نییە . کۆ بە پاشگری (ـ ج) نیشان دەدرێ : "ڤیلیچاج پاترۆج" (باوکانی شادمان) . دۆخی سادە هەیە ، ئەویش دۆخی بەرکارێتییە و بە نیشانەی (ـ ن) دەردەبڕێ ، فۆرمی دۆخەکانی دی بە یاریدەی پێشبەند سازدەبێ . دۆخی جەر (دێ) وەردەگرێ ...

فۆرمی کەس و ژمارەی کردار بە ڕێگەی شیکاری پێك دێنرێ – واتە بەهۆی جێناوی "می" (من) ؛ "سی" ( تۆ) ؛ "لی" (ئەو - بۆ نێر) ؛ "شی" (ئەو - بۆ مێ) ؛ "جێ" (ئەو - بۆ بێلایەن) ؛ "تی". (ئێمە) ؛ "یلی" (ئێوە) ؛ "ۆنی" (ئەوان) خستنەسەر فۆرمی کات یان ڕێژە. فۆرمی کارا دیاری و کارا بزریش بە ئیزافەکردنی پاشگر ئەنجام دەدرێ :

[١٩] جگە لە ژمارە و جێناوی کەسی. بەوێنە ژمارە بەو شێوەیەی خوارەوە ڕاگەیەنراوە.
Unu – یەك ؛ du – دوو ؛ tri – سێ ؛ kvar – چوار ؛ Kvin – پێنج ؛ ses – شەش ؛ ok – هەشت ؛ nau – نۆ ؛ dek – دە ؛ cent – سەد ؛ mil – هەزار ؛ Kvarcent sepdek kivin – چوارسەد و حەفتاو پێنج .

ئەگەر فۆرمی کاتی ئێستا و ڕابوردوو و ئایندە پاشگری (- نت)ی بۆ ئیزافە بکرێ ، فۆرمی کارا دیار دروست دەبێ و بە پاشگری (- ت)ش فۆرمی کارا بزر سازدەبێ . بە زیادکردنی کۆتایی (- ا) ناوی کارا و ناوی بەرکار پێك دێ : "لیگاز تا" خوێنەر) ....

وشەڕۆنان بە یاریدەی پێشگر و پاشگر ئەنجام دەدرێ . لە هەندێ ڕەگ لە بیست تا شەست وشەی ناسادە ڕۆدەنرێ . ئەمەش نموونەی چەند پاشگر و پێشگرێك :

١ - پاشگر

"- ار" (کۆبوونەوەی شتی هاوڕەگەز ڕادەگەیەنێ) ، وەك : "ئاربارۆ" (دارستان) لە "ئاربۆ" (درەخت)ەوە ؛ "ڤاگۆنارۆ" (شەمەندەفەر) لە "ڤاگۆنۆ" (واگۆن)ەوە ...

"-ین" ، وەك : "فیلینۆ" (کچ) بەرانبەر "فیلۆ" (کوڕ) ؛ "پاترینۆ" (دایك) بەرانبەر "پاترۆ" (باوك) ... "- ید" ، وەك : "باڤیدۆ" (گوێرەکە) بەرانبەر "باڤۆ" (گا) ... هتد .

٢ - پێشگر

"ڕێ -" (بۆ دووپاتبوونەوەی ڕوودان و گەڕانەوە) ، وەك : "ڕێدۆنی" (دانەوە) بەرانبەر "دۆنی" (دان) ... "مال -" (دژواتایی و بارودۆخ و چۆنێتی ڕادەگەیەنێ) ، وەك: "مالفێرمی" (کردنەوە) بەرانبەر "فێرمی" (داخستن) ؛ "مالبۆنی" (خراپ) بەرانبەر "بۆنی" (باش) .

زمــانی دروســـتکراوی نێومیللـــەتان لەگـــەڵ هـــەموو کـــاری ژێربێژییانەی و بیروردی و سیستەمی ڕێکوپێکیشدا ناتوانێ دەوری زمانی فرەئەرکی ئادەمیزاد جێبەجێ بکات . زمانی دروستکراو دەوری زمانی یاریدەدەر دەبینێ . زیاتر بڵاوبوونەوە و پەلهاویشتنی ئەسپیرانتۆ دەبێتە هۆی پەیدابوونی جیاوازیی شێوەی ڕێنووس ؛ سەرهەڵدانی هاوواتایی وشە و وشەڕۆنان ؛ دابەشبوونی زمانی گشتی بەسەر دیالێکتدا ... بە واتایێکیدی ئەرکی زمانی ئەسپیرانتۆ ، وەك زمانی گشتیی ، وای لێ دێ هەمان ڕێگەی پرۆتسێسی هەنگاو بە هەنگاوی پێشکەوتن و تەواو بڵاوبوونەوەی زمانەکانی هاوچەرخ بگرێتە بەر .

## - ٥ -

## لەبارەی زمانی دوارۆژەوە

پێشکەوتنی مێژوویی مرۆڤایەتی نیشانیدەدا ، کە نەتەوە و زمانی نەتەوایەتی و زمانی ئەدەبی میللی و نەتەوایەتی بریتییە لە مێژووی چینایەتی . ئەگەرچی جیاوازیی نەتەوەیی خەڵك زۆر خۆگر و بزۆزە ، بەڵام لە ئەنجامی سەرکەوتنی سۆشیالیزمدا دەتوانێ ئەو جیاوازییانە وەلاوە بنێ و کولتووری گشتی وەربگرێ . ڤ . ئی . لێنین لەم بارەیەوە وتوویەتی : " ئامانجی سۆشیالیزم تەنیا لەناوبردنی دابەشبوونی مرۆڤایەتی بەسەر حکوومەتی بچووك بچووکدا و

دوورەپەرێزی هەمەجۆری نەتەوە و لەیەك نزیككردنەوەی نەتەوە نی‌یە ، بەڵكو یەكخستنیشیانە" [٢٠]

دوو ڕێرەو خاسیەتی پێشكەوتنی نەتەوایەتیی هاوچەرخی مرۆڤایەتی‌یە : لە سەرێكەوە چەندێتیی زمانانی ئەدەبی - نووسین زیاد دەبێ و لە لایێكی‌دیشەوە هەندێكیان بەرەو دۆخی بوونە زمانی نێونەتەوەیی و نێودەوڵەتی دەبزوێن . ڕێرەوی بەرەو یەكگرتن بە شێوەییێكی واقیعی لە پێشكەوتنی مرۆڤایەتی هاوچەرخدا ، لە ڕووی زمانەوە ، وەك دەزانین ، لە دانانی زمانانی دروستكراوی نێومیللەتاندا و هەروەها لە بەكارهێنانی زمانانی وەك : ئینگلیزی و ڕووسی بۆ پێویستیی پێوەندی‌بەستنی نێو میللەتاندا دەركەوت .

ئەو دوو ڕێگەیەی باسمانكردن ، بۆ یەكبوونی زمانی مرۆڤایەتی وەك یەك لایەنگیریان بۆخۆیان پەیداكرد .

لە جیهانی هاوچەرخدا هیچ زمانێك خزمەتی زۆربەی دانیشتوانی سەرزەمین ناكات و هیچ زمانێكیش بە ڕەهایی و بەتەواوی كامڵ نی‌یە . هەر زمانێك بكرێتە زمانی جیهانی ، فشار دەخاتە سەر شایستەیی و بەرژەوەندیی گەلان و وڵاتانی‌دی . ئەم ڕاستی‌یە دەشێ بكرێتە بەڵگەی ئەوەی كە زمانی دوارۆژ دەبێ زمانێكی دروستكراوی جۆری ئەسپیرانتۆ بێ . نووسەرانی وەك : ل . ن . تۆلستۆی و هانری بەربیوس ... زانایانی ، وەك : ئی . ئا . بۆدوئێن دێ كورتەنی و ئی . پ . سڤادۆستی نووسەری كتێبی "زمانی گشتیی چۆن پەیدا دەبێ ؟"

---

[٢٠] ڤ . ئی . لینین . سەرجەمی كارە كۆكراوەكانی ، ب ٢٧ ، ل٢٥٦ .

(١٩٦٨) ، لایەنگیری ئەوەن ، زمانێکی دروستکراو ببێتە زمانی دوارۆژ .

بە بیری ك . خ . خانازاروٚڤ [٢١]، ئەو جۆرە قۆناغانە چوارن : ١) پێشکەوتنی جیهانیی زمانان دوای سەرکەوتنی شۆڕشی سۆشیالیستی ؛ ٢) جیاکردنەوەی بە ئارەزووی زمانانی نێونەتەوایەتی و لەناویاندا زمانی پێوەندیبەستنی سەرەکیی نێونەتەوایەتی ؛ ٣) بوونی زمانی نێونەتەوایەتی هێدی هێدی بە زمانی "زگماك"ی دووەم و کەرەستەی سەرەکیی لەیەکترگەیشتن ؛ ٤) بوونی یەکێك لە زمانە هاوچەرخە نێونەتەوەییە کامڵەکان بە زمانی یەکێتی جیهانی .

---

[٢١] ك . خ . خانازاروٚڤ ، نزیکەوتنەوەی نەتەوە و زمانی نەتەوایەتی لە یەکێتی سۆڤێت ، تاشکەنت ، ١٩٦٣، ل ٢٢٥ .

# سەرنجی چوونە ناو بابەتەوە

دانەکانی زمان و پێوەندیی زمان و ئەرکی زمان – ئەو سێ کۆمەڵە خاسیەتانەیە ، کە لە لێکۆڵینەوەی سیستەمی زمان و پێکهاتنی دیوی ناوەوەی‌دا بۆ دیاری‌کردنی یاساکانی زمانەوانی بەکاردەهێنرێن .

بەپێی جۆری دانەکانی زمان چوار بەشی بنەڕەتیی ناوەکیی زمانناسی جیادەکرێتەوە : نووسین ؛ پێکهاتنی دەنگیی زمان ؛ پێکهاتنی ڕێزمانیی زمان ؛ وشەکانی زمان . بەگوێرەی بابەتی لێکولینەوەی شێوە ئاسۆیی‌یە جیاکانی زمان و زانستەکانی زمان – زانستی نووسین[1] (بەداخەوە زاراوەی تایبەتی بۆ دانەنراوە) ؛ دەنگسازی ؛ ڕێزمان ؛ لێکسیکۆلۆژی – دەستنیشان کراون .

هەر یەکێك لە زانستەکانی زمانی ناوەکیی سیستەمی زمان دەتوانێ گشتی ، یان بەراوردی – مێژوویی ، یان پۆلەکی ، یان

---

[1] Paleography لە زمانی یۆنانی‌یەوە وەرگیراوە و لە دوو بەش : (paleo – دێرین)و (graphy – دەنووسم) پێکهاتووە . بەو چالاکی‌یە یاریدەرە فیلۆلۆژی‌یە مێژوویی‌یە دەوترێ ، کە لە یادگاری نووسراوی کۆن دەکۆڵێتەوە ، بۆ ئەوەی کات و شوێنی پەیدابوونیان نیشان بدا . پەلیۆگرافی دابەش دەبێ بەسەر : (Epegraphy – لە نووسینی سەر دار و بەرد و کانزا دەکۆڵێتەوە) و (Sphragis – لە زمانی یۆنانی‌یەوە وەرگیراوە و واتای "چاپ" دەگەیەنێ ، واتە لێکۆڵینەوەی نووسینی چاپ دەگرێتە خۆ) و (numisma – وشەیێکی لاتینی‌یە و بە یۆنانی واتای "دراو" دەگەیەنێ و لە نووسینی سەر دراو دەدوێ) .

تایبەتی ، یان کردەکی بێت . فۆنەتیك و ڕێزمان و لێکسیکۆلۆژیی گشتی لەو دانە و حاڵەتانە دەکۆڵنەوە ، کە خاسیەتی هەموو زمانن . فۆنەتیك و ڕێزمانی بەراوردی - مێژوویی لە پێکهاتنی دەنگی و ڕێزمانیی زمانانی خزم دەدوێن و بەردەوامی و ڕێکوپێکی و ڕەوانیی هاوجووتیی دەنگ و فۆرمی زمانان لە پلەو قۆناغی جیاوازی مێژووییدا نیشان دەدەن و بەهەمان چەشنیش باسی سروشتی گۆڕانکاریی مێژووییان دەخاتە ڕوو . لێکسیکۆلۆژیی بەراوردیی مێژوویی ئەوەندە تەماشای مێژووی وشە و دەربڕینی ناکات ، وەك هێندەی ئەوەی گرنگی بە لایەنی ئێتیمۆلۆژیی‌یەکەی دەدات . دابەشکردنی زمانی ، وەك دابەشکردنی وشەسازی زمانان پتر لە هەر شت پشت بە وشەسازی و ڕستەسازی دەبەستێ . فۆنەتیك و ڕێزمان و لێکسیکۆلۆژی تایبەتی ، بەوە جیادەبنەوە کە پشت بە کەرەستەی تاکە زمانێك دەهێنرێتە ئەنجام .

فۆنەتیك و ڕێزمان و لێکسیکۆلۆژی لەنێو خۆیاندا بەسەر بەشی بچووکتردا دابەش دەبن و بەپێی بابەت و بەرنامەی جیاوازی لێکۆڵینەوەش بەرێوەدەچن . وێڕای ئەوە لکی ئەوتۆش هەیە ، کە لە دوو لای زمانەوە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە دەکرێ . ئەم جۆرە زانستە تێکەڵە ، کە لەم ساڵانەی دواییدا گەشەی سەندووە ، بریتی‌یە لە ئیدیۆم و وشەڕۆنان .

فۆنەتیك و ڕێزمان و لێکسیکۆلۆژی و هی‌دی بەشی هەرە دیار و تایبەتی زانستی زمانن و بەجۆرێك لە پێکهاتنی زمان دەکۆڵنەوە ، وەك

بڵێی پێوەندییان بە بەکارهێنانی‌یەوە نەبێ ، بەڵام زمان بوونی تەنیا لە کۆمەڵدا دەبێ و لەکاتێکدا کە خەڵکی بەکاری‌دێنن و لە شوێنی جیاواز وەك هێڵی گەیەنەر کاردەکات . ئەمەش شێوەی جیاوازی کەرەستەی زمان دێنێتە کایەوە : هاوواتایی ؛ چەشنی جیاوازی ئەرك بینین ؛ زمانی ئاخاوتن و نووسین ؛ شێوازی جیاوازی زمانی ئەدەبی .

ئەم خاسیەتانەی زمان هەروەها دەتوانن ببنە بابەتی لێکۆڵینەوەی تایبەتی . بەو چەشنە زانستێکی دی‌یش : (ڕەوانبێژی) پەیدادەبێ . ڕەوانبێژی لە ڕێگەی بەکارهێنان و هەڵبژاردنی کەرەستە دەدوێ ، ئەویش بەپێی پێوەندی بە خاسیەت و مەبەستی گوتە و بارودۆخی لەیەکتر گەیشتن و هەروەها خودی ئەو شێوازانەوە ، کە لە ئەنجامی ئەرکی کەڵەکەبووی زمانەوە پەیدابوون . ڕەوانبێژی بەر لە هەر شت پێوەندی بە وشەکانی زمانەوە هەیە و هەروەهاش بە ڕستەسازی‌یەوە . پێویستە ئەوەش یادداشت بکەین ، کە لە وشەسازی و ڕێنووسدا شێوازی ڕەوانبێژی هەیە .

## فەسلی شەشەم

# فۆنەتیک و فۆنۆلۆژی

- ١ -

## دەنگەکانی ئاخاوتن وەك کەرەستەی سروشتیی زمان

فۆنەتیک لە پێکهاتنی دەنگیی زمان دەکۆڵێتەوە ، واتە - دەنگەکانی ئاخاوتن و دەستووری یەککرتنیان لە وشە و لووزەوی ئاخاوتندا ، ساغکردنەوەی دەنگەکانی زمان و سیستەمیان و یاسای دەنگییان . جگە لە دەنگەکانی ئاخاوتن ، فۆنەتیك لە برگە و هێز و ئاوازیش دەکۆڵێتەوە .

دەنگەکانی ئاخاوتن وەك دیاردەیێکی سروشتی خاوەنی ڕووی بیستن و وتنە . ئەم دوو ڕووە ، لەباری پراکتیکی‌یەوە ڕووی وتن گرنگترە - بەرهەم و وەرگرتنی مرۆ ڕووی فۆنەتیکی دانەکانی زمانە . لەوەش بایەخدارتر ڕووی ئەرکی کۆمەڵایەتی دەنگەکانی ئاخاوتنە - هەستیان و جیاکردنەوەی دەوریان لە پرۆتسێسی پێوەندی بەستندا . وەك دەربڕینی دەنگی کۆنسۆنانت جارێك ئاوازەدار و جارێك کپ لە

وشەی (دووگ - تووك)دا ، کە نە بە یاسای فیزیاوی و نە بە یاسای بایۆلۆجی ناتوانرێ ڕوون بکرێتەوە[1] .

سێ لایەنی دەنگەکانی ئاخاوتن و دانە فۆنەتیکیەکانی دی ڕێگەمان دەدەن سێ دیمەنی فۆنەتیکی دیاری بکەین ، کە دەبنە کەرەستەی لێکۆڵینەوەی تایبەتی . بەو شێوەیە سێ چالاکیی فۆنەتیکی :( بیستنی ئاخاوتن) و (فیزیۆلۆژی ئاخاوتن) و (فۆنۆلۆژی) پەیدا دەبێ . فۆنۆلۆژی باسێ دەنگەکانی ئاخاوتن لە ڕووی ئەرك و شێوەیەوە لە سیستەمی زماندا دەکا .

دەنگەکانی ئاخاوتن ئەوەندە دانەی زمان نین ، وەك هێندەی ڕێگەی بوونە مایەکیەتی دانەکانی زمان : (مۆرفێم ، وشە ، فۆرمی وشە)ن . ك . مارکس و ف . ئێنگلس لە پەنجە ڕاکێشانیاندا بۆ یەکێتی زمان و بیر و هۆش ، نووسیویانە : "هەر لە سەرەتاوە نەفرەت لەسەر (گیان)ە - بوونی مادەییکی قورس ، کە لێرەدا لە وێنەی چینە بزۆزەکانی هەوا ، دەنگەکان - وشە ، لە شێوەی زماندایە"[2] . لەم واتایەدا ، کە ئاخاوتن ژیانی واتای تێدا ڕەنگ دەداتەوە ، خاوەنی هەستی سروشتیە . دیارە دەنگ ، کە دەبێتە دەنگی زمان ، ئیتر سروشتی مرۆڤانە و چالاکیی بەرزی دەماریی ئادەمیزادانە و ڕشتەی

---

[1] لەبەرئەوەی دەنگەکانی ئاخاوتن لەگەڵ پیتەکاندا باش یەك ناگرنەوە ، لە فۆنەتیکدا نووسینێ فۆنەتیکی بەکاردێنرێ ، کە بە تەواوی دەنگەکانی ئاخاوتن دەردەخەن (دواتر دەربارەی دەستووری ئەو جۆرە نووسینە دەدوێین) .

[2] ك . مارکس و ف . ئێنگلس ، کارە کۆکراوەکانیان ، چاپی دووەم ، ب ٣ ، ل ١٩.

ئاخاوتن و بنکەی دەربڕینی زمان و کەرەستەی دەنگی و یاسا فۆنەتیکی‌یەکان وەردەگریٚ .

## بیستنی دەنگەکانی ئاخاوتن

دەنگەکانی ئاخاوتن لە سروشتی فیزیاوی‌یاندا بریتیین لە لەراندنەوە و بزواندنی هەوای دەوروبەر لە لایەن ڕشتەی ئاخاوتنەوە . بەلاّم دەنگەکانی ئاخاوتن بەندن بە ڕشتەی بیستنەوە ، چونکە بە هۆیەوە ئەوە وەردەگیریٚ ، کە ڕشتەی ئاخاوتن دەیهێنێتە بەرهەم . گوێی ئادەمیزاد توانای ئەوەی هەیە لەرەی دەنگ لە سنووری ١٦ تا ٢٠٠٠٠ هێرز (Hz)دا [٣] وەربگریٚ . دەنگە ژێکان لە چرکەیەکدا دەتوانن نزیکەی ٤٠ تا ١٧٠٠ لەرینەوە ئەنجام بدەن . لە تاقی‌کردنەوەی کێشی دەنگی مرۆدا ، ئەوەش دەرکەوتووە : لە٨٠ هێرزەوە (نزمترین ئاوازی دەنگی گڕ) تا ١٣٠٠ (بەرزترین ئاوازی دەنگی ناسك) دەڕوات ؛ لە ئاخاوتندا کێشی دەنگی‌مامناوەندی لای پیاو ٨٥ - ٢٠٠ هێرزە و لای ژنیش ١٦٠ - ٣٢٠ هێرز . کەواتە مرۆ سەرجەمی توانستی دەنگیی خۆی بەکارنەهێناوە و تەنانەت ئەو دەنگانەش ، کە دەتوانیٚ بیانهێنێتە بەرهەم و وەریشیان گریٚ بەتەواوی بەجێی نەگەیاندوون .

---

[٣] هێرز (HZ) : بە دانەی لەرەی دەنگ دەوتریٚ - یەك لەرە لە چرکەیەکدا . (هێرز)یش ناوی ئەو پسپۆرە ئەلّەمانی‌یەی فیزیایە ، کە ئەو تیۆری‌یەی ئەنجام داوە .

تێگەیشتن لە بیستنی ئاخاوتن بە لێکۆڵینەوە دەربارەی جۆرەکانی شەپۆلی لەرەی بزووتنەوە و خێرایی ؛ هەروەها لەبارەی بەرزی و بەهێزی و درێژی و بەردەوامیی دەنگەوە پێکدێ .

بەپێی پێوەندیی خاسیەتی لەرەی بزووتنەوە ، دەنگەکان دابەش دەبن بەسەر مۆسیقایی (پێیان دەوترێ ئاواز) و نامۆسیقایی (پێیان دەوترێ (ژاوەژاو – noise) . ئاواز لە ئەنجامی بەردەوامیی هاوسەنگیی لەرینەوەی تەنی دەنگدار – بەوێنە دەنگەژێ –پەیدادەبێ . ژاوەژاو لەئەنجامی نابەردەوامیی تەنی دەنگدار– بەوێنە لێو[4] – سەرهەڵدەدات . بزوێنەکان لە ژاوەژاو و دەنگ پێك دێن ؛ لە ژاوەژاوی تەنیاش کۆنسۆنانتی کپ ساز دەبێ .

بەگوێرەی زرنگانەوە بزوێنی (ا) و کۆنسۆنانتی (پ) بریتیین لە جەمسەر . لە نێوانیاندا دەنگی جیاوازی ئاخاوتن دێن و تەنانەتیش دەنگی لەرۆکیش ، وەك (ل) . ئەم دەنگە کە لە دەنگ و ژاوەژاوێکی کەم پێکهاتووە . لەبەرئەوەی سەری زمان بە پووکی سەرووەوە دەنووسێت ، لووزەوی بێتینی هەوا بەبۆشایی تەنیشتدا تێدەپەڕێ . کۆنسۆنانتی تەنیشتیی (ل) دەتوانێ لەرزەی خۆی بەهێز بکات ، ئەویش کاتێ دەبێتە کۆنسۆنانتی برگە پێکهێن (بەوێنە لە زمانی چیکیدا "فلك" (گورگ) . کۆنسۆنانتی (ل) بەپێچەوانەشەوە دەشێ لەرزەی نەمێنێ و ببێتە کۆنسۆنانتێکی ژاوەژاوی کپ (نموونەی ئەم جۆرە فۆنێمە کیانە

---

[4] بەتایبەتی فیکەی هونەری ، کە دەنگی مۆسیقی تێدایە . فیکە وەك وەسیلەی لەیەکتر گەیشتنیش بەکاردێنرێ ، بەوێنە لای هوانچییەکانی دوورگەی هۆمێر .

لــــە زمـــــانی ئـــــالێیت و ئاڤـــــاری...دا بــــەرچاو دەکـــــەوێ .

دەنگـەکانی ئاخـاوتن لــە بــەرزی و تــین و درێــژیدا لــە یــەکتر جیادەبنـەوە . بەرزیی دەنگ بە ژمـارەی لەرینـەوە – واتـە بـە ژمـارەی پارچە شەپۆلە دەنگییەکان – دیاریدەکرێ . بۆ بزوێنەکانی (ۆ) و (وو) پلەی بەرزیی لەرە نزیکەی ٤٠٠ هێرزە . هەرچی (ا)شە دەگاتـە ٨٠٠ هـێرز . لـەئاخاوتندا بــەرزیی دەنــگ بــەندە بــەدرێژی و کشــاندنی دەنگەژێکانـەوە . بـەرزی بـۆ خاسـیەتی دەنگـەکانی ئاخـاوتن گرنگـە . دەنگی پتر بەرز خاوەنی شەپۆلی کورتە و لەبەر ئەوەشە کە بەهێزترە .

تینی دەنـگ بـە پەلهاویشـتنی لەرینـەوە دیـاری دەکـرێ – واتـە درێژیی شەپۆل ، کە بەندە بە فشاری لووزەوی هـەوا و گـەورەیی ڕووی تەنی دەنگ پێکهێنەوە . لە نەزەری وەرگرتنی ڕشتەی بیستنەوە ، تینی دەنگ بە (بڵندی) ناودەبرێ ، کە تەنیا بە زەبری شەپۆل دیاری ناکرێ ، بەڵکو بە بەرزیشـی : دەنگی خـاوەن یـەك تین و دەنگـی خـاوەن بـەرزیی جیاواز ، وەك دەنگی خاوەن بڵندیی جیاواز وەردەگیرێن . تینـی دەنـگ بـۆ ڕوونـی گـەیاندن و وەرگرتنـی ئاخـاوتن دەورێکــی گــەورەی هەیــە بەتایبەتی لەباری دیاریکردنی جۆری هێز (النبرة – Stress)دا .

ئاخـاوتن لـە ڕووی بیسـتنەوە ئـاڵۆزە ، چونکــە تــەنیا ئـاوازە بنەڕەتییـەکان ناگرێتـەخۆ ، بـەڵکو ئـاوازی لەرینــەوەش دەگرێتــەوە . لەرینەوە بریتییـە لـەوەی ، تـەنێ توانستـی بـۆ زرنگاندنـەوە هـەبێ (بـە لەرەسـاز نـاودەبرێ) ، کـاتێ شـەپۆلی دەنگـی وەردەگـرێ ، دەسـت بـە زرنگاندنـەوە دەکـات ، بەتایبـەتی بە لـەرەی وێکچـوو . لەرەسـاز لەگـەڵ

دیواری نەرم و شێداردا (ڕشتەی ئاخاوتن بەر ئەمە دەکەوێ) بەئاسانی لەرزە بە لەرە دەدا ، بێ سەختی لەگەڵ ئاوازی تایبەتییدا جووت دەبێ ، ئەگەرچی لەرینەوەی تایبەتی لەسەرخۆ دادەمرکێتەوە . ئەم خاسیەتە بیستنە - فیزیۆلۆژییانە بایەخێکی گەورەیان لە بیستنی ئاخاوتندا هەیە ، بەتایبەتی لە دیاریکردنی مەفهومی بنەڕەتیی (زەنگ - Timbre)دا .




وێنەی ژ ١

ا _ ئاوازی ئاڵۆز و ئاوازی سەرووی ئاڵۆزی پێچاوپێچ .

ب _ ئاوازی ئاڵۆز .

دەنگی ئاخاوتن پێکهاتووە لە ئاوازی بنەڕەتی و بریتی‌یە لە هەرە بەتین و ئاوازی سەروو ، کە لە ژمارەی تەواویدا لە ئاوازی بنەڕەتی بەرزترە (بڕوانە : وێنەی ژ ١ ) . لەلای دەنگەکانی ئاخاوتن ئاوازی سەرووی لەرە نێزیکی بۆشایی دەم و لووتە ئەوکی بەندن بە باری زمان و لێو و نەرمەمەلاشووەوە . هاودەنگیی نێوان ئاوازی بنەڕەتی و ئاوازی سەروو خاسیەتی چۆنەکی دەنگ پێك دێنێ - کە زەنگەکەیەتی . زەنگ دەنگێك لە دەنگێکی دی جیادەکاتەوە و هەروەها دەنگی کەسێك لە دەربڕینی کەسانی‌دی ؛ دەنگی کەمانچە لە ئۆرگان ؛ لوورەی گورگ لە وڕە و گڤەی با ...

بەو پی‌یە دەنگی بزوێن لە دەنگ و دەنگگۆڕین پێك دێ ، کە لە مەلاشووەوە دروست دەبێ و لێرەدا پرۆتسێسی بەهێزبوونی لەرە ڕوودەدات ، شەبەنگی دەنگ و پارچە پێکهێنەکانی سازدەبێ . لەزوودا پارچە پێکهێنەکان بە بیستن جیادەکرانەوە - بەیاریدەی زرنگە و لەرەوە . لەپەیدابوونی ئامێری کارەبایی بیستنەوە ، بەتایبەتی کەڵك لە ئامێری تایبەتی ، وەك : لەرەنووس و شەبەنگنووس ... وەرگیرا . شی‌کردنەوەی شەبەنگیی بزوێن ، ئەوەی نیشاندا ، کە پارچەی پێکهێن بریتی نی‌یە لە تاکە لەرەیێك ، بەڵکو هەرێمی پارچەیە (بڕوانە : وێنەی ژ ٢ ) .

بۆ دیاریکردنی چۆنێتی و خاسیەتی بزوێن ، جگە لە پارچەی پێکهێنی ئاوازی بنەڕەتی (هەروەها بۆ دەربڕینی سۆنانت – Sonant و کۆنسۆنانتی ژاوەژاوی ئاوازەدار) ، دوو پارچەی پێکهێنی دیش I و II گرنگن (بڕوانە : وێنەی ژ ٢ ) . پارچە پێکهێنی پتر بەرز خاسیەتی کەسایەتی قسەکەرە ، کە لە وەرگرتنی فۆنێمدا نابێتە کۆسپ .




وێنەی ژ ٢
ڕادەی لەرەی بزوێنەکانی زمانی کوردی

# ڕشتەی ئاخاوتن

ئەندامی تایبەتی بەرهەمهێنان و وەرگرتنی دەنگەکانی ئاخاوتن نییە . گەلێ ئەندامی لەشی ئادەمیزادیش ، کە ئەرکی بایۆلۆجیی ڕووتیان بەجێدەهێناو بەجێدەهێنن ، وەك ڕشتەی هەناسەدان و هەزم ... هتد . بەلاَم لە ڕەوتی مێژووی کۆمەڵی ئادەمیزاددا ، ئەو ئەندامانە پێشکەوتن و بەرەو پەیداکردنی وزەی دەربڕین و وەرگرتنی دەنگ گەشەیان سەند . ئەوك کە ئەرکی هەناسەدان و قووتدانی بەجێدەهێنا ، بووە ئەندامی ڕشتەی تەلەفوزکردن - ئەو دیاردەیەش بایەلۆجی و کۆمەڵایەتییە ، کە ئەمەش بە بەڵگەی بوونی بنکەی وتنی زمان ئاسان ئیسپات دەکرێ .

ڕشتەی ئاخاوتن - ئەو ئەندامانەی لەشی ئادەمیزادن ، کە وزەی بەرهەمهێنان و وەرگرتنی ئاخاوتنیان هەیە ( بەر لە هەر شت - دەنگی) . بە واتاێکیفراوانتر ، ڕشتەی ئاخاوتن و سیستەمی دەمارە ناوەندییەکان و ئەندامانی بیستن (و بینین) ، کە بۆ وەرگرتنی دەنگ پێویستن و ئەندامانی وتن ، کە بۆ بەرهەمهێنانی دەنگەکانی ئاخاوتن گرنگن ، دەگرێتە خۆ . لەباری فیزیۆلۆژییەوە ، ئاخاوتن وەك یەکێك لە ئەرکەکانی سیستەمی دەمارە ناوەندییەکانی مرۆ خۆی دەنوێنێ . لە لایەکەوە ، سیستەمی دەمارەکان دەبێتە هۆی پەیدابوونی دەنگەکانی ئاخاوتن ، لە لایەکی دیشەوە لە بیستنی دەنگەکانی ئاخاوتن لە

دەرەوە و هەستپێکردنیاندا بەشداری دەکا . بە واتایێکی دی لەباری بەرهەمهێنانی دەنگدا وزەی دەمارەکان دەبێتە کارێکی ئامێرایەتی و لە باری وەرگرتن و تێگەیشتنی ئاخاوتنیشدا وزەی ئامێرایەتی دەگۆڕرێ بۆ دەماری (بڕوانە : وێنەی ژ ٤ ) .




وێنەی ژ ٤

پشتەی وتن

ئەندامەکانی ئاخاوتن (یاخود بە واتاییێکی تەسکتر - ڕشتەی ئاخاوتن) پێکهاتووە لە : ڕشتەی هەناسە و ئەوك و مەلاشوو . ڕشتەی ئاخاوتن ئامێری فووپیاکردنی مۆسیقی دێنێتەوە یاد : سی یەکان - وەك مووشەدەمە ؛ ئەوکی هەناسە - بۆری ؛ بۆشایی دەم - دەرچە .

ئەندامەکانی هەناسە - بریتی یە لە سی یەکان و بۆریچە (الشعبە) و بۆریی هەوا . سی یەکان و بۆریچە - چاوگ و بەرێوەبەری لووزەوی ئەو هەوایەن ، کە ئەندامەکانی ئاخاوتنیان لێ پەیدا دەکا . هەناسەدان خۆی لە خۆیدا کارێکی ناگایە(خۆنەویستە - لاارادی) . هەناسەی ئاخاوتن ئەگەرچی وەك هەناسەی فیزیۆلۆژی بە دەمدا تێدەپەڕێ ، بەلام خاوەنی ئەو تایبەتێتی یەیە ، کە هەناسەکێشانی لە هەناسەدانەوەی زیاترە و بەو جۆرە هەوا لە سی یەکاندا هێندە دەمێنێتەوە بۆ ئەوەی بتوانرێ بەردەوامیی هەناسەدانەوە و پێکهێنانی فشاری هەوای پێویست بۆ لەرینەوەی دەنگەژێکان دابین بکرێ . لە باری هەناسەدانی ڕاستی ئاخاوتندا ، دروستبوونی دەنگ - واتە دروستبوونی دەنگی دەربڕراوی ئاخاوتن - دەستی پێ کرد ،

کە لەگەڵ دەستپێکردنی هەناسەدانەوەدا جووت دێن (*).

(*) دەنگەکانی ئاخاوتن وەك شتێکی ئاسایی لە هەناسەداندا دروست دەبن و بەزۆریش لە هەناسەدانەوەدا . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە زماناندا کۆنسۆنانت هەیە ، کە لە هەناسەداندا دروست نابێ ، بەڵکو لە بزووتنەوەی مژیندا پەیدا دەبێ – واتە مژینی زمان بە ئاسمانەی دەم و لێو و ئەندامی دی . لە باری مژیندا ژاوەژاو یان دەنگی وەك چەقەنە بەرگوێ دەکەوێ . ئەو جۆرە کۆنسۆنانتانەش زاراوەی کۆنسۆنانتی چەقەنەیییان بەسەردا دابڕاوە . ئەمانەش لەحاڵەتی دەربڕینی هەست و نەست (بەوێنە لە دەربڕینی پەژارەدا) و بانگکردن (لە کاتی ڕووکردنە گیانداردا) . دەنگی چەقەنەیی دەوری دروست کردنی وشەش دەبینێ ، بە وێنە لە زمانە گۆتێنتۆتۆ– بوشمانییەکاندا لە سەدا هەژدەوە تا سەدی سی ، ناو و ڕەگی کردار بە دەنگی چەقەنەیی دەست پێدەکەن . ئی. ئا. گۆنچاڕۆڤ دەربارەی دەنگی چەقەنەیی سەرنجی خۆی بەم چەشنە دەربڕیوە : (من لەمێژووەوە ئەوەم بیستبوو ، کە زمانی بوشمانی هەمووی لەدەنگی ئەوکی و چەقەنەیی پێکهاتووە و هەر لەبەر ئەوەشە ناتوانرێ بە نووسین دەربڕدرێ . ویستم ئەمە تاقی بکەمەوە و داوام لێ کرد بە زمانی بوشمانی پێم بڵێ : (بە زمانی ئێوە (باوك) چی پێدەڵێن ؟) . کابرای بوشمانی لەسەرخۆ دەمی کردەوە و بە زمان چەقەنەیێکی لێدا و دوو نۆتی دەربڕی . ئەمجا لێم پرسی: (ئەی (دایك ؟) . کابرای بۆشمانی دیسان بە زمان چەقەنەیێکی لێ دا و دوو نۆت ، کە لەوانی پێشوو جیاوازبوون ، پەخش کرد . گەلێ پرسیاری دیم لێکرد ... وەڵامەکانی یان لە نۆتەدا ، یان لە چۆنێتی چەقەنە لێداندا دەگۆڕان) . ئی . ئا . گۆنچاڕۆڤ ، کارە کۆکراوەکانی ، ب٢ ، مۆسکۆ ، ١٩٥٢ ، ل ٢١٧ .

## وێنەی ژ ٥




ئەوك بە بارى پانى

١ و ٢ – کڕکڕاگە ؛

٢ _ لێوارەکانى دەنگەژێ ؛

٣ _ درزى دەنگ




ئەوك بە بارى درێژى

١ – بانى ئەوك ؛ ٢ – بەر دەمەى ئەوك ؛

٣ – ئەوك ؛ ٤ – بۆریى هەوا ؛

٥ – ئەلْقەى بۆریە هەوا ؛ ٦ – کڕکڕاگە ؛

٧ _ کڕکڕاگە ؛ ٨ – دەنگەژێنى ڕاستەقینە ؛

٩ – جوولەى گەدە ؛ ١٠ – دەنگەژێنى درۆزنە ؛

١١ – بنى زمان .

ئەوك – بەشی سەرووی بۆریی هەوایە . لە ئەوکدا ڕشتەی دەنگ هەیە (بڕوانە وێنەی ژ ٥ ) . ئەوك لە چەند کرکراگەیێکی بزۆز پێکهاتووە ، کە بە ماسوولکە پێکەوە بەستراون . یەکێك لە کرکراگەکان بەرەو پێش دەبزوێ و لە ڕووی پێشەوە مل دەردەپەڕێ . دەنگەژێکان بە پانایی ئەوك بەشێوەیێکی ئاسۆیی کشاون . لەنیوان ژێکاندا بۆریی هەوا هەیە (بڕوانە وێنەی ژ ٦) .
















وێنەی ژ ٦
بارە بنەڕەتییەکانی دەنگەژێکان

بۆ پێکهێنانی دەنگەکانی ئاخاوتن سێ باری دەنگەژێکان - سێ فۆرمی بۆشایی دەنگ - گرنگن . لە دەمی هەناسەدانی ئاساییدا (بەتایبەتی لە هەناسەکێشاندا) و هەروەها لە دەربڕینی کۆنسۆنانتی کپدا ، دەنگەژێکان دەکشێن و خاودەبنەوە ؛ بۆشایی دەنگیش قاڵبی فراوانی سێ سووچی وەردەگرێ ؛ لە ڕشتەی دەنگدا هیچ دەنگێک دروست نابێ . باری دووەم لە دروستبوونی دەنگدایە - واتە لە درکاندنی دەنگە بزوێنەکان و زرینگۆکەکان (resonant) و کۆنسۆنانتە ئاوازدارەکاندا . دەنگەژێکان لە یەك نێزیك دەکەونەوە و تورت دەبن ؛ لەژێر فشاری لووزەوی هەوادا دەنگەژێکان دەکشێن ، بۆ ئەوەی ڕێگە بە دەرچوونی پاڵنانی هەوا بدەن و ئەمجا دەبزوێن ؛ دەنگەژێکان دەلەرێنەوە ؛ لە بۆشاییدا لەسەر دەنگەژێکانەوە لەرینەوەی هاوئاوازی هەوا پەیدا دەبێ - دەنگ یەکێکە لە جۆرەکانی دەنگی مۆسیقی . باری سێیەم : دەنگەژێکان لە یەك نێزیك و خاون ؛ بۆشایی دەنگ داخراوە ؛ لەم بارەدا هەوا بە زەحمەت بە ئەوکدا تێدەپەڕێ . بەم جۆرە چرپە دروست دەبێ ؛ دەنگی تەوژمۆکی ئەوکی - کۆنسۆنانتی کپی کۆسپەکی ئەوکی - پەیدا دەبێ . بەوێنە کۆنسۆنانتی ئەوکی لە دەربڕینی وشەی ئۆکراینی (گۆرا)دا و درکاندنی بزوێنی سەرەتای "alle" (هەموو) ، "Apfel" ( سێو)ی زمانی ئەڵەمانیدا بەرگوێ دەکەوێ . خشۆکی زمانی ئەڵەمانی و ئینگلیزی بەتایبەتی پیتی کۆنسۆنانتی (h) ناگەیەنن . لە ئینگلیزیدا (him) تەنیا ئەوە دەگەیەنێ ، کە بزوێن سەرەتای خشۆکی هەیە . بۆیە ناشێ (h)ی

ئینگلیزی بە(x – خ)ی ڕووسی ، بگۆڕرێتەوە ، ئەگەرچی وا دێتە بەرگوێی ئینگلیز ، کە(x – خ)ی ڕووسی ، (k – ك)ەو وەك خشۆکی بەتین تەلەفوز دەکرێ .

دەورێکی دیار لە دروستکردنی دەنگەکانی ئاخاوتندا بۆشایی دەم دەیبینێ . لە بۆشایی دەمدا ژاوەژاو و ئاوازی زرینگۆکی هەمەڕەنگ دروست دەبێ ، کە بۆ پێکهاتنی زەنگ زۆر گرنگن . لێو (خوارەوە و سەرەوە) دەمی داپۆشیوە . لە بۆشایی دەمدا (بڕوانە : وێنەی ژ ٤) : ددان (سەرەوە و خوارەوە) ؛ پووك – (alveolar) (بەتایبەتی لای کۆتایی ڕەگی ددانەکانی سەرەوە) ؛ ڕەقە ئاسمانە (ئەمیش لە بەشی پێشەوە و ناوەڕاست پێکهاتووە) ؛ نەرمە ئاسمانە (تا لای زمانە بچکۆلەوە دەگرێتەوە) ؛ زمان – ئەندامی هەرە بزۆزی ئاخاوتنە و لە سەری زمان و پشتی زمان (ئەو بەشەی ڕووی لە ئاسمانەی دەمە) و بنی زمان پێکهاتووە . هەرچی پشتی زمانیشە بەسەر سێبەشدا دابەش دەبێ : پێشەوە و ناوەڕاست و پشتەوە .

ئاسمانەی نەرم ، هەروەها بە پەردەی ئاسمانەش ناودەبرێ ؛ چونکە لەڕاستیدا کونی لووت دەکاتەوە و دادەخا . لە دادانەوەی پەردەی ئاسمانەدا ، کاتێ تەوژمی هەوا بێتەگەرە دەچێتە کونە لووتەوە ، زرینگەی بیڤلۆکی سازدەبێ ، کە خاسیەتی بزوێنی بیڤلۆکی و سۆنانت و کۆنسۆنانتە . لە کاتی هەڵبڕینی و نووساندنی بە دیواری پشتەوەی گەرووەوە ، پەردەی ئاسمانە – ئاسمانەی نەرم ڕێ لە

تەوژمی هەوا دەگرێ ، کە بۆ کونەلووت بچێ ، جا لەم بارەدا دەنگی ئاخاوتنی بیڤلۆکی دروست دەبێ .

ئەندامەکانی ئاخاوتن لە ڕووی دەربڕینی دەنگەوە بەسەر چالاك و سستدا دابەش دەبن . ئەندامە چالاکەکان بزۆزن و بزووتنەوەی جۆربەجۆری پێویست بۆ ڕێگرتن بە لووزەوی هەوا ، یان ڕێخۆشکردن بۆ باش تێپەڕبوونی دروست دەکەن . ئەندامە سستەکان نابزوێن و بریتیین لەو شوێنانەی ئەندامە چالاکەکان پێوەندییان پێوە دەکا .

ئەندامە چالاکەکان ئەمانەن : دەنگەژێ ، زمان ، لێو ، ئاسمانە نەرمە ، زمانە بچکۆلە ، دیواری پشتەوەی گەروو ، هەروەها تەواوی شەویلەی خوارەوە . ئەندامە سستەکانیش : ددان ، پووك ، ئاسمانە ڕەقە ، هەروەها تەواوی شەویلەی سەرەوە .

## وتنی دەنگەکانی ئاخاوتن

بۆ دەربڕینی هەر دەنگێکی ئاخاوتن چالاکیی تاکە ئەندامێکی ئاخاوتن بەس نییە . بۆ پێکهێنانی هەر دەنگێکی ئاخاوتن پێویست بە کاری کۆمەڵە ئەندامێکی ئاخاوتنە . وتن بەو کارەی ئەندامەکانی ئاخاوتن دەوترێ ، کە بۆ دەربڕینی دەنگ پێوست بێ . بەوێنە وتنی دەنگی (ب) – ئەو بزووتنەوە و بارودۆخەی ئەندامەکانی ئاخاوتنە ، کە

یەکێتی وتن و بیستن پێکیدێنن و لەلایەن گشت ئاخێوەرانەوە وەك فۆنێم ، یان شێوەی فۆنێمی ئەو زمانە وەربگیرێ .

وتنی دەنگەکانی ئاخاوتن ئەنجامی کۆبوونەوەی کۆمەڵێ بزووتنەوە و بارودۆخی ئەندامانی ئاخاوتنە . بۆیە خاسیەتی وتنی دەنگەکانی ئاخاوتن فرەڕووە و لە (٣)وە تا(١٢) نیشانەی جیاجیای هەیە . بەوێنە خاسیەتی فۆنێمی (ی) ی ڕووسی تەنیا وەك بزوێنی کورتی ڕیزی پێشەوە دەردەکەوێ ، چونکە لە زمانی ڕووسیدا بزوێنی درێژی ڕیزی پێشەوە و لێوەکی و بیڤلۆکی نی‌یە . ژمارەی نیشانەی (بەتایبەتی هی بزووتنەوەی ئەندامەکانی ئاخاوتن) حاڵەتی دەربڕینی دەنگی کۆنسۆنانت یەکجار زۆرترە . بۆ نموونە ، خاسیەتی وتنی فۆنێمی کۆنسۆنانتی (ت)ی زمانی ڕووسی لەم نیشانانەی خوارەوە کۆدەبێتەوە :

١ - (ت) - کۆنسۆنانتە - واتە دەنگی برگەپێکهێن نی‌یە . لە وتنیدا گیربوون هەیە .

٢ - (ت) - کۆنسۆنانتی کپە - واتە ئەم دەنگە لە ژاوەژاوی ڕووت پێکهاتووە (بەڵام "د" لە دەربڕینی‌دا دەنگیش هەیە) .

٣ - (ت) - کۆنسۆنانتی کۆسپەکە ، چونکە ژاوەژاوەکەی لە ئەنجامی تەوژم و تەقینەوەی کۆسپدا پەیدا دەبێ (هەرچی "س"ە لە دەربڕینی‌دا ژاوەژاو لە تێپەڕبوونی هەوا بە نێو درزی ددان و هەڵبڕینی سەری زمان بۆ لایان پەیدا دەبێ) .




وێنەی ژ ٧

نەخشەی وتنی (ت) و (د) و (ن)

٤ - (ت) - کۆنسۆنانتی ڕەقە و ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ، کە لە دەربڕینیدا پشتی زمان بۆ لای ئاسمانە ڕەقە بەرزناکرێتەوە ( بڕوانە : وێنەی ژ ٧) .

٥ - (ت)- کۆنسۆنانتی سەری زمانییە - واتە لە دەربڕینی ئەم دەنگەدا بەشی پێشەوەی زمان (سەری زمان) چالاکە (بەڵام دەنگی "پ" لێوەکییە و "ك" دەنگی زمانییە) .

٦ - (ت) - ددانەکیی سەری زمانی‌یە ، لەبەر ئەوەی سەری زمان بە ددانەکانی سەرەوەوە دەنووسێ ، کە بریتی‌یە لە شوێنی وتنی .

٧ - (ت) - بیڤلۆکیی ددانی‌یە ، لەبەرئەوەی ئاسمانە نەرمە هەڵدراوەتەوە و بەدوای پشتی گەرووەوە نووساوە و نایەڵێ تەوژمی هەوا بۆ بۆشایی لووت بچێ (بەڵام لە دەربڕینی "ن"دا کونەلووت کراوەتەوە و دەنگی بیڤلۆکی سازدەبێ ) .

بەم چەشنە دەنگ خاوەنی خاسیەتی یەکگرتنی بزووتنەوەی گشت ڕشتەی ئاخاوتنە ، بەڵام زۆری کۆنسۆنانتەکان بە خاسیەتێکی وتن ، یان دوان لە یەکتر جیاوازن . بەوێنە کۆنسۆنانتی ددانی (ت) و (س) ؛ (ت) و (د) تەنیا لە یەك خاسیەتدا جیاوازییان هەیە : (ت) کۆسپەکە و (س) خشۆکە ؛ (ت) کپە و (د) ئاوازەدارە . (ت) و (ش) دوو خاسیەت لێکیان جیادەکاتەوە : (ش) بریتی‌یە لە گڤۆکی پێشەوەی ئاسمانەی دەم ؛ هەرچی (ت) و (ن)ە جیاوازییان لە سێ خاسیەتدایە : (ن) تەنیا خشۆکی کۆسپەك نی‌یە ، بەڵکو زرینگۆکیشە (بڕوانە: وێنەی ژ٧) .

گرانیی وتنی دەنگ لەوەشدایە ، کە بریتی‌یە لە پرۆتسێس . سێ قۆناغی وتنی دەنگ جیاکراوەتەوە ، کە ئەمانەن : هەڵمەت ، ئارام ، کشانەوە .

هەڵمەتی وتن پێکهاتووە لەوەی ئەندامەکانی ئاخاوتن لە دۆخی هێومری‌یەوە ، یان پێش وتنی دەنگەوە دێنە باری پێویستی دەربڕینی دەنگ . بەوێنە هەڵمەتی وتنی دەنگی (ت) لەوەدا ڕەنگ دەداتەوە ، کە

دەنگەژێکان دەبزوێن و خاو دەبنەوە ؛ پەردەی ئاسمانەی دەم هەڵدەبڕێ و بە کۆتایی پشتی گەرووەوە دەنووسێ ؛ سەری زمانیش بۆ لای ددانەکانی سەرەوە دەچێ .

ئارام – پاراستنی دۆخی پێویستی دەربڕینی دەنگە . لە باری دەربڕینی دەنگی کۆنسۆنانتی کۆسپەکی کپدا ، بەوێنە دەنگی (ت) ، ئارامی‌یەکەی بەرانبەر سفرە . لە باری دەربڕینی کۆنسۆنانتی کپی درێژ و بەتایبەتیش ئاوازەدار و زرینگۆکدا بە روونی هەست بە ئارام دەکرێ .

کشانەوە – وتن بریتی‌یە لە گۆڕینی ئەندامەکانی ئاخاوتن بۆ دۆخی هێمنی ، یان بۆ هەڵمەتی وتنی دەنگێکی دی . بەوێنە کشانەوە لە باری وتنی (ت) لە وشەی (ترۆزی)دا لەوەدایە ، کە سەری زمان بەرەو ئاسمانە ڕەقە بەرز دەبێتەوە ، هەرچی دەنگەژێکانیشە لێك نزیك دەکەونەوە و درێژدەبنەوە . کشانەوەی خێرا خۆی بۆ هەڵمەتی دەنگەکەی دواتر ئامادە دەکا و لەرینەوە ڕوودەدات .

خاسیەتی قۆناغەکانی وتن ، ئەوە ئاشکرا دەکا ، کە لەلایەکەوە نیمچەکۆسپەك (affricate) و دیفتۆنگ لە زماندا هەیە و لە لایەکی دیشەوە ، بوونی کار لە یەکدی کردنی دەنگ لە تەوژمی ئاخاوتندا و دیاردەی فۆنەتیکی وەك وێکچواندن (assimilation) و ... ئیسپات دەکا . خاسیەتی قۆناغەکانی وتن ، ئەو ڕاستی‌یەش ڕوون دەکاتەوە ، کە بچووکترین دانەی دەنگی بریتی‌یە لە برگە و وشەش نەپچڕانی تەوژمی ئاخاوتن پێکدێنێ .

## بنکەی وتنی زمان

ئەو دەنگانەی ئاخاوتن ، کە خاوەنی یەك جۆرە خاسیەتن ، دەشێ لە شێوەی تەلەفوزکردنیاندا جیاوازی هەبێ . ئەمەش بە ئاسانی لە بەرانبەر یەکترڕاگرتنی دەنگی وێکچوو لە زمانانی جیاوازدا دەردەکەوێ . بەوێنە (ت)ی ڕووسی و (ت)ی ئینگلیزی ، کە لە هەردوو زماندا دەنگی کۆنسۆنانتێ کۆسپەك و کپ و پێشی زمانە ، لەوەدا لە یەك جیادەبنەوە ، کە لە زمانی ئینگلیزیدا بۆ پێکهێنانی سەری زمان لە ددان و پووك گیردەکرێ ، یاخود بۆ لای ئاسمانە ڕەقە خواردەکرێتەوە . بەڵام لە زمانی ڕووسیدا بەشی پێشەوەی پشتی زمان بە کۆمی بۆ لای ئاسمانەی دەم هەڵدەبڕێ (بڕوانە : وێنەی ژ ٨ ) .




وێنەی ژ ٨
نەخشەی وتنی پشتەکی و وتنی لوتکەیی

دیاردەی هەرە دیاری ئەم ڕووداوانە ، بریتی‌یە لەو ڕاستی‌یەی گشت دەنگە هاوسەنگەکان بە هەمان چەشن دەوترێن . بۆ نموونە : لە زمانی ڕووسیدا هەموو کۆنسۆنانتە زوانەکی‌یەکانی پێشەوە بە داگرتنی سەری زمان تەلەفوز دەکرێن . ئەمە ئەوە دەگەیەنێ ، کە هەر زمانە خاوەنی بنکەی وتنی خۆیەتی ، واتە – کۆمەکی خودی بزووتنەوە و بارودۆخی ئەندامەکانی ئاخاوتن ، کە بۆ تەلەفوزکردنی دەنگەکانی ئەو زمانە پێویستە . بنکەی وتنی زمان لە ئەنجامی پێشکەوتنی مێژوویی پشتەی تەلەفوزکردنەوە پەیدا دەبێ و نەریتی وتن لە بەردەوامیی چەندین سەدەدا دەپارێزرێ .

بنکەی وتنی زمانێك لە بنکەی وتنی زمانێکی دی بە جیاوازیی ئەندامانی جۆربەجۆری ئاخاوتن و جیاوازیی یەککگرتنی بزووتنەوەی ئەندامانی هەمەچەشنی ئاخاوتن جیادەکرێنەوە . بەوێنە ، بۆ بنکەی وتنی ڕووسی بەکارهێنانی ئەندامی تەلەفوزکردنی قووڵ (زمانە بچکۆلە ، ئەوك ، دەنگەژێ) خاسیەت نی‌یە . لە زمانی ڕووسیدا کۆنسۆنانتی زوانەچکۆلەیی و گەروویی نی‌یە . لە زمانی گورجی‌دا ، بەپێچەوانەوە ، ئەو ئەندامانە لە پێکهێنانی کۆنسۆنانتدا دەورێکی گەورە دەبینن . بنکەی وتنی زمانی ڕووسی خاوەنی خاسیەتی چالاکیی بەشی ناوەندی زمانە و بەڵگەی ئەمەش بوونی کۆنسۆنانتی نەرمە لە زمانی ڕووسیدا .

لە زمانی ڕووسیدا لێو و پەردەی ئاسمانەی دەم دەوریان کەمە : بزوێنی لێوەکی ڕیزی پێشەوە و بزوێنی بیڤلۆکی نی‌یە . لە زمانی

ڕووسیدا کاری لێو لەگەڵ بنی (بەشی پشتەوەی) هەڵبڕاوی زمان یەك دەکەون . جیاوازیی ئەمە لەگەڵ زمانی ئەڵەمانی و فەرەنسیدا ئەوەیە ، کە لەم زمانانەدا بزوێنی لێوەکیی ڕیزی پێشەوە هەیە و بەرزکردنەوەی زمانیش پتر جیاوازە و بەپێی درێژیش جیاوازیی بزوێن هەیە (بڕوانە : وێنەی ژ ٩) لە زمانە تۆرانییەکاندا وتنی لێوەکی چۆن کاری سەری زمان هاوبەشیی تێدا دەکا ، بەشی دواوەی زمانیش بە هەمان چەشن خۆی دەنوێنێ .




وێنەی ژ ٩
نەخشەی بەراوردکردنی بزوێنەکانی ڕووسی و ئەڵەمانی

لە زمانی ڕووسیدا لەرینەوەی دەنگەژێکان لەگەڵ هەموو توانای وتنی دەمدا یەکدەکەوێ : زۆربەی دەنگی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار ، بەڵام ئەم دیاردەیە لە زمانە فینۆ - ئوگۆری‌یەکاندا بەپێچەوانەوەیە - واتە لەرینەوەی دەنگەژێکان بەدەگمەن لەگەڵ وتنی دەمدا یەك دەکەوێ و نەبوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەداریش لەو زمانانەدا بەڵگەی ڕاستەقینەی ئەو دیاردەیەن .

وتنی زمانی ڕووسی کەموزەیە ؛ بزوێنی داخراو و کراوە لە یەك جیاناکرێنەوە ؛ بڕگەی هێزدار خاوەنی بەردەوامێتی‌یە و لە بێهێز پتر بە ئاوازە . لە بڕگەی بێهێزدا نەك تەنیا کورت کردنەوەی چەندێتی ، بەڵکو چۆنێتی‌یش ڕوودەدات ؛ دووچەندانە (مضاعف)ی کۆنسۆنانت نی‌یە ؛ وێکچواندن چالاکە ؛ کۆنسۆنانتی گڤۆکی کۆتایی بڕگەی داخراو تینی تەلەفوزکردنی لاوازە و ئاوازەداریش کپ دەبێ ؛ بزوێن و تەنانەت کۆنسۆنانتیش ، کە لە پێش کۆنسۆنانتی بیلڤۆکی‌یەوە دێن ، شێوەی بیڤلۆکی وەردەگرن .

-٢-

## بنچینەی دابەشکردنی دەنگەکانی ئاخاوتن

ژمارەی دەنگەکانی ئاخاوتنی گشت زمانانی جیهان یەکجار زۆرە . بەڵام دەنگەکانی ئاخاوتنی زمانێکی دیاریکراو زۆر نی‌یە و دەشێ خۆی لە پەنجا فۆنێم بدات . گشتێتی و وێکچوونی ئەو ژمارە

کەمەی دەنگەکانی ئاخاوتنی زمانانی جیاواز هەلومەرج بۆ دانانی بنچینەی دابەشکردنێک دەرەخسێنن ، کە بۆ زۆربەی زمانان بگونجێ . ئەمەش بە ئاسانی ئەوە نیشان دەدا ، کە ڕشتەی ئاخاوتن لای گشت خەڵك و میللەتان خاوەنی یەك سەرچاوەیە .

## بزوێن و کۆنسۆنانت

لە گشت زمانانی جیهاندا دوو جۆر دەنگی ئاخاوتن هەیە : بزوێن و کۆنسۆنانت . کۆمەڵی بزوێن ڤۆکالیزم (Vocalism) پێك دێنێ و کۆمەڵی کۆنسۆنانتیش – کۆنسۆنانتیزم (Consonantism) . ڤۆکالیزم و کۆنسۆنانتیزم سیستەمی زمانێکی دیاریکراو پێك دێنن .

بزوێن و کۆنسۆنانت بە ئەرك و وتن و تا ڕادەیەکیش بە بیستن لێك جیادەکرێنەوە . جیاوازیی سەرەکیی بزوێن و کۆنسۆنانت بریتییە لە دەوریان لە ڕۆنانی وشەدا . بۆنموونە، لە وشەی (تەرزە)دا سێ کۆنسۆنانت هەیە ، بەڵام بزوێنەکان دوانن و دوو بڕگەیان : (تەر) و (زە) دروست کردووە . بزوێن لوتکەی بڕگە پێکدێنێ و وەك سۆنانت خۆی دەنوێنێ . کۆنسۆنانتیش هاوەڵیی بزوێن دەکا ، لەو زمانانەدا کە سۆنۆر دەوری دروستکردنی بڕگە بەجێدێنن ، لە بارودۆخی بزوێندا دەردەکەون ، بەوێنە لە زمانی چیکیدا "پرڤ" (یەکەم) ، "ڤلك" (گورگ) ... ئەم تەباییە دەتوانێ ببێتە ڤۆکالیزم ، بەوێنە لە سێربەکرواتیدا "ڤورگ" (گورگ) ؛ "ڤوونا" (خوری) ؛ "خوم" (گرد)

... بەپێچەوانەشەوە ئەگەر بزوێن بێتە بارودۆخی کۆنۆنسۆنانتەوە ، ئەوە خاسیەتی بڕگە دروستنەکردن وەردەگرێ .

جیاوازیی وتنی بزوێن و کۆنسۆنانت بریتی‌یە لە جیاوازیی تاو و تینی ڕشتەی تەلەفوزکردن و نەبوون یان بوونی ئاسۆی دروستبوون . لە دروستبوونی بزوێندا جۆگەی ئاخاوتن کراوەیە ؛ تین و وزە هەموو ڕشتەی تەلەفوزکردنی گرتووەتەوە ، لووزەوی لاوازی هەوا لە سەرلەبەری ڕێگەیدا هیچ شتێك بەری‌ناگرێ . بەلام لە دروستبوونی کۆنسۆنانتدا تاووتین پەنگی خواردووەتەوە و لە بەردەم بەربەستێکدا گیری خواردووە ، لووزەوی بەهێزی هەوا بە بەربەستەکەدا تی‌دەپەڕێ و دەیتەقێنێتەوە ، یان بە کونێکدا خۆی دەرباز دەکا و ئەو ژاوەژاوە خاسیەتی کۆنسۆنانت پێکدێنێ .

وتنی بزوێن بەرانبەر ژاوەژاوە ـ واتە کۆنسۆنانتی کپی وەك (ف) و (پ) ـ دژ ڕادەوەستێ ؛ لەنێوان بزوێن و ژاوەژاودا لە سەرێکەوە کۆنسۆنانتی ئاوازەدار جێی خۆی کردووەتەوە و لەسەرێکی دی‌یەوە زرینگۆك .

بوونی دوو دەستەی دەنگەکانی ئاخاوتن (بزوێن و کۆنسۆنانت) ، کە بەجۆری وتنیان لێك جیادەکرێنەوە ، دەمانگەیەنێتە ئەوەی دابەش‌کردنی بزوێن بەجیا لە دابەش‌کردنی کۆنسۆنانت دابنێین . قۆناغەکانی ئەم دیاردانە جیاجیا دەخەینە پێش‌چاو .

## دابەش‌کردنی بزوێنەکان

سەرجەمی بزوێنەکان دەنگی زرینگۆك و خشۆکن ، لەبەرئەوە کاری دەنگەژێکان و شێوازی وتن ناتوانن ببنە بنچینەی دابەش‌کردنی بزوێنەکان . بنەمای دابەش‌کردنی بزوێنەکان بریتی‌یە لە ڕیز و ڕادەی هەڵبرینی زمان و هەروەها کاری لێو . سەرباری ئەوانەش کاری لووت و تین و درێژی لە نەزەر دەگیرێ .

ڕیز – بەو دەنگە دەوترێ ، ڕاستتر ئەو بەشەی زمان ، کە بۆ دروستبوونی دەنگێکی دیاریکراو هەڵدەکشێ . سێ ڕیز بزوێن جیادەکرێتەوە : پێشەوە ، ناوەڕاست ، پشتەوە . بە نموونە لە زمانی کوردیدا (ی) و (ێ) بزوێنی ڕیزی پێشەوەن ، (i) و (و) و (ە) _ ڕیزی ناوەڕاست، (وو)و (ۆ)و (ا)ش_ ڕیزی پشتەوە .

هەڵبرین – بە ڕادەی بەرز و نزمی زمان لە دروستبوونی دەنگێکی دیاریکراودا دەوترێ . سێ ڕادەی هەڵبرین جیاکراوەتەوە : سەروو ، ناوەڕاست ، خواروو . بە بزوێنی ڕادەی هەڵبرینی سەروو دەوترێ تەنگ ، ڕادەی هەڵبرینی مامناوەند _ ناوەڕاست ، ڕادەی هەڵبرینی خواردوو _ فراوان . بە باری لێو بزوێن دابەش دەبێ بەسەر لێوەکی و نالێوەکیدا .

بزوێنەکانی زمانی کوردی بەپێی ڕیز و هەڵبڕین و کاری لێو دەتوانرێ بەشێوەی ئەو خشتەو وێنانەی [٦] خوارەوە خۆیان بنوێنن :




| پشتەوە | ناوەڕاست | پێشەوە | | ا ، ە ، ێ ، ی ، i ، ۆ ، وو ، و |
|---|---|---|---|---|
| ڕیز | | | | |
| وو | | ی | سەروو | ڕادەی بەرز و نزمی |
| ۆ | i<br>و | ێ | ناوەڕاست | |
| ا | ە | | خواروو | |

[٦] ئەو وێنانەی بۆ نیشاندانی چۆنێتی دەربڕینی دەنگەبزوێنەکانی زمانی کوردی خستوومانەتە پێش چاو، لە کتێبی (ئی. ئا . سمیرنۆڤا ، ک . ڕ . ئەیووبی ، فۆنەتیکی زمانی کوردی – دیالێکتی موکری لینینگراد ، ١٩٨٥ ، ل (١٢ – ٢٣)ەوە وەرمان گرتووە .





وێنەی باری لێو
د دەربڕینی (١)دا
فۆنیمی

وێنەی خاڵی تێلاکەوتنی زمان و
مەلاشوو لە دەربڕینی (١)دا
فۆنیمی



شەبەنگی فۆنیمی (١)



وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنیمی (ۆ)دا



وێنەی خاڵی لێکدەوتنی
زمان و مەڵاشوو
لە دەربڕینی فۆنیمی (ۆ)دا



شەبەنگی فۆنیمی (ۆ)



وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنیمی (یٚ)دا



وێنەی خاڵی لێکەوتنی زمان و مەلاشوو
لە دەربڕینی فۆنیمی (یٚ)دا



شەبەنگی فۆنیمی (یٚ)



وێنەی خاڵی لێدانی کەوتنی
زمان و مەلاشوو لە
دەربڕینی فۆنێمی (ی)دا



وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنێمی (ی)دا



شەبەنگی فۆنێمی (ی)



وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنێمی ( و )دا



وێنەی حاڵی لێکەوتنی زمان و
مەڵاشوو لە دەربڕینی فۆنێمی
( و )دا



شەبەنگی فۆنێمی ( و )



وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنیمی (ە)دا[1]



وێنەی خاڵی لێکەوتنی
زمان و مەلاشوو لە
دەربڕینی فۆنیمی (ە)دا[1]



شەبەنگی فۆنیمی (ە)



وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنیمی (وو)دا



وێنەی خاڵی لێکەوتنی
زمان و مەڵاشوو لە
دەربڕینی فۆنیمی (وو)دا



شەبەنگی فۆنیمی (وو)


وێنەی باری لێو
لە دەربڕینی فۆنێمی ( ی )دا


وێنەی خاڵی لێک کەوتنی
زمان و مەلاشوو لە
دەربڕینی فۆنێمی ( ی )دا


شەبەنگی فۆنێمی ( ی )

لە هەندێ زماندا ، وەك دەنگــی تایبــەتی ئاخـاوتن ، بزوێنــی بیڤلۆکی هەیە . بزوێنی بیڤلۆکی لە زمانی سلاڤیانیی کۆندا هەبووە و پیتی تایبەتیشیان بۆ دانراوە . بزوێنـی بیڤلۆکـی لـە زمـانی پۆلۆنیـی ئەمڕۆدا پارێزراوە و لە نووسیندا نیگاری تایبەتی‌یان هەیە : "nioȩe" (دەیبەم) ؛ "moz" (مێرد) . بزوێنـیٚ بیڤلۆکـی لە ڕووی ڕیـزەوە لەیـەك جیادەبنەوە . بەوێنە لە نموونەی دووەمدا ( ȏ) بیڤلۆکی ڕیزی پێشەوە نی‌یە .

لە زمانی فەرەنسی‌دا چوار بزوێنی بیڤلۆکی هەیە : ( ȃ) ؛ ( ɔ̂)؛ (oe͡) ؛ (ɛ̂) . بۆ بزوێنی بیڤلۆکی یەکەم ، هاوشانی نابیڤلۆکی نـی‌یە : "temps" _ "tã"_ (کـات) . بزوێنــە بیڤلۆکی‌یــەکانی دی هاوشـــانی نابیڤلۆکی (پاك)یان هەیە : "bond" _ "bɔ̃" _ (بان) و "boa"_ "bɔa" _ (هەژدیـــها) ؛ "brun" _ "bRȏe" ـــ ( قـــژڕەش) و "peuple" _ "poepll" . (گـەل) ؛ "pain" _ "pɛ̃" _ (نـان) و (pere) _ "p ɛ iR" _ (بـاوك) .. بزوێنــی بیڤلۆکــی لــە زمــانی فەرەنســی‌دا لــە ئــەنجامی یەکگەوتنی بزوێن و کۆنسـۆنانتی بیڤلۆکی‌یـەوە پـەیدادەبێ ، ئـەویش کاتێك دەکەونە باری کۆتـایی و پێش کۆنسۆنانتی تەلەفوزنەکراوەوە . وتنی بزوێنـی بیڤلۆکـی لـەباری هـەڵبڕینی پـەردەی ئاسمانـە و پشـتی زمانی هێنراوە خوارەوەدا ئەنجام دەدرێ ، هەرچی لووزەوی هەواشە لە یـەککاتدا و بـە شـێوەیێکی یەکسـانی دەکەوێتـە بۆشـایی دەم و کونـە لووتەوە .

لە زمانی ڕووسیدا بزوێنی درێژ و كورت لە بارودۆخی فۆنەتیكی جیاوازدا دەبینرێ . لە فۆرمی كۆی ناوی وشەی (سیبیریاكی)دا ، دوو (ی)ی یەكەم ، لە بڕگەی بێهێزدان ، سێ جار لە (ی)ی بڕگەی هێزدار كورتترن . بزوێنی ڕووسی لە ژێر هێزدا درێژییان جیاناكرێتەوە . سیستەمی بزوێنی گەلێ زمان جووتیی بزوێن بەپێی درێژی دروست دەكا .

لە زمانی كوردیشدا لە كورت و درێژیی بەدەمدا هاتنی بزوێنی (وو ـ û)دا چەندین نموونەی ئاشكراهەیە . بەوێنە ئەو بزوێنە لە (نووسین ، پێنووس)دا درێژتر تەلەفوز دەكرێ وەك لە (نووسرا...)دا . هۆی ئەمەش ، ئەوەیە كە لە وشەكانی (نووسین ، پێنووس....)دا ، هێز لەسەر دەنگی (وو ـ û)ە ، بەلآم لە وشەی (نووسرا)دا، هێز دەخرێتە سەردەنگی (ا) . دیاردەی گوێزانەوەی هێزیش لە بڕگەیەكەوە بۆ بڕگەیەك لە زمانی كوردیدا زۆر باوە .

بزوێنی درێژ و بزوێنی كورت لە زمانی چیكی و فینلەندی و یاكووتی ...دا هەیە ، بە وێنە لە چیكیدا "پاس" (پشتێن) و "پەس" (پەساپۆرت) ؛ "بووتی" (بوون) و "بووتی" (بژێوی) ؛ "دراهـا" (ڕێگە) و "درەهـا" (خۆشەویست) ... فینلەندی: "ڤـەرا" (ئـازاد) و "ڤـەرە" (ڕێ) ... یاكووتی : "مـاس" (بەرد) و "مـەس" (دەرەكـی) ؛ "بییل" (كەلەكە) و "بیل" (زانین) ... ئەم دیاردەیە لە زمانی كوردیشدا بە هەمان شێوەیە : "چاك" و "چەك" ؛ "كووڕ" و "كوڕ" ...

درێژى و كورتـى بزوێـن لـه زمـانى يۆنـانى كـۆن و لاتينىيشـدا هـەبوو ، لەسـەر بنچينـەى هـاوپێوەندى درێژى و كورتـى برگـه ، كێشـى شيعريان دانا .

وێـراى بزوێنـى درێـژ ، لـه زمانـانى جيـهاندا ديفتۆنـگ (diphthong)[٧]يش هەيه – واته بزوێنـى وتـن ئـاڵۆزى لـه يـەك برگـه تەلـەفوزكراوى وەك يـەك دەنگـى ئاخـاوتن خۆنوانـدوو . بـه نموونـه ، ديفتۆنگـى (ōu)ى ئينگلـيزى لـه وشـەكانى (go) و (home) و (no)دا (o)ى سەرەتا به يەك گوژم تەلەفوزدەكرێ . (u)ىماكى دووەم لەحاڵەتى ئاسـاييدا تەلـەفوزكردنى كـەمتر ڕوونـه ، واتـه خليسـكاو و كـورت و ناتەواوه . زمان له دەربڕينى سەرەتاى ديفتۆنگدا بۆ لاى ڕەگ ناكشێ ؛ بەشى نێوان ناوەڕاست و دواوەى پشتى زمان دەنووشتێتەوه ؛ لێوەكان دەرناپـەڕن . جـا (θ) شـێوەى دەنگـى (ə) وەردەگـرێ . كەواتـه هيـچ يەكێك له ماكەكانى ئەو ديفتۆنگه وێكچوونـى تـەواويان لەگـەڵ دەنگـى بزوێندا وەرناگرن _ واتـه لـه دوو دەنگـى بزوێـن دەنگێكـى ديفتۆنگـى پـەيدا دەبـێ . تەلـەفوزى بـارى بزوێنـى ئـەو دوو بزوێنـەش جيـاوازه لەبارى يەكگرتنيان و پێكهاتنى ديفتۆنگىدا .

---

[٧] ديفتۆنگ به گريكى واتاى (دووبزوێنى ، جووتەبزوێن ، بزوێنى دوولانه) دەدات و له دوو بەش پێكهاتووه : "دى" (دووجار) و "فتۆنگ" (دەنگ) .

دیفتۆنگ دابەش دەبێ بەسەر داکشاو[٨] و هەڵکشاودا[٩] . لە دیفتۆنگی داکشاودا ماکی یەکەم بەتینە ، بەوێنەی دیفتۆنگی (ou)ی ئینگلیزی و (ae)ی ئەڵەمانی ... هەرچی دیفتۆنگی هەڵکشاوە ماکی دووەمی بەتینە ، بەوێنە (uo)ی ئیسپانی ...

هەردوو دیفتۆنگی (وێ) و (وی)ی زمانی کوردی دیفتۆنگی داکشاون ، لەبەرئەوەی ماکی یەکەمیان بەتینە . ئەگەر (وا) : (سوار ، شوان ، توان...) دیفتۆنگ بوایە[١٠]، ئەوە هەڵکشاو دەبوو ، چونکە ماکی یەکەمی لە ماکی دووەمی لاوازترە .

پێویستە دیفتۆنگ لە دیفتۆنگۆید (diphthongoid) جیابکرێتەوە . دیفتۆنگۆید - ئەو بزوێنانەن کە هێز (stress)یان لەسەرە و لە سەرەتایانەوە یان کۆتاییانەوە تەئسیری دەنگی بزوێنێکی دی لێوە نزیکیان لەسەرە .

[٨] دیفتۆنگی داکشاو (Falling diphthong) _ خاوەنی خاسیەتی لاوازبوونی تینی ئەندامانی ئاخاوتنە لە کۆتایی تەلەفوزکردندا ، هەرچی چالاکییەکەیەتی دەکەوێتە سەرەتاوە .

[٩] دیفتۆنگی هەڵکشاو (rising diphthong) _ خاوەنی خاسیەتی بەهێزبوونی تینی ئەندامانی ئاخاوتنە لە کۆتایی دەربڕیندا ، بەڵام لە سەرەتادا بەکزی دەست پێدەکات .

[١٠] ئەگەرچی هەندێ لە زانایان (وا)شیان وەك (وێ ، وی) بە دیفتۆنگ داناوە (بەوێنە ، بڕوانە: کەریمی ئەیووبی و ئی . ئا . سمیرنۆڤا ، دیالێکتی کوردی موکری ، لێنینگراد ، ١٩٦٨ ، ل١٢) .

## دابەشکردنی کۆنسۆنانتەکان

ئەگەر لە خاسیەتی بزوێنەکاندا کاری دەنگەژێکان و شێوەی وتن لەنەزەر وەرنەگیرابێ ، ئەوە لە لێکدانەوەی کۆنسۆنانتەکاندا ئەو خاسیەتانە بنەمای دابەشکردنیانن . دابەشکردنی کۆنسۆنانتەکان گرانتر و ئاڵۆزترە ، چونکە لە زمانانی جیهاندا ژمارەی کۆنسۆنانت لەنێوان (٥٠٪) تا (٩٠٪)ە . لە زمانی ئینگلیزیدا ٢٤ کۆنسۆنانت و ٢١ بزوێن هەیە (ئەو زۆربوونەی بزوێن ئەنجامی بوونی بزوێنی درێژو و دیفتۆنگە) . دەنگەکانی ئاخاوتنی زمانی ڕووسی بریتی‌یە لە ٤٣ کۆنسۆنانت و ٦ بزوێن ؛ زمانی فەرەنسی ٢١ کۆنسۆنانت و ١٣ بزوێن ؛ زمانی لیتوانی ٤٥ بەرانبەر بە ١٢ ؛ زمانی ئەرمەنی ٣٠ و ٦ ؛ زمانی کوردی ٨ بزوێن و ٣ دیفتۆنگ و ٢٨ کۆنسۆنانت ...

بنچینەی دابەشکردنی کۆنسۆنانتەکان بریتی‌یە لە چوار خاسیەتی سەرەکیی وتن : شێوەی دەربڕین ؛ ئەندامی چالاك ؛ شوێنی دەربڕین ؛ کاری دەنگەژێکان (بڕوانە : نەخشەی ژ ١٠) .

شێوەی وتنی کۆنسۆنانتەکان بە خاسیەتی قوتاربوون لە بەربەست و تێپەڕبوونی لووزەوی هەوا و دروستبوونی ژاوەژاوی پێویست بۆ پێکهێنانی کۆنسۆنانت دەوترێ . دوو شێوەی سەرەکیی وتنی کۆنسۆنانتەکان جیادەکرێنەوە : کۆسپ و دەرباز . جا شتێکی سروشتی و ئاسایی‌یە ، ئەگەر بەپێی شێوەی وتن کۆنسۆنانت بەسەر (کۆسپەك) و (خشۆك)دا دابەش ببێ .

| ئەندامی جاڵات | | لێوەکی | | | | سەری زمان | ناوەڕاستی زمان | | دواوەی زمان | دواوەی زمان | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| شێوەی دەربڕین | شوێنی دەربڕین | لێوەکی | ددانی | | | مەلأشوویی | | | | | زرینگۆکی |
| | | | ددانی | دزری ددان | ددانی | پێشەوەی مەلأشوو | ناوەڕاستی مەلأشوو | | دواوەی مەلأشوو | | |
| کۆسپەک | تەرزمۆک | پ پە ب بە | | | ت تار د دەر | ت - T - ی هیندیی کۆن hala د - d ی هیندیی کۆن khadga | (ط) ی عەرەبی طالة | (ظ) ی عەرەبی ظلم | ک کا گ گا | (ء) هەمزەی عەرەبی | زگورگوویی |
| | نیمچە کۆسپەک | Pf ی ئەڵمانی pferd | | | (تس)ی پرووسی تسیل | چ چار ج جار | | | | | |
| خشۆک | | و - W وڵزی | ف کەف ڤ ناڤ | (ث) ی ئینگلیزی thing (ذ) ی ئینگلیزی this | س باس ز باز | ش شار ژ ژار | (ل) ی ئەڵمانی Ich | غ غەم | خ خەو | هـ هاژە | |
| کۆسپەکی خشۆک | بیلۆک | م مار | | | ن ناو | (ن)ی هیندیی کۆن rana | ۳ فەرەنسی Sire | Tj ی تەتەری یانە | | | زرینگۆک |
| | تەنیشت | | | | ل کەل ڵ کەڵ | | | | | | |
| | لەرزۆک | | | | | ر کەر ڕ کەڕ | | | | R ی فەرەنسی frere | |

کۆنسـۆنانتی کۆسـپەك لـە ڕێگـەی تەقینـەوەی بەرهەڵسـت بـە لـووزەوی هـەوا دروسـت دەبـێ ، بۆیـە کۆنسـۆنانتی کۆسـپەك بـە (تەقینـەوە)ش نـاودەبرێ . دەنگـی (پ) ، (ب) ، (ت) ، (گ) ... هتـد کۆسپەکن . دروستبوونی کۆنسۆنانتی خشـۆك ئـەنجامی لـێخشانی لـووزەوی هەوایـە لـە دیـواری ئـەو تێپەرگەیـەی لـە نزیکبوونـەوەی ئەندامەکانی ئاخاوتنی بۆشایی دەم پێکدێ . بۆیە کۆنسۆنانتی خشۆك بە (درێژەپێدراو ، فووتێکراو ، ڕەوان...) یش ناودەبرێ .

لەتەك کۆنسۆنانتی کۆسپەك و خشۆکی پوختدا ، کۆنسۆنانتی ئاڵۆز (ئاوێتە)ش هەیە . ئەمانیش دوو جۆرن : لەسەرێکەوە زرینگۆك و لە سەرێکی دیەوە نیمچەکۆسپەك . لەنێو کۆنسۆنانتە زرینگۆکەکانی زمانی کوردیدا (م) و (ن) بیڤلۆکین و (ل) و (ڵ) و (ر) و (ڕ)ش لەرۆکن . وتنی کۆنسـۆنانتی زرینگـۆکی لـەرۆك دەمێك بەجێدێ ، کـە لـووزەوی هـەوا لـە کۆسـپ دەربـاز دەبـێ و بـە درزێکـدا تێدەپـەڕێ . بـەڵام لـە تەلەفوزکردنی کۆنسۆنانتی زرینگۆکی بیڤلۆکدا بەرهەڵست تێکناچێ و دەمێنێتـەوە ، چونکـە بەشـێك لـە لـووزەوی هـەوا بـە کونـە لووتـدا تێدەپەڕێ ...

دروسـتبوونی نیمچـە کۆسپەك بەندە بە درێژیی کۆنسـۆنانت و تەواوکـەری وتنـەوە . لـە زمـانی ڕووسـیدا کۆنسـۆنانتی دووتـۆی لـە بەیەکگەیشـتنی مۆرفێـمدا پـەیدا دەبـێ . وەك : (ن) - "سـتیننۆی" (دیواری) ، لە "ستێن"ەوە کە بنـەمای "ستینا" (دیـوار)ە + "نۆی" کە

پاشگره "د" - "پۆددێرژات" (پشتگیریکردن) ، کە لە پێشگری "پۆد" و "دێرژات" (گرتن) پێکهاتووە .

لە زمانی کوردیشدا "ن" - "بردماننەوە" : (ن)ی یەکەم کۆتایی جێناوی کەسی یەکەمی کۆی دەستەی بەهێز (مان) ، کە کارایە . (ن) ی دووەم جێناوی کەسی سێیەمی دەستەی بێهێزە ، کە بەرکارە . "ت" - "کوشتت" : (ت)ی یەکەم کۆتایی قەدی چاوگی (کوشتن)ە و (ت)ی دووەم جێناوی لکاوی کەسی دووەمی تاکی دەستەی بەهێزە ؛ "کورتتر" : (ت)ی کۆتایی مۆرفێمی (کورت) + (ت)ی سەرەتای مۆرفێمی (تر) . "م" - "مۆمم" : (م)ی کۆتایی وشەی (مۆم) + (م)ی جێناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکی دەستەی بێهێز . "ك" - "چاککەر" : (ك)ی کۆتایی مۆرفێمی (چاك) و (ك)ی سەرەتای مۆرفێمی (کەر) ؛ "پاککەر" : (ك)ی کۆتایی مۆرفێمی (پاك) و (ك)ی سەرەتای مۆرفێمی (کەر) ؛ هەروەها "پەککەوتن" و "چاککردن" ... هتد .

کۆنسۆنانتەکانی زمانی ڕووسی لە کپی و ئاوازەداری ؛ ڕەقی و نەرمی ؛ کۆسپەکی و خشۆکیدا بەرانبەر یەك دەوەستن . بەرانبەر یەکتر وەستانی کورتی و درێژی خاسیەتی زمانی ڕووسی نییە . لەم ڕووەوە زمانی ڕووسی لە هەندێ زمان جیادەبێتەوە ، بەوێنە لە زمانی فینلەندی ، یان زمانانی دی فینۆ - ئوگۆری . لەم زمانانەدا درێژی و کورتی زۆر ئاشکرا دەور دەبینێ .

بەوێنە لە زمانی ئەستۆنیدا کۆنسۆنانتیش وەك بزوێن ، خاوەنی سێ پلەی درێژییە : (پ) و (ك) دەشێ کورت بن : "پۆلێت"

(دەسوتیٚ) ؛ "کامین" (بەرد) ... یان درێژ : "پۆللید" (بەروانکان) ؛ "کاممین" (دەیخورێنم) ... یان زۆر درێژ : "پۆللیٚ" (بەروانکە) ؛ "کاممینا" (خوراندن) ...

درێژیی کۆنسۆنانت پتر بە پێکهێنانی نیمچە کۆسپەکەوە بەندە . وتنی نیمچە کۆسپەك لە بەیەکگەیشتنەوە دەست پیٚدەکات و بەدوایدا تەقینەوە روونادات (هەرچی لە وتنی "ب" و "ت" دایە بەدوا بەیەکگەیشتندا تەقینەوە پەیدا دەبیٚ) - بە واتاییکی دی نیمچەکۆسپەك لە رووی هەڵمەتەوە کۆسپەکە ، بەلاّم لە رووی کشانەوەوە خشۆکە . نیمچە کۆسپەك نە بە ماکە پێکهێنەکانی و نە بە درێژییەکەی لەگەڵ کۆنسۆنانتەکانی دی زماندا هاوکێش نییە . بەوێنە (چ) کە دەنگێکی کۆنسۆنانتی نەرمە ، ماکی دووەمی ئاوازی (ش) دێنێتەوە یاد ، کە لە رووسیی ئەمرۆدا هەمیشە دەنگێکی رەقە .

کۆنسۆنانتەکان لە رووی نیشاندانی ئەندامی چالاك و شوێنی وتنییەوە وردتر دابەشکراوە - واتە لە دیاریکردنی ئەو نوقتەیەی ئەندامی چالاك لێی نێزیك دەبێتەوە و کۆسپ یان درز پێك دێنیٚ ، کە لووزەوی هەوا پێیدا دەرباز دەبیٚ و ژاوەژاو سازدەکا . لە دەمێکی زۆر زووەوە کۆنسۆنانتەکانیان بەپێی شوێنی وتن دیاریکردووە و وتوویانە : (ت) پیتی ددانییە ، (ك) پیتی ئاسمانەی دواوەیە ... هتد . لە کۆتایی سەدەی (١٩)ەوە ، کەوتنە ئەوەی بەر لە هەرشت کۆنسۆنانتەکان بە شوێنی وتنیاندا دابەش بکەن : (ت) - کۆنسۆنانتی سەری زمان ؛ (ك) - بنی زمان . دابەشکردنی کۆنسۆنانتەکان بەپێی

چالاکیی ئەندام لەلایەن ژ . رۆسلۆی دەنگسازی فەرەنسایی و ۆ . ئیسپیرسینی دانیمارکی و ل . ڤ . شیربای زمانناسی سۆڤیتی‌یەوە گەشەی پیدرا .

کۆنسۆنانت بەپێی چالاکیی ئەندام بەسەر سێ رەگەزدا دابەش دەبێ : لێوەکی و زوانەکی و ئەوکی . لەنێو کۆنسۆنانتە زوانەکی‌یەکانی زمانانی جیهاندا پتر هەمەجۆر و فراوان ، کۆنسۆنانتەکانی سەری زمانن .

لەنێو کۆنسۆنانتی لێوەکی‌دا ، پتر لێوەکی – لێوەکی (هەردوو لێو) – bilabial دەردەکەوێ و کەمتریش لێوە – ددانەکی labiodental . لە وتنی کۆنسۆنانتی لێوە – لێوەکی‌دا لەیەك نێزیکبوونەوەی هەردوو لێو ، یاخود یەکگەوتنیان ئەنجام دەدرێ ، وەك: ب ، پ ، م ... بۆ وتنی کۆنسۆنانتی لێوە – ددانەکی‌یشدا لێوی خوارەوە لە ددانەکانی سەرەوە نێزیك دەبێتەوە ، وەك لە تەلەفوزکردنی گڤۆکی (ف) ، (ڤ)دا دەبینرێ .

دەنگە کۆنسۆنانتە زوانەکی‌یەکان بەسەر ریزی پێشەوە و ناوەراست و دواوەدا دابەش دەبن . کۆنسۆنانتەکانی ریزی پێشەوە ، بە شوێنی دەربرینیاندا دەشێ ددانەکی و پێشەوەی ئاسمانەی دەم بن ، بەوێنە : س ، ش ، چ ... بەپێی سەرنجی وتن ، کۆنسۆنانتە ددانەکی‌یەکانی ریزی پێشەوە بە (فیکەیی) ناودەبرێن . هەرچی ئەوانی پێشەوەی ئاسمانەشن (فیشکەیی)یان پێدەوترێ . لە پێکهێنانی کۆنسۆنانتەکانی سەری زماندا هەموو رێگاکانی وتن کاریگەرن . لە

نێوانیاندا کۆسپەك و نیمچە کۆسپەك و خشۆك و بیڤلۆکی و لەرۆك ... هەیە . وێڕای ئەوەش ، خودی شێوەی وتن لە زمانانی جیاوازدا ، جیاوازە . دەنگەکانی پێشەوەی زمان بەپێی پێوەندیی بارودۆخی سەری زمان دابەش دەبن بەسەر : پشتەکی– dorsal و لوتکەیی – aprical و پۆپەیی – cocominal (بڕوانە وێنەی ژ ٨ ) .

کۆنسۆنانتی پشتەکی – dorsal (لە "dorsum"ی لاتینییەوە بە واتای "پشت" وەرگیراوە) بە نزیککرنەوەی بەشی پێشەوەی پشتی زمان لە ددانەکانی سەرەوە و ئاسمانەی پێشەوە دەوترێ . پشتەکی – dorsal زۆربەی دەنگەکانی ڕیزی پێشەوەی زمان دەگرێتەخۆ : س ، د ، ن ... کۆنسۆنانتی لوتکەیی aprical (لە "ăpex"ی لاتینییەوە بە واتای "لوتکە" کەوتووەتەوە) بە نزیککردنەوە ، یان گیرکردنی سەری زمان لە ددانەکانی سەرەوە دەوترێ ، وەك: ل ، د ... کۆنسۆنانتی پۆپەیی – cocominal (لە "căcumĕn" - "پۆپە"وە) بە هەڵبڕینی سەری زمانی بەرەو سەروو چەماوە دەوترێ . کۆنسۆنانتی پۆپەیی – cocominal دەنگی لەرزۆك و فیشکەیی و نیمچەکۆسپەك دەگرێتەخۆ – (بڕوانە : وێنەی ژ ١١) .




وێنەی ژ ١١
نەخشەی بەراوردیی
کۆنسۆنانتی (ش) و (س) و (خ)

کۆنسۆنانتی ڕیزی ناوەڕاستی زمان لە ئەنجامی نزیککردنەوەی ناوەڕاستی زمان لە ئاسمانە ڕەقە پەیدا دەبێ . ( y – ی) دەنگێکی کۆنسۆنانتی ناوەڕاستی زمانە و لە تەلەفوزکردنیدا سەری زمان لە ددانەکانی خوارەوە گیردەبێ : هەردوو تەنیشتی زمان دەکەونە سەر ددانەکانی تەنیشت ؛ ناوەڕاستی پشتی زمان بەرەو ئاسمانە ڕەقە بەرزدەبێتەوە ؛ درزێکی یەکجار تەسك پێکدێنێ ، کە دەنگی پێدا ڕەت دەبێ . وتنی کۆنسۆنانتی ( y –ی) لە وتنی بزوێنی (î – ی) نێزیکە .

کۆنسۆنانتی (y – ی) لە سەرەتای برگەی هێزداردا ڕوون تەلەفوز دەکرێ ، بەهەمان چەشن لەدوای کۆنسۆنانتیشەوە : یار .. دیاری ... بەڵام لە کۆتایی برگەدا وەك (ی)ی نابرگەیی تەلەفوز دەکرێ . وەك : لای ...



وێنەی ژ ١٢

نەخشەی ( W – و) و ( y _ ی)

لەنێو زمانە سلاڤیانییەکاندا زمانی پۆلۆنی لە هەموان زیاتر کۆنسۆنانتی ڕیزی پێشەوەی زمانی تێدایە . وێڕای ( y - ی) ، کۆنسۆنانتی فیکەیی و فیشکەیی پێشەوەی زمانیشی هەیە و بە پیتی š , ž , č , dž نیشان دراون . کۆنسۆنانتی پێشەوەی زمانی بیڤلۆکی لە کۆمەڵێ زماندا بەدی دەکرێ ، بەوێنە لە فەرەنسی و هانتی...دا .

کۆنسۆنانتی پشتەوەی زمان دابەش دەبێ بەسەر ناوەڕاستی ئاسمانە و پشتەوەی ئاسمانەدا . کۆنسۆنانتی پشتەوەی زمان ، کۆسپەك و خشۆك و بیڤلۆكی هەیە .

کۆنسۆنانتی پشتەوەی زمان بەسەر زوانەچکۆلەیی و گەروویی و ئەوکییشدا دابەش دەبێ . بۆ نموونەی کۆنسۆنانتی زوانەچکۆلەیی دەشێ دەنگی (ر)ی زمانی فەرەنسی بکرێتە نموونە . لە تەلەفوزکردنی ئەم دەنگەدا سەری زمان لە ددانەکانی خوارەوە توند دەکرێ ؛ بەشی پشتەوە دەچێتە یەك و بەرەو ئاسمانەی دەم بەرزدەکرێتەوە و لووزەوی هەوا زوانەچکۆلە دەهێنێتە لەرە و لەرزە و ناوەناوە لەپشتی زمان دەکەوێ و بڕین دەخاتە لووزەوی هەواوە و ژاوەژاو دروست دەکات ، وەك : "Frĕre" (برا) ؛ "Paris" (پاریس)... بەلام لە خاسیەتی تەلەفوزی دانیشتوانی پاریسدا ئەو دەنگە بێ لەرە و لەرزەیە - واتە وەك کۆنسۆنانتی خشۆك دەوترێ .

کۆنسۆنانتی گەروویی بە ڕێگەی بزووتنەوەی ڕەگی زمان بۆ دواوە و کورتبوونەوەی ماسوولکەی دیواری گەروو (بڕوانە : وێنەی ژ٥) دەوترێ . کۆنسۆنانتی گەروویی ، کۆسپەك و خشۆکی هەیە .

کۆسپەکی ئاوازەداری گەروویی لە زمانی ئاڤاریدا هەیە و گەروویی خشۆکیش بە زۆری لە زمانی ئۆکراینیدا دەبینریٚ .

کۆنسۆنانتی ئەوکی بە شێوەییێکی گشتی لە تەقینەوەی گەروویی‌دا خۆی دەنوێنیٚ . وەك دەنگی سەربەخۆی ئاخاوتن لە زمانی عەرەبیدا هەیە و هەمزەی پیٚدەوتریٚ . ئەم کۆنسۆنانتە کپە کۆسپەکە بەهێنانەوەیەکی دەنگەژێکان دەردەبڕیٚ : تەوژمی هەوا بە یەك گوژمی تیژ دەرباز دەبیٚ : ژاوەژاوێکی لاوازی تەقینەوە ساز دەکا (بڕوانە : وێنەی ژ ٦) . دەنگی ئەوکی پتر وەك تەواوکەری وتنی بزوێن و کۆنسۆنانت خۆی دەنوێنیٚ . بەوێنە لە تەلەفوزکردنی ئەو وشە ئەڵەمانییانەدا ، کە بە بزوێن دەست پیٚدەکەن ، ژاوەژاوی کپی ئەوکی ، کە لە پچڕپچڕی لەناکاوی هاتنەوەیەکی دەنگەژێکان دەبینریٚ . بەم جۆرە تەلەفوزکردنە دەوتریٚ هەڵمەتی توند .

وەك پێشتر باسمان کرد ، کاری دەنگەژێکان خاسیەتێکی پێویستی کۆنسۆنانتە . بەپێی ئەم خاسیەتە کۆنسۆنانتەکان دابەش دەبن بەسەر : ژاوەژاوەیی (کپ و ئاوازەدار) و زرینگۆکدا . بەرانبەر یەکتر وەستانی ئاوازەدار و کپ تایبەتێتییێکی دیار و ئاشکرای زۆربەی زمانانی جیهانە . بەڵام لەمەشدا جیاوازی لەنێوان هەندیٚ زمان و گرووپی زماناندا هەیە . بەوێنە لە زمانانی ماریدا دەنگی (ب) تەنیا لەگەڵ (م)دا دیٚت : "کۆمبۆ" (ڤاز) ؛ وشەی زمانی ماری چۆن ناشیٚ بە دەنگی ئاوازەدار کۆتایی بیٚت ، بەهەمان چەشن نالویٚ بە کۆنسۆنانتی ئاوازەدار دەست پیٚبکات . لە زمانی هانتیدا هەر

کۆسپەك و خشۆکەکان کۆنسۆنانتی کپن : س ، ش ، خ ... لە زمانی ئەستۆنیدا دەنگی (ب ، د ، گ)دا کۆنسۆنانتی کپن و جیاوازییان لەگەڵ (پ ، ت ، ك)دا ئاوازەدارێتی نییە ، بەڵکو درێژی و تینی وتنە . لەگەڵ ئەوەشدا لە زماناندا دەنگی بیڤلۆکی کپیش هەیە . لە وشەی فەرەنسی "mal" (بەد)دا ، دەنگی (ل) کپ بووە و لە وشەی "table" (مێز)دا ئاوازەدارێتی پاراستووە .

شێوەی وتن و ئەندامی چالاك و شوێنی وتن و کاری دەنگەژێکان خاسیەتی بنەڕەتیی وتنن و لەسەر بنچینەیيان کۆنسۆنانتەکان دابەشکراون . لەتەك خاسیەتە بنەڕەتییەکانی وتندا لە هەموو زمانێکدا خاسیەتی دیش هەیە ، کە بەردەوامیی دابەشکردنی کۆنسۆنانتەکان ڕادەگەیەنێ .

خاسیەتەکانی دی تەواوکەری وتن بریتین لە : "aspiration" و "labialization" و "palatalization" و "velarization" .

بە لێخشانی هەوا لە دەنگەژێکان ، کە درزی ڕێڕەوی پێ تەسك دەبێتەوە ، دەوترێ aspiration . labialization – ئەو تەلەفوزکردنەی کۆنسۆنانتە ، کە بەڕاوەژاوی لێو بەرێ دەکرێ و لە لووزەوی ئاخاوتندا لەژێر تەئسیری بزوێن یان کۆنسۆنانتی دراوسێیدا پەیدا دەبێ .

palatalization جۆری هەرە بەربڵاوی خاسیەتی تەواوکەری وتنە و بریتییە لە پتر بەرزکردنەوەی پشتی زمان بەرەو ئاسمانە ڕەقە . لە تەلەفوزکردنی (palatalization)ە لێوەکییەکاندا ، لێو بەرەو

پێشـەوە دەکشـێ ... بزووتنـەوەی بەشـی پشـتەوەی زمـان بـۆ دیـوی ئاسمانـە نەرمـە ، وتنێکـی پێچەوانـەی تەواوکـەر دێنێتـە ئـارا و بەمـە دەوترێ Velarization .

(palatalization) و (Velarization) دەچنـــە ســـەر وتنـــی بنەڕەتـــی و شـــێوازێکی تەواوکـــەری کۆنســـۆنانت ســـازدەکەن . palatalization نەرمی و velarization ڕەقی – ئەمەش خاسیەتێکی ڕوونی کۆنسۆنانتەکانی زمانی ڕووسی‌یە : "مێلʼ" (تەباشیر) – "مێل" (گچکـە) ؛ "لًـووك" (پیـاز) – "لیـوك" (ئـاوەڕۆ)[11] . هـەرچی (ل)ی ئەورووپی‌یە نە دەبێتە palatalization و نە Velarization.

تەماشاکردنی چۆنێتـی خاسـیەتی وتنـی بزوێـن و کۆنسـۆنانت ئـەوە نیشـان دەدا ، کـە هـەر دەنگێکـی ئاخـاوتن خـاوەنی کۆمـەڵێ خاسیەتە . کـاتێ دەنگەکانی ئاخـاوتن لـە پێکهاتنی بڕگـە یـان وشـەدا دەکەونـە پاڵ یـەکدی ، دەشـێ ئـەو خاسـیەتانەیان بپـارێزرێ و دەشـێ نەپارێزرێ . ئەمـە دیسان ئەوە ئیسـپات دەکـا ، کەپێکـهاتنی دەنگیـی زمـان تـەنیا بوونـی کۆمەڵـە دەنگێـك نی‌یـە ، بـەڵکو دەسـتووری یەلنگرتنیشیانە لە شەپۆلی ئاخاوتندا .

[11] لە زمانی کوردیشدا بەهەمان چەشنە . بڕوانە : (کەڵ) و (کەل) ... (جاڕ) و (جار) ...

نەخشەی خاڵی لێککەوتنی زمان و مەلاشوو لە دەربڕینی کۆنسۆنانتەکاندا :



تا

(ت) لە وشەی (تا)دا



نا

(ن) لە وشەی (نا)دا



لا

(ل) لە وشەی (لا)دا



ئاڵا

(ڵ) لە وشەی (ئاڵا)دا




(ڕ) لە وشەی (ڕا)دا




(ر) لە وشەی (ئارا)دا

وێنەی شەپۆلی دەربڕینی کۆنسۆنانتەکان :




(ت) لە سەرەتای وشەدا




(ت) لە نێوان بزوێندا




(ت) لە کۆتایی وشەدا




(ن) لە سەرەتای وشەدا




(ن) لە نێوان بزوێندا[1]




(ن) لە کۆتایی وشەدا[1]




(ل) لە سەرەتای وشەدا[1]




(ل) لە نێوان بزوێندا




(ل) لە کۆتایی وشەدا




(ڵ) لە نێوان بزوێندا



ب ێ ڵ

(ڵ) لە کۆتایی وشەدا



ڕ ب ش

(ڕ) لە سەرەتای وشەدا



ب ە ڕ ە

(ڕ) لە نێوان بزوێنەدا




( ڕ ) لە کۆتایی وشەدا




( ر ) لە نێوان بزوێندا




( ر ) لە کۆتایی وشەدا

-٣-

## برگە و هێز و ئاواز

ئاخاوتنی دەنگی بریتی‌یە لە لێشاوی دەنگ ، کە تێیدا نەك تەنیا دەنگەکانی ئاخاوتن و برگەی لێ دەردەکەوێ ، بەڵکو دانەی پتر گەورەی وەك ترپە (ایقاع) و وتەشی لێ پەیدادەبێ . زەنگی زنجیرەی دەنگ بەپێی دانە دەنگی‌یەکانی زمان جیادەکرێنەوە و لە شێوەی پارچە(Segment) و پارچە بەدەرایەتی (Supersegment)دا دەبن . دەنگی ئاخاوتن (فۆنێم) و برگە سادەترین پارچەی دانەکانی ئاخاوتنن . هێز و ئاواز – دانەی پارچەبەدەرایەتین . ترپە و وتە – دانەی پارچەی ئاڵۆزن ، کە بەهێز و ئاواز یەك خراون .

پێویستە ترپە و وتە لەگەڵ دەستەواژە و ڕستەدا (کە دانەی پێکهاتنی ڕێزمانیی زمانن) تێکەڵ نەکرێن . بەوێنە ، ڕستە بریتی‌یە لە یەکێتی ناوەڕۆکی ڕستەسازی و ژێربێژی (واتادارێتی) و ئەو قاڵبی ڕستەسازی‌یەی بەر لە هەر شت بە فۆرمی وشە دەربڕراوە .

تێکەڵکردنی دانەی دەنگسازی و ڕێزمانی لە زاراوەی (Syntagme)دا ئاشکرا دەبێ ، کە جارێك بە واتای ترپە و جارێك بە واتای دەستەواژە بەکاردێنرێ . ل . ڤ . شێربا سینتاگمەی ناوناوە یەکێتی ئاواز و واتای بەر لە هەر شت بەهێز سازبوو و بریتی‌یە لە بەشێکی گوتە ف . دێ . سۆسسیور سینتاگمەی بە گشت

پێکهاتنێکی دوو ئەندامی ، کە ئەندامەکانی بتوانن وەك دیارخراو و دیارخەر هاوڕێژە بن ، ناوبردووە . زاراوەی سینتاگمە وای لێ هات بۆ واتا گەیاندنی دەستەواژە بەکاربهێنرێ ؛ سینتاگمە کۆمەلایەتی دەستەواژەی هەلبەستراوە ... هتد .

ئێستاش وردتر لە بڕگە و هێز و ئاواز دەدوێین :

## بڕگە و جۆرەکانی :

بڕگە بریتی‌یە لە بچووکترین دانەی سروشتیی تەلەفوزکراوی دەنگەکانی ئاخاوتن . ئاخێوەر کە وشەیێك تەلەفوز دەکا بەسەر تاکە تاکەی دەنگەکانی ئاخاوتندا دابەشی ناکات ، بەلکو بەسەر بڕگەدا دابەشی دەکات . بڕگە یەکێتی وتن و بیستن دەگرێتە خۆ .

چەند تیۆری‌یێکی بڕگە هەیە و ئەوی لەنێوانیاندا پتر بلاو و ناسراوە ، دوانە : زرینگۆکی و ماسوولکەیی . تیۆریی زرینگۆکی بڕگە وەك پەك کەوتنی ماکی پتر دەنگدار لەگەلّ ماکی کەمتر دەنگدار تەماشا دەکرێ . دەنگەکانی ئاخاوتن بەپێی توانستی پێکهێنانی بڕگە دابەش دەبن بەسەر پلەی جیاوازی دەنگدارێتی‌دا - بزوێن ؛ کۆنسۆنانتی زرینگۆك ؛ کۆنسۆنانتی ئاوازەدار ؛ کۆنسۆنانتی کپی خشۆك و تەوژمۆك . ئۆ . ئێسپێرسینی زمانناسی دانیمارکی و ڕ . ئی . ئاڤانێسۆڤی دەنگسازی سۆڤێتی تیۆریی زرینگۆکی بڕگەیان دیاری‌کردووە . تیۆریی گرژبوونی ماسوولکە گرۆمۆنی دەنگسازی فەرەنسایی پێشنیاری کردووە و لەلایەن ل . ڤ . شێربای دەنگسازی

سۆڤێتی‌یەوە پشتگیری لێ کراوە . بەپێی ئەم تیۆری‌یە ، برگە وەك یەکێتی بەرزبوونی گرژی و تیژسەندنی دەنگدارێتی لە سەرەتای برگەوە و کزبوونی لە کۆتایی برگەوە تەماشا دەکرێ .

برگە خاوەنی خاسیەتی یەکێتی کراوەیی یان داخراوەیی بۆشایی دەمە . بەپێی ئەم بۆچوونە سەرجەمی برگە بەسەر کراوە و داخراودا دابەش دەبێ . برگەی کراوە ، بەو برگەیە دەوترێ، کە بە کراوەیی بۆشایی دەم تەلەفوز دەکرێ . بەو پێ‌یە لوتکەی برگە ماکی برگەپێکهێنی دەکەوێتە کۆتایی برگەوە . لەم بارەدا بزوێن ماکی برگە پێکهێنە : دا - را ؛ جوو - تە ؛ بۆ - نە ؛ ڕێ - گە ... بەپێچەوانەوە ، برگەی داخراو لەباری داخراویی بۆشایی دەمدا سازدەبێ . لوتکەی ئەم جۆرە برگەیە و ماکی برگە پێکهێنی دەکەوێتە سەرەتای برگەوە ، دوای ئەوە خاوبوونەوەی گرژی و کەمبوونەوەی دەنگدارێتی ڕوودەدات : ئاش ، ئاڵ ... لەتەك برگەی داخراودا ، برگەی داخراوی داپۆشراویش هەیە : مۆم ، گوڵ ، دار - تاش ، سەر - دار ... دەکرێ جۆرەکانی برگە بە شێوەی جەبر نیشان بدرێن : CVC ، VC ، CV کە (c) - کۆنسۆنانتە و (v) -بزوێن .

برگە و ڕەگ یەکسان نین . دەزانین لەگەڵ وشەی یەك برگەیی‌دا ، وشەی فرەبرگەیی یەك ڕەگی هەیە . بەوێنە : شووتی ، بەهار ، سەهۆڵ ، چۆلەکە ... وشەی فرەبرگە زۆر جار بە فرەبرگە دەردەچن . دابەشکردنی بەسەر مۆرفێم و بەسەر برگەدا وەك یەك نی‌یە . بەوێنە وشەی (بەرە) لە دوو مۆرفێمی (بەر - ە) و دوو برگەی (بە - رە)

پێکهاتووە . کەواتە دابەشبوونی مۆرفێمی و دابەشبوونی برگەیی جیاوازن . وشەی (شووتی) لە یەك مۆرفێم و (شووتی) و دوو برگە (شوو – تی) دروست بووە ...

لەتەك ئەو زمانانەی جیاوازی لە دابەشکردنی وشە بەسەر برگە و مۆرفێمدا هەیە ، زمانانی ئەوتۆش دەبینرێ ، کە ژمارەی مۆرفێم و برگەی وشە تێیاندا یەك دەگرنەوە و ڕەگی وشەشیان یەك برگەیی‌یە . بەو جۆرە زمانانەش دەوترێ زمانی یەکبرگەیی و زمانی فرەبرگەیی .

## هێز و جۆرەکانی

هێز بە دەرخستنی دەنگێك ، یان برگەیێك ، یان وشەیێك دەوترێ ، کە لە ڕێگەی تیندان بە گرژبوونی ماسوولکە و تەوژمی لووزەوی هەواوە ، یان گۆڕینی ڕادەی بەرزیی دەنگەوە ئەنجام دەدرێ . بەپێی بابەت دەرخستنی هێز دەشێ برگەیی ، وشەیی ، ڕستەیی بێت . بەپێی خاسیەتی بیستن و وتنیش هێزی یەك ئاواز – (monotonic stress) و هێزی فرەئاواز – (polytonic stress) جیادەکرێنەوە .

هێزی یەك ئاواز لەگەڵ ئەوەی خاوەنی خاسیەتی یەکێتی بەرزی‌یە ، خاوەنی گۆڕین و تین و درێژیی دەنگیشە . هێزی یەك ئاواز وەك شتێکی عادەتی لە هەموو زمانێکدا توانای شێوە گۆڕیی دانەی بنەرەتیی ئاوازی زۆر نی‌یە . هێزی یەك ئاواز دەلوێ تیندار ، یان چەندێتی بێ . زەبری لووزەوی هەوا برگە لە هێزی تینداردا

جیادەکاتـەوە ؛ درێژیـش هـێزی چـەندێتی دیـاری دەکـا . گەلـێ جـار خاسیەتی تینداری و چەندێتی لەگەڵ یـەکدی رێدەکـەون . بەوێنە لـە زمانی ڕووسیدا بڕگەی هێزدار جیاوازی لەگەڵ بڕگەی بێهێزدا تەنیا لە تاووتیندا نی‌یە ، بەڵکو لـە درێژیشـدایە . لـەم ڕووەوە سـەرنجڕاکێش ئەوەیە ، هەڵگرانی ئەو زمانانەی بزوێنی درێژ و دیفتۆنگیان هەیە ، وا هەست بە هێزی ڕووسـی دەکەن ، کـە درێـژی بـێ . بەوێنە یاکووتـەکان هێزی ڕووسی‌یان بە درێژیـی بزوێـن وەرگرتـوە و بزوێنـی هێزداریـان بـە بزوێنی درێژ یان بە دیفتۆنگ گۆڕیوە : لامپە : لا امپە (چرا ، گلۆپ ) .

هـێزی فرەئـاواز خاسـیەتی گۆڕینـی بـەرزیی ئـاواز و سـازی مۆسیقی‌یە . هێزی فرەئاواز لـە زمانی یۆنانیی کۆن و هیندیی کۆنـدا هەبووە و لـە زمـانی سـێرب و کـەروات ، لاتینـی ، چینـی ، ڤێتنـامی ، ژاپۆنی و ژمارەیێکی دی زۆری زمانەکانی ئاسیا و ئەفەریقاشدا هەیە . بـۆ نموونـە لـە زمـانی چینـی‌دا بەشـێکی زۆری وشـەی یـەکبنجی بـە بزووتنەوەی ئاوازی بڕگەیی جیادەبنەوە .

وەك :

ما - بە ئاوازی ڕێك واتای (دایك) دەگەیەنێ .

ما - بە ئاوازی هەڵکشاو - (ناوی ڕووەکێکە)

ما - بەئاوازی داکشاو - (سەرزەنشت)

ما - بەئاوازی داکشاو- هەڵکشاو - (ئەسپ)

بەم جۆرە لەم زمانانەدا چەند ئاوازی هاودەنگ (Homophonus) بەرچاو دەکەون .

هێز بە شێوەیێکی پتەو بەندە بە وشەوە و بریتییە لە خاسیەتی . هێزی وشە بە دەرخستنی یەکێك لە بڕگەکان و دەستەڵاتی بەسەر گشت ئەوانی دی بێهێزدا دەوترێ . بڕگەی هێزدار دەتوانێ بە تین و درێژی و چونیەتی بزوێن لە بڕگەی بێهێز جیابێتەوە . لە وشەی فرەبڕگەییدا ، بەتایبەتی لە دوو بنەماییدا ، لە تەك هێزی سەرەکیدا ، هێزی ناسەرەکیش پەیدا دەبێ ، کە دەشێ هێزی دووەمی پێ بوترێ . لە وشەی ناسادەی زمانی ڕووسیدا ، هێز دەکەوێتە سەر دووەم یان دوا بنەما ، بەڵام لە زمانی ئەڵەمانیدا بە پێچەوانەوە دەکەوێتە سەر یەکەم بنەما .

بەپێی شوێنی هێز لە وشەدا دەشێ هێزی هەمیشەیی (بەند) و هێزی بەرەڵلا جیابکرێتەوە . هێزی هەمیشەیی بۆ گشت وشەکانی زمان جێگیرە . بەوێنە لە زمانی چیکی و لیتوانی و هەنگاریدا لەسەر یەکەم بڕگە دەپارێزرێ . لە زمانی فەرەنسی و زوربەی زمانە تورانییەکاندا دوا بڕگە وەری دەگرێ . لە زمانی پۆڵۆنیدا هەمیشە دەکەوێتە سەر بڕگەی پێش کۆتایی .

لە باری هێزی بەرەڵلادا هەندێ وشەی چەسپیو هێزی جێگیریان هەیە ، بەڵام بەگشتی هێز جێگۆڕکێ دەکات و بزێو خۆی دەنوێنێ و هەر لەبەر ئەوەشە بە هێزی بەرەڵلا ناودەبرێ . ئەم جۆرە هێزە هەندێ جار بە شێوەی فۆنێم دەوری گۆڕینی واتا و فۆرمی وشە دەبینێ .

زمانی ڕووسی خاوەنی هێزی بەرەڵلایە . هێز لەم زمانەدا دەشێ بکەوێتە سەر بڕگەی یەکەم ، یان دووەم ، یان سێیەم ، یان کۆتایی ،

یان پێش کۆتایی ... ئەو وشە چەسپیوانەش کە لە مێژەوە هێزی جێگیریان لەسەر جێگیربووە ، گەلێ جار تەنانەت لە گۆڕینیشیاندا هێز لە شوێنی خۆی نابزوێ .

لە زمانی ڕووسیدا لە تەك هێزی جێگیردا ، وشەش هەیە لەباری وشەڕۆنان ، یان گەردان ، یان گۆڕاندا هێز دەبزوێ و شوێنی خۆی دەگۆڕێ .

هێز لە زمانی کوردیدا بە زۆری دەکەوێتە سەر دوابڕگەی وشە ... لە هەندێ حاڵەتدا وا ڕوودەدات ، هێز لە یەك وشەدا شوێنی لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیێکی دیکە دەگوێزرێتەوە بێ‌ئەوەی کار بکاتە سەر مانای وشەکە . بەڵام هەندێ جاریش لە گواستنەوەی هێزدا مانای جیاواز پەیدادەبێ .

بەوێنە وشەی "سەوزە" ، ئەگەر هێز لەسەر دوا دەنگی دابنرێ ، ئەوە ماناکەی "هەمووجۆرە شینایێك دەگرێتەوە کە ڕوابێ" . خۆ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دەنگی دووەمی ، ئەوسا بە مانای "ڕەنگی سەوز" دێت . وەك بووترێ "ئەو مەرەکەبە سەوزە ..." . وشەی "تەختە" ئەگەر هێز لەسەر دوادەنگی دابنرێ ، ئەوە ماناکەی (لوح)ی عەرەبی دەگرێتەوە . خۆ ئەگەر هێز بخرێتە سەر دەنگی دووەمی ، ئەوسا بەمانای (انه مستوٍ او عدلٌ)ی عەرەبی دێت . بێ‌گومان ، هەردوو وشەی "سەوزە" و "تەختە" لە حاڵەتی دووەمدا هەر بە ڕواڵەت وشەن ، دەنا هەردوویان ڕستەی تەواون . بەمەدا دەبێ ئەوە لەبیر نەکەین کە لە زمانی کوردیدا دەوری واتاگۆڕیی هێز لەگەڵ هەندێ زماندا دوور

دەکەوێتەوە . ئەو دوورکەوتنەوەیەش ، ئەوەیە کە گواستنەوەی هێز لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیێکی دی  بە زۆری وشەکە دەکاتە ڕستە و هەمان وشە نامێنێت .

بەمجۆرە دەبینین ، کە لێرەدا گواستنەوەی هێز دەبێتە هۆی پەیدابوونی مانای جیاواز . بەلاَم واش ڕوودەدات ، کە گواستنەوەی هێز کار ناکاتە سەر گۆڕینی مانا . بەنموونە ، وشەی "پەردە" – هەرچەند لە ڕەسەندا هێز بەسەر دوادەنگەوەیە ، بەلاَم ئەگەر لەسەر بزوێنی یەکەمین دابنرێ مانا هەر ناگۆڕێ . لە وشەی "دارا"دا هێز لەسەر بزوێنی یەکەم یاخود دووەم دابنرێ مانای وشەکە ناگۆڕێت ... هتد .

هەر زمانێکی سەر ڕووی ئەم زەمینە بگرین ، دەبینین کە خاوەنی چەندین تایبەتێتی ئەوتۆیە ، کە لە زمانەکانی دیکەی جودادەکاتەوە ، یاخود ڕووی وای هەیە نزیکی دەخاتەوە . خۆ ئەگەر لە زمانی کوردیدا لە هێز وردببینەوە و لەگەلّ چەند زمانێکدا بەراوردی بکەین ، ئەوە هەندێ ڕاستیمان بۆ ئاشکرا دەبێ . بەوێنە هێز لە زمانی کوردیدا وەک گەلێ زمانی دیکەی سەر ڕووی ئەم زەمینە ، دەخرێتە سەر بزوێن ؛ دەکرێ لە بڕگەیەکەوە بۆ بڕگەیێکی دی بگوێزرێتەوە ؛ دەتوانێ دەوری واتاگۆڕی ببینێ ... هەر بەو چەشنە لە زمانی فارسی و ئینگلیزی و ڕووسی و ئیتالیایی ...دا کار دەکات .

هێزی ڕستەیی یان ژێربێژی بە ناوەرۆک لە هێزی بڕگەیی و وشەیی جیادەبێتەوە . هێزی ڕستەیی ئەرکی دەنگسازی و واتایی –

ڕستەیی بەجێ‌دێنێ و وشە لە وتە و ڕستەدا بەیەکەوە دەبەستێ . هێزی ژێربێژی (واتایی) لە دابەشکردنی چالاکانەی ڕستەدا ، وشە و گوتە دەردەخا . هێزی ڕستەیی بە ئاوازەوە بەندە و دەبێتە بەشێکی .

گەلێك جار ، وا ڕێ‌دەکەوێ کە هێزی ڕستە ، یەك ڕستە بە چەند مانایێکی جیاواز دەردەبڕێ (لەگەڵ ئەوەشدا ، کە بەگوێرەی دەنگەکان و هێزی وشە وەك یەکن و جیاوازییان لە نێواندا نییە) . بەوێنە لە ڕستەی پرسی - "مامم هات ؟" دا ، ئەگەر هێزی ڕستە بەسەر وشەی "مامم"ەوە بێت ، ئەوە پرسیاری کەسێك نیشان دەدا . بەڵام ئەگەر هێزی ڕستە لەسەر وشەی "هات" دابنرێ ، ئەو کاتە هەواڵی ڕووداوێك یاخود کارێك دەپرسێ .

## ترپە و بەزگر و دواگر

ترپە دوو یان چەند برگەیەکە ، کەهێز یەکی‌خستبن . ترپە دەتوانێ هاوسەنگی وشە بێ و وشە لە گرووپی یەککێشی‌دا یەك بخا .

ئەو جۆرە دابەشکردنەی ترپەیی ڕستە لە بنەمای ئاوازی شیعردا هەیە ، کە کێشەکەی گۆڕینی ژمارەییێك برگەی بێ‌هێز بە ترپە و دێڕ دەگرێتە خۆ .

لە زوربەی زماناندا وشە گرنگەکان ، بەتایبەتی ناو ترپەیێکی تایبەتی پێك‌دێنن و هێزی فەرهەنگی و ڕستەیی خۆیان هەیە . ئاوەڵکردار و جێناو و ژمارە و پێشبەند و نیشانە و ئامرازی بەستن و هەندێ ئامرازی دی لەپێشەوە بە وشە گرنگەکەوە دەبەسترێن ، کەوا

لەم حاڵەتەدا نەك تەنیا خاوەنی هێزی وشەیی‌یە ، بەڵکو خاوەنی هێزی ڕستەیی‌یشە : (بەهاری کوردستان ؛ تۆیِ کورد ؛ دووڕۆژ ؛ بێ‌مندال ...) . ئەوجۆرە وشانە ، کە هێز لە دەست دەدەن و خۆیان بە وشەکەی دی‌یەوە دەبەستنەوە پێیان دەوترێ دواگر .

بەرگر – ئەمە وشەی بێ‌هێزە، کە بەپێچەوانەوە بە وشەی پێشەوەیەوە دەبەسترێتەوە . جێناو و پاشبەند و نیشانە و هەندێ ئامراز دەبنە بەرگر . وەك : (باوکی تۆ ...) .

بەرگر و دواگر ، کاتێ بە وشەوە دەبەسترێن یەکێتی‌یێك پێكدێنن ، کە بە فۆنەتیکیی وشە ناودەبرێن .

## ئاواز و ماکەکانی و مەبەستی .

چۆن مەفهوومی زەنگ لە خاسیەتی بیستنی دەنگدا شتێکی بنەڕەتی بوو ، بە هەمان چەشن مەفهوومی ئاوازیش لە خاسیەتی ڕستەدا شتێکی سەرەکی‌یە ، ئەویش چونکە ئاواز ، ساز و کێشی پێکهاتنی ڕستە دیاری‌دەکا .

ماکەکانی ئاواز بریتین لە :

١ – ئاهەنگی ئاخاوتن

٢ – هێز

٣ – وەستان pause

٤ – خێرایی

٥ – زەنگ timbre

ئاهەنگ و هێز کە ماکی پێشڕەوی ئاوازن لەسەر بناغە یان دانەی ئاوازی (ummomeuea) و (Syntagme) دادەمەزرێ .

ئاهەنگی ئاخاوتن - بزووتنەوەی دەنگ بەپێی بەرزیی ئاوازە . ئاهەنگی بڕگە و وشە ، هێزی فرەئاوازی مۆسیقی پێکدێنێ . ئاهەنگی ڕستە ، وێنەی ئاوازێ دەکێشێ ، کە لە بناغەی ئەوجۆرە ئاوازەدا هەیە . جاران بە یاریدەی نۆتە ئاهەنگیان نیشان دەدا ، بەڵام ئێستا بۆ دەربڕینی بزووتنەوە خەتی پێچاوپێچ (بەرز و نزم) بەکاردێنن و سەرەتا و کۆتایی بزووتنەوەی ئاوازی پێ دیاری دەکەن . خەت لە فۆرمی گونجاندندا بەپێی باری ئەستوونی بەرزیی ئاوازی بنەڕەتی بە هێرز HZ دەپێورێ ، بەڵام لە باری ئاسۆیی‌دا - کات . خەتی درێژەوە بوو زۆر جار نیشانی بزووتنەوەی ئاوازی بنەڕەتی دەدا لە تەلەفوزکردنی بزوێندا .

خاسیەتی ئاهەنگی ڕستەی پرس لەوەدایە ، کە لە بڕگەی هێزداری ئەو وشەیەی پرسیاری لەسەر دەکرێ ئاواز بەرزدەبێتەوە . ڕستەی خەبەری و سەرسوڕمانیش ئاوازی خۆیان هەیە ...

ummomnuca ئاواز لەگەڵ پێکهاتنی ڕستەسازی‌دا پێکەوە گرێدەدا ، کەوا خاسیەتە بۆ ئەم یان ئەو زمان . ژمارەی umioneuca سنووردارە ، بەوێنە (پ . دێلاتر)ی دەنگسازی فەرەنسایی (١٠) جۆر ئاوازی بنەڕەتی دیاری کردووە . ئاواز تەنیا یاریدەی دەربڕینی پێکهاتنی ژێربێژی - ڕێزمانیی ڕستە نادات ، بەڵکو واتای وتراو و هەستی قسەکەریش دەردەبڕێ . هەست بەر لە هەر شت بە زەنگ

دەردەبڕڕێ ، واتە بە بزووتنی ئاواز لە تەنیشت نۆتی ناوەڕاستەوە ، کە مرۆ لەوێوە لە دۆخی هێوەرەوە دەست بە قسە دەکات .

بــە دوا ســینتاگمەدا ، ئاهــەنگ و هــێز و خــێرایی و وەســتان پەیـدادەبێ . سینتاگمە دوو ئەرکی هەیـە : دەنگسـازی و واتاناسـی . سینتاگمەی دەنگسازی ، وتە بەسەر ئەو جۆرە ترپانەدا دابەش دەکا ، کە خاسـیەتی زمـانێکی دیـاریکراو بـن . دابـەشکردنی سـینتاگمەیی ڕستە یاریدەی باشتر دەربڕینی واتای کەمدیار و شـێوازی جیـاوازیی واتا و هـەروەها پێوەندیـی قسـەکەر بە نـاوەرۆکی وتنەکەیـەوە دەدات . دابەشکردنی سینتاگمەیی ڕستە ، لەتەك ڕیزبوونـی وشـەدا ، بریتییـە لە کەرەستەی چالاکی دابەشکردنی ڕستە ، کە ئەمەش لە ڕستەسازیدا باسی لێوە دەکرێ .

بــەم شــێوەیە دەنگــەکانی ئاخاوتنمــان شــیکردەوە . لــە دابـەشکردنیاندا ئاوڕمـان لـە برگـە و هـێز و ترپـە و وتـە دایـەوە ، گەیشـتینە ئەو ڕایـەی ، کە دانە فۆنەتیکییەکان بە یـەکترەوە بـەندن . ترپە و هێز بە شێوەیێکی یەکجار پتەو پێکەوە گرێدراون . دەنگەکانی ئاخاوتن و برگە بە یەکدییەوە بەستراون و لە پێکهاتنیاندا دەنگەکان یەك کار لە یەك دەکەن و شێوەگۆڕیی دەنگ ساز دەکەن . شێوەگۆڕیی وتنــی دەنگــەکانی ئاخــاوتن و گۆڕانیــان یــەکێ لــە تایبەتێتییــە جیاکەرەوەکانی دروستبوونی دەنگیی زمانی دیاریکراو پێکدێنێ .

-٤-

# کار لە یەکدی کردنی دەنگەکان لە لێشاوی ئاخاوتندا

دەنگەکانی ئاخاوتن کە لە پێکهاتنی برگە و وشە و ڕستەدا بەکاردێنرێن کار لە یەکدی دەکەن و دەکەونە ژێر باری گۆڕانەوە . شێوەگۆڕیی دەنگ لە زنجیرەی ئاخاوتندا بە پرۆتسێسی فۆنەتیکی (دەنگی) ناودەبرێ .

پرۆتسێسی فۆنەتیکی بەکار لە یەکدی کردنی سەرەتا و کۆتایی وتنی دەنگە دراوسێکان و بارودۆخی دەنگ لە برگەدا ساز دەبێ . بۆیە دەشێ پرۆتسێسی فۆنەتیکی دەوروبەری و شوێنەکی دیاری بکرێن . بەوێنە لە وشەکانی (ڕشتی) و (دش)دا (ژ) وەك (ش) دەوترێ . لە وشەی یەکەمدا کپ کاری کردووەتە سەر ئاوازەدار (ئەمە هۆی پرۆتسێسی فۆنەتیکی دەوروبەرە) . لە حاڵەتی دووەمدا کپبوونی دەنگی ئاوازەدار هۆی هاتنێتی لە کۆتایی وشەوە (ئەمەش کاری پرۆتسێسی فۆنەتیکی شوێنەکی‌یە) .

### پرۆتسێسی فۆنەتیکی دەوروبەر

پرۆتسێسی فۆنەتیکی دەوروبەر بە شێوەیێکی سەرەکی کۆنسۆنانتەکان دەگرێتەوە . پرۆتسێسی فۆنەتیکیی دەوروبەری

بنەڕەتی بریتی‌یە لە : وێکچواندن (assimilation) و گۆڕین (dissimiation) و گونجاندن (accommodation) .

وێکچواندن لە ئەنجامی کار لە یەکدی کردنی کشانەوە و هەڵمەتی دەنگە دراوسێکاندا ، کە قورسایی‌یان لەسەر یەکدی هەیە ، پەیدا دەبێ . وشەی (assimmulatio)ی لاتینی خۆی دەتوانێ ببێتە نموونەی وێکچواندن . ئەم وشەیە لە: (assĭmŭlo) - (لێکیان دەچوێنم ، یەکیان دەخەم)ەوە دروستکراوە . ئەم کردارە لە پێشگری (as < ad) و کرداری (simulo) پێکهاتووە . ئەگەر لەگەڵ (assĭmilĭs) (لێ‌چوو)دا بەراوردی بکەین ، دەبینین لە دروستبوونیدا پێشگر (-ad) : (-ad similis) هەیە . کۆنسۆنانتی (d)ی پێشگر بە تەئسیری هەڵمەتی دەنگی (S) ئاوازەدارێتی و کۆسپەکی لەدەستدەدا ... وێکچواندن بریتی‌یە لە کارتی‌کردنی دەنگەکانی دراوسێ لە کۆمەکی وتندا ، پتریش لە هەر شت کۆنسۆنانت لە ڕووی ئاوازەداری و کپی ؛ نەرمی و توندی‌یەوە دەکەوێتە ژێر باری کارتی‌کردنەوە .

وێکچواندنی هەمەکی (الکلی) و هەندەکی (الجزئی) هەیە . وێکچواندنی هەمەکی بەو حاڵەتە دەوترێ ، کە هەردوو دەنگەکە بە تەواوی وەك یەکیان لێ بێت . بۆ نموونە (کردتان) بە (کرتتان) تەلەفوزدەکرێ - واتە (د) بە کارتی‌کردنی (ت)ی دوایەوە ، دەبێ بە (ت) . لێرەدا لە سەرێکەوە دەنگی (د) لە ئاوازەداری‌یەوە دەبێ بە کپ و لە سەرێکی دی‌یەوە وەك (ت)ی دواوەی لێ دێ . وێکچواندنی هەندەکی (ناتەواو) . بەو حاڵەتە دەوترێ ، کە لە یەك ڕووەوە گۆڕان

بەسەر دەنگدا بێ . بەوێنە لە وشەی (گەستی)دا (ز) تەنیا لەباری کپبوونەوە کەوتووەتە ژێر کارتێکردنی (ت)ەوە و بووە بە (س) ، نەك بە (ت) .

کاری وێكچواندن لە ڕووی ئاراستەکردنیشەوە دوو جۆرە : ڕاستەوخۆ و پێچەوانە . لە حاڵەتی وێکچواندنی ڕاستەوخۆدا قورسایی هەڵمەت لە کۆنسۆنانتی پێشەوە بۆ کشانەوەی ئەو کۆنسۆنانتەی بەدوایدا دێ ڕوودەدات . لە حاڵەتی وێکچواندنی پێچەوانەشدا کشانەوەی کۆنسۆنانتی دواوە دەکەوێتە سەر هەڵمەتی کۆنسۆنانتی پێشەوەی . بەوێنە لە زمانی ئینگلیزیدا نیشانەی ( S)ی بەدوا دەنگی ئاوازەداردا وەك (Z) دەوترێ : < Handz ; reads < readz ... Hands و ئەمە وێکچواندنی ڕاستەوخۆیە . بۆ نموونەی پێچەوانەش ، ئەوەیە لە زمانی کوردیدا کە دەنگی کپی (ش) لە بەردەم هەندێ دەنگی ئاوازەداردا وەك (ژ) دەوترێ : هەشت > هەژدە ...

گۆڕین دژی وێکچواندنە و وتنی دەنگە دراوسێکان دەگۆڕێ . بەوێنە لە زمانی کوردیدا لە وشەکانی (گەستی) ؛ (کوشتی)دا (س ، ش) لە ئەنجامی گۆڕینی (ز ،ژ ) : (گەزی) ؛ (کوژرا) بە تەئسیری کۆنسۆنانتی (ت) دەنگی (ز ، ژ ) ئاوازەدارێتییان نەما .[١٢]

---

[١٢] لە زمانی ڕووسی و گەلێ زمانیدیدا کاری وێکچواندن بەربڵاوە و گۆڕین کەمترە ، بەڵام لە زمانی کوردیدا گۆڕین پتر لە وێکچواندن بەدی دەکرێ .

گونجاندن – ئەمە کارتیکردنی دەنگی دراوسێی بزوێن و کۆنسۆنانتن . بەوێنە لە زمانی کوردیدا کاتێ دەنگی (ك ،گ) دەکەونە پێش دەنگی (یێ ، ی ، ویێ ، وی)یەوە ، شێوەی دەربڕینیان دەگۆڕێت و تا ڕادەیێك لە تەلەفوزی دەنگی (چ ، ج ) نێزیك دەبنەوە : کێرد ، گێلاس ... کیسە ، گیسك ... گوێ ... هەنگوین ...

**پرۆتسێسی فۆنەتیکی شوێنەکی**

پرۆتسێسی فۆنەتیکی شوێنەکیی بنەڕەتی بریتییە لە : کورتکردنەوەی بزوێنی بێهێز ؛ هاودەنگی بزوێن ؛ کپبوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار لە کۆتایی وشەدا ، کەوتنی دەنگ لە سەرەتای وشەدا .

پەیدابوونی هێزی وشە نەك تەنیا بووە هۆی پەیدبوونی بزوێنی هێزدار ، بەڵکو بووە هۆی پەیدابوونی بزوێنی بێهێزیش . بزوێنی بێهێز دەکەوێتە ژێر باری کورتکردنەوە – واتە لاوازبوونی چۆنەکیی دەنگدارێتی . کورتکردنەوە بەسەر چەندەکی و چۆنەکیدا دابەش دەبێ . لە باری کورتکردنەوەی چەندەکیدا بزوێنی بێهێز درێژی و وزە لەدەست دەدا . بەوێنە (وو) لە(نووسین) و (نوسرا)دا .

کورتکردنەوەی چۆنەکی بەو جۆرە گۆڕانەی بزوێنی بێهێز دەوترێ ، کە نەك تەنیا درێژی و وزەی دەنگ دەگرێتەوە ، بەڵکو زەنگیش ڕەچاو دەکا .

هاوەدەنگیی بزوێن ، وێکچواندنی بزوێن دێنێتە یاد : هەندێ لە زمانناسان بە وێنە : ئی . ئا . ڕیفۆرماتسکی) هاوەدەنگیی بزوێن وەك وێکچواندنی نێو برگەیی تەماشا دەکەن و کورتکردنەوەش وەك گۆڕین . وێکچواندنی بزوێن بە نموونەی وەك (بووە) – (بۆتە) ... نیشان دەدرێ .

بۆ کپبوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار لەکۆتایی وشەدا دەتوانین وشەی (دش)ی کوردی بکەینە نموونە، کە (ژ)ی کۆنسۆنانتی ئاوازەداری کۆتایی بووە بەدەنگی کپی (ش) .

کەوتنی دەنگ لە سەرەتای وشەوە لە زمانی ئەکدۆتی‌دا زۆر باوە . لەم زمانەدا کۆنسۆنانتی (خ) بەزۆری لە سەرەتای وشەدا تێدەچێ . وەك (لێب) لە بریتی (خلێب) ... لە زمانی کوردیشدا ئەم دیاردەیە بەرچاو دەکەوێ ، بەوێنە لە کرداری داخوازیی ناسادەدا گەلێ جار (ب)ی داخوازیی پێش ڕەگی کردارەکە دەکەوێ ، وەك: (هەڵگرە) لەجێی (هەڵبگرە) ؛ (شەرمکە) لەبریتی (شەرم بکە) ...

## ڕاست وتن Orthoepy

پرۆتسێسی فۆنەتیکی لە زمانی ئاخاوتنی میللی‌دا سنوور نازانێ . بەوێنە لە دیالێکتەکانی زمانی کوردیدا نەك هەر گوێمان لە دەربڕینی (خاڵ) ، (گەل)، (ماندوو) ، (توند) ، (حاجی) ، (زاڕۆڵە) ، (زەلام) ، (مندال) ، (سووتاندن) ... دەبێ ، بەڵکو شێوەوتنی (خار) ،

(گەڵ) ، (مانگوو) ، (تونگ) ، (عاجی) ، (ذارۆڵە) ، (ذەلام) ، (مناڵ) ، (سووتانن)...یش دەبیسین .

ئاشکرایە ، دەربڕینی ڕیزی دووەم ، ئەگەرچی یاسای فۆنەتیکی تێدا ڕەچاوکراوە ، بەڵام نابێ وەك کێشەکی (المعیاری – Normative) تەماشا بکرێ . بۆیە لە زمانناسیی کارەکیدا داینکردنی تەلەفوز دەورێکی گەورە دەبینێ . لە داینکردنی تەلەفوزدا مەفهووم و تێگەیشتنی سەرەکی زمانی ئەدەبی و جۆری شێواز زۆر گرنگە .

جیٚگرتنەوە (alternation , gradation)ی فۆنەتیکی و مێژوویی

جیٚگرتنەوەی فۆنەتیکیی دەوروبەر و شوێنەکیی دەنگەکانی ئاخاوتن دەبێتە هۆی پەیدابوونی دیاردەی بوونی دەنگێك بە دەنگێکیدی لە سیستەمی دەنگیدا .بەوێنە بوونی کۆنسۆنانتی ئاوازەدار بە کپ و کپ بە ئاوازەدار ؛ بوونی بزوێنی درێژ بە کورت و کورت بە درێژ .

لە سیستەمی دەنگیدا دوو جۆرە جیٚگرتنەوەی لەو بابەتە هەیە ـ نوێ و مێژوویی . جیٚگرتنەوەی مێژوویی دەنگی جیاوازی ئاخاوتن دەشێ لە تاکە مۆرفێمێکدا بەدی بکرێ . جیٚگرتنەوەی مێژوویی بە هەلومەرجی پرۆتسێسی هاوچەرخەوە بەند نییە . بەوێنە : بوونی (س) بە (ز) : خواستن– خواس > خواز ؛ گەستن - گەس > گەز .. (ش) بە (ژ) : کوشتن - کوش > کوژ ؛ کرۆشتن – کرۆش > کرۆژ ... یاخود بوونی (ا)ی ڕەگی کردار بە (ێ) : بژاردن – بژار > بژێر ؛ ناردن – نار > نێر ... (و) بە (ۆ) : خواردن – خو > خۆ ؛ شوشتن – شو > شۆ ... (i) بە (ە) : بردن – ب > بە ؛ کردن –ک > کە ... (ی) بە

(یٚ) : بیستن - بی > بیٚ ؛ ویستن - وی > ویٚ ...و گەلێکی دی . ئەمانە ، کە جیٚگرتنەوە لە ڕەگدا بەجیٚدێنن و وەك کەرەستەی وشەسازی بەکاردێنرێن و ڕەگی کاتی ئێستا دروست دەکەن ، گەڵێ جار بە جیٚگرتنەوەی وشەسازی ناودەبرێن .

-٥-

## فۆنێم و سیستەمی فۆنێم

وەك بینیمان ، دەنگەکانی ئاخاوتن سروشتێکی ئاڵۆزیان هەیە . لێکۆڵینەوە لە لایەنە جۆربەجۆرەکانی دەنگەکانی ئاخاوتن بووە هۆی دیاریکردنی چالاکی و کەرەستەی هەمەچەشنی فۆنەتیکی و شێوازی لێکۆڵینەوەیان - ئەزموونگەریی فۆنەتیکی ؛ بەراوردیی مێژوویی فۆنەتیکی و فۆنۆلۆژی . بەتایبەت لێکۆڵینەوە لەبارەی فۆنێمەوە بە گرانی و پڕ دەمەتەقیٚ گەشەی سەند و چەند قوتابخانەیێکی فۆنۆلۆژی هاتنە کایەوە .

### مەفهوومی فۆنێم

لە سەرەتادا دەنگەکانیٚ ئاخاوتن وەك پێکهاتنی دەنگی دیاریکرابوون و بەرانبەر پیت ڕاگیرابوون . تەنانەت ماوەیێکی درێژیش بۆ ڕاگەیاندنی دەنگ ، زاراوەی "پیت" بەکاردەهێنرا . پێشکەوتنی زمانناسی لە سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی بە ڕوونی دەنگەکانی زمانی هاوچەرخ و دەنگەکانی زمانانی خزم بەرانبەر

دەنگ و پیت ڕابگرێ . بۆنیشاندانی دەنگ وەك ماکی سیستەمی دەنگیی زمان ، زاراوەی تایبەتمەندی (فۆنێم) جیاکرایەوە . ئەم زاراوەیە سالی ١٨٧٤ بۆ یەکەمجار (ل . ئافێ)ی زمانناسی فەرەنسایی بەکاری هێنا . بەلام ئەم زاراوەیە لە سەرەتادا وەك هاوواتای پێکهاتنی ناوی "دەنگی ئاخاوتن" لە کاردا بوو و بەتایبەتیش ف . دێ . سۆسسیور زۆر بەکاری دەهێنا . ئی . ئا . بۆدوئێن دێ کورتەنی دامەزرێنەری لێکۆلینەوەی فۆنێمە ، کە بە دوو جۆر تێی دەگەیشت . لە سەرەتادا لە ڕووی پێوەندیی ئەرکی‌یەوە لە مۆرفێمدا تەماشای فۆنێمی دەکرد . شێوەی زمانی هاوچەرخی ناونا (شێوەی فۆنێم - divergent) : (د) - (ت) . شێوەی مێژوویی‌یش - پێکەوە بەستراو ، زنجیرەیی (correlative) : (ك) - (چ) . دواتر دێتە سەر ڕای دەروونناسی (واتاناسی) و بە بۆچوونی گشتی دەربارەی وتن و وەرگرتنی دەنگی ئاخاوتن دەڕوانێتە فۆنێم .

زاراوەی "فۆنێم" واتای دانەی دەنگی سەرەکیی زمان دەگەیەنێت - جۆری دەنگ ، چەشنی دەنگی ئاخاوتن . فۆنێم - بچووکترین دانەی دەنگیی سیستەمی زمانە ، کە بریتی‌یە لە ماکی دەنگیی پێکهێنی وشە و مۆرفێم و دەوری جیاکردنەوەیان دەبینێ .

هەموو دەنگێکی ئاخاوتن فۆنێم نی‌یە . تەنیا ئەو دەنگانە فۆنێمن ، کە تایبەتن بە زمانێکی دیاری‌کراو و توانستی گۆڕینی جفزی دەنگیی مۆرفێم و وشەیان هەیە .

فۆنێم خاوەنی ئەرکی وەرگرتن و جیاکردنەوەیە . دەنگەکانی ئاخاوتن ، کە بە یاریدەی ئەندامانی بیستنەوە هەستیان پیٚدەکریٚ ، دەبنە ڕاستیی دەرککردن . لەدەرکی زمانیی قسەکەردا نموونەی دەنگەکانی ئاخاوتن و تیٚگەیشتنی گشتییان هەیە . ئەگەرچی ئامێری تایبەتی گەلیٚ خاسیەتی دەنگەکانی ئاخاوتن ئاشکرا دەکات ، بەلاّم هەموویان لەنەزەر ئاگیرێن و تەنیا ئەوانەیان ڕەچاودەکرێن کە لەگەلٚ نموونەی فۆنێمدا هاوجووت دێن و خاوەنی ئەرکی وەرگرتنن – واتە ئەو دەورەی دەیگەیەنێتە ئەنجامی هەست پیٚکردن .

فۆنێم تەنیا بە خاسیەتی بیستن و وتن لە یەکدی جیانابنەوە ، بەلٚکو بە توانستی گۆڕینی مۆرفێم و وشە و بەشداریکردنی لە واتا گەیاندنیشدا – واتە بوونی خاسیەتی جیاکردنەوە . بەوێنە ، وشەی (نان) و (بان) یەکەم کۆنسۆنانت لەیەکیان جیادەکاتەوە ، هەرچی وشەکانی (نان) و (بەن)ە – بزوێن دەیانگۆڕیٚ . بەلاّم خاوەنێتی ئەرکی جیاکردنەوە (جیاکرنەوەی واتا)ی فۆنێم تەنیا جغزی دەنگیی وشە دەگۆڕیٚ و هەر بەم واتایە بەشداری لە دەربڕینی مانادا دەبینیٚ .

وشە کە لە یەك جیادەبنەوە ، هێندە لەبەر ئەوەنییە ، کە لە دەنگی جیاواز پێكهاتوون ، وەك هێندەی لەبەرئەوەیە ، کە مەفهوومی جیاواز دەگەیەنن .

خاسیەتی بیستن و وتنی فۆنێم گرنگی و چەسپاوییان لەشەپۆلی ئاخاوتن و بایەخی جیاکردنەوەی خودی فۆنێم لە یەکدی لە ڕادەیێکی یەکسانیدا نییە . بەوێنە بزوێنی (ۆ) و (یٚ)ی کوردی – ڕەوانن

(بیڤلۆکی نین) ، بەلاّم ئەم خاسیەتە لە فۆنێمی دیکەیان جیاناکاتەوە ، چونکە گشت بزوێنەکانی زمانی کوردی بیڤلۆکی نین . بەو پێیە ، ئەمە خاسیەتی گشتیی بزوێنە . ئەم جۆرە خاسیەتە گشتییانەی بزوێن ، کە ناتوانن بۆ سنوور جیاکردنەوەی فۆنێمی زمان بەکاربهێنرێن ، بە دەست لێنەدراو ناودەبرێن .

خاسیەتی دەست لێنەدراو بەرانبەر خاسیەتی جیاکەرەوە دەوەستێ . خاسیەتی جیاکەرەوەی فۆنێم تایبەتێتی بیستن و وتنیان دەگەیەنن ، کە لەلایەن قسەکەرەوە وەردەگیرێ و فۆنێم لە یەکدی جیادەکەنەوە و هەروەها توانستی دەرککردن و ناسینەوەی وشە و مۆرفێم دەرەخسێنن .

بەوێنە فۆنێمی (ع)ی فەرەنسی ژاوەژاوی بیڤلۆکی نییە و بریتییە لە خاسیەتی جیاکەرەوە ، لەبەرئەوەی لە زمانی فەرەنسیدا بزوێنی بیڤلۆکی (ۓ) هەیە . بۆ (ڕ ، ڵ)ی کوردی قەڵەوی بریتییە لە خاسیەتی جیاکەرەوە ، چونکە لە زمانی کوردیدا (ر ، ل)ی لاواز هەیە : (کەڕ – کەر) ؛ (کەڵ – کەل) ...

بەم چەشنە فۆنێم وەك دانەی دەنگیی ئاڵۆز خۆی دەنوێنێ . سەرجەمی تایبەتێتی جیاوازی بیستن و وتن بە شێوەی جیاواز لە زنجیرەی دەنگیدا بەدەردەکەوێ ، بەچەشنی جیاواز ئەرکی وەرگرتن بەجێدێنن . فۆنێم لە هەمان کاتیشدا بەشێکە لە ئاوێتەی سیستەمی فۆنەتیکیی زمان ، کەوا نەك تەنیا پێکهاتنی فۆنێم دەگرێتەخۆ ، بەڵکو لە یەکگرتنیشیاندا باڵ بەسەر توانستی شێوەگۆڕییاندا دەکێشێ .

**فۆنێم و شێوەگۆڕیی فۆنێم**

فۆنێم وەك كەمترین دانەی پێكهاتنی دەنگی نەك تەنیا  بە یەكێتی خاسیەتی بیستن و وتن دیاریدەكرێ ، بەڵكو بە هاوپێوەندی بە فۆنێم و وشەی یەك فۆنێمیشەوە جیادەكرێنەوە . بەوێنە زوربەی فۆنێمە بزوێنەكانی كوردی دەتوانن وەك پاشگر خۆیان بنوێنن . وەك :

زان + ا = زانا

ڕاست + ە = ڕاستە

مرد + وو = مردوو

جوان + ی = جوانی

...هتد .

لەگەڵ ئەوەشدا ، فۆنێم وەك شتێكی ئاسایی دەبێتە بەشێكی جغزی دەنگیی گیرەك (پێشگر و پاشگر) . وەك :

ڕوون + اك = ڕووناك

كوت + ەك = كوتەك

......

ڕا + کردن - ڕاکردن

ڕۆ + نان - ڕۆنان

... هتد .

فۆنێم لە بەشدارکردنی مۆرفێم و وشەدا دەکەوێتە ژێر باری شێوەگۆڕیی فۆنەتیکی‌یەوە . شێوەی جیاوازی فۆنێمێک لە باری بیستن و وتنەوە دەشێ لە یەکدی نێزیک بن و دەشلوێ زۆر لە یەکدی دوور بن . بەوێنە شێوەگۆڕیی (ێ) لە وشەکانی (ئێرە) و (شێر) و (جوانێ)دا هێندە لەیەك نێزیکن ، کە ئاخێوەری کورد هەست بە جیاکردنەوەیان ناکات . بەپێچەوانەوە جیاوازیی وتنی (ز) وەك (س) یەکجار دیار و ئاشکرایە ، ئەویش نەك تەنیا لەبەرئەوەی لەنێوان ئەو دوو دەنگەدا جیاوازیی بیستن و وتن هەیە ، بەڵکو لەبەرئەوەش ، کە هەر یەکەیان فۆنێمێکی سەربەخۆی زمانی کوردی‌یە و جفزی دەنگیی وشە جیادەکەنەوە : زاڵ - ساڵ ...

فۆنێم لە ڕشتەی دەنگی‌دا وەك شێوەی جیاواز تەلەفوز دەکرێ - واتە وەك دەنگی چەسپیوی ئاخاوتن . بێگومان شێوەیان لە کۆمەڵی دەنگ زیاترە . دەنگی ئاخاوتنی دیاری‌کراو ، کە بریتی بێ لە واقیعی جۆری دەنگی زمان ، شێوەی فۆنێمی پێ‌دەوترێ و دەنگسازە ئەمەریکایی‌یەکانیش بە (Allophone) ناوی دەبەن . بەوێنە هۆی جیاوازیی وتنی (ك) لە وشەکانی (کەم) و (کێم)دا ئەوە نی‌یە ، کە دوو

فۆنێمی جیاواز بن ، بەڵکو هەر یەك فۆنێمە و لە حاڵەتی دووەمدا بزوێنەکەی دوایەوە شێوەی وتنی گۆڕیوە .

شێوەی فۆنێم دەشێ فۆنەتیکی یان نافۆنەتیکی بێ . شێوەی نافۆنەتیکیش دابەش دەبێ بەسەر تاکایەتی و دیالێکتی و دابینکردنی وتندا . شێوەی تاکایەتی تەلەفوزکردنی بەندە بە پێکهاتنی ڕشتەی ئاخاوتنەوە .

بەوێنە ، جیاوازیی دەنگی ئافرەت و پیاو ؛ ناتەواویی وتن : (زمانپسی ، زیقاوڵەیی ، دەنگ گڕی ...) ؛ بارودۆخی ئاخاوتن : (بەرز ، نزم ، خێرا ، لەسەرخۆ) .... شێوەی دیالێکتی ، وەك ئەوەی لە بەشە دیالێکتی هەورامانداا (س) وەك (ث)و (ز) وەك (ذ) تەلەفوز دەکرێ ؛ یاخود لە ناوچەی کۆیە و خۆشناوەتی و دزەییایەتی و گەردییایەتی (ڵ) دەکەن بە (ل) ... شێوەی دابینکردنی تەلەفوز پلە بە پلەی پێشکەوتن و شێوازی گەشەسەندنی کێشی تەلەفوزکردن نیشان دەدا .

## مەفهوومی سیستەمی فۆنێم

تایبەتێتییێکی گرنگی فۆنێم بەشداریێتی لە پێکهاتنی دەنگیی زمانێکی دیاریکراو و سیستەمی فۆنەتیکیدا . ئەو سیستەمە پێکهاتووە لە کۆمەڵێ فۆنێم ، کە پێوەندییان بەیەکترەوە هەیە و

هەروەها دەستووری یەکگرتنیان لە شەپۆلی ئاخاوتندا و لە پێکهاتنی مۆرفیمدا ئاشکرایە .

سیستەمی فۆنۆلۆژیی زمانان یەک لەیەک جیاوازن .یەکەم – چەندەکیی فۆنیمەکان و نیسبەتی بزوێن و کۆنسۆنانت . بۆ نموونە لە زمانی ئەبخازیدا (٦٠) فۆنیم هەیە (لەنێوانیاندا تەنیا دوانیان بزوێنن : ا ، ی) . لە زمانی ئەرانتی ئوستڕالیدا (١٣) فۆنیم هەیە (سیانیان بزوێنن) . بێگومان سیستەمی (٢) یان (٣) بزوێنی لە سیستەمی (١٥) بزوێنی (وەك لە زمانی فەرەنسی و ئەڵمانیدا) جیاوازە . زمانان لە ڕووی چۆنەکیی فۆنیمیشەوە لە یەکتر جیادەبنەوە ، کە ئەمە تایبەتێتی وتن و بیستن دەگرێتەخۆ . بەوێنە بزوێنی بیڤلۆکی و کۆنسۆنانتی زوانەچکۆلەیی فەرەنسی ؛ کۆنسۆنانتی نێوددانەکیی ئینگلیزی ؛ نیمچەکۆسپەکی ئاوازەداری ئیتالی؛ کۆنسۆنانتی کۆسپەکی ئەوکیی قەفقاسی ؛ کۆنسۆنانتی بیڤلۆکی پشتەوەی زمانی تورکی ، تەوژمۆکی ئەوکیی عەرەبی و گەلێ جۆری دی دەنگی ئاخاوتن ، کە لە زمانانی جیاوازدا هەن ، بەنیسبەت تەلەفوزی کوردی و سیستەمی فۆنیمی کوردی‌یەوە نامۆن .

دووەم – سیستەمی فۆنیمی زمانانی جیاواز بە ڕێکخراوی گرووپی فۆنیم لە یەکدی جیادەبنەوە . گرووپی فۆنیم هاوڕێژە و دژڕێژەی هەیە . گرووپی هاوڕێژە بەو گرووپە فۆنیمانە دەوترێ ، کە بە تاکە خاسیەتێکی فۆنۆلۆژی لەیەك جیادەبنەوە . بەوێنە (ب) – (پ) ،

کە تەنیا لە ڕووی ئاوازەدارێتی‌یەوە لەیەك جیادەبنەوە ، کۆنسۆنانتی دژبڕێژە ڕووی جیاوازیان دوو یاخود پتر خاسیەتی فۆنۆلۆژی‌یە . بەوێنە ، لە زمانی کوردیدا فۆنێمی (ب) و فۆنێمی (س) بە سێ خاسیەت لەیەك جیادەبنەوە : فۆنێمی (ب) - کۆنسۆنانتی (لێوەکی) و (کۆسپەك) و (ئاوازەدار) ە ، بەلام (س) - کۆنسۆنانتی (زوانەکی) و (خشۆك) و (کپ)ە .

سێیەم - سیستەمی فۆنێمی زمانانی جیاواز بە ئەرکی فۆنێم لە شەپۆلی ئاخاوتندا و گۆڕانی و هەلومەرجی لەیەکدی جیادەبنەوە . بە واتاییکی‌دی سیستەمی فۆنێم تەنیا بە پێکهاتنی فۆنێم و هاوڕێژەیی لەیەك جیانابنەوە ، بەلکو بەو خاسیەتی بیستن و وتنەی فۆنێمیش ، کە تایبەتن بە بناغەی دەربڕینی زمان و ئەو تایبەتێتی‌یە فۆنەتیکی‌یانەی سروشتی تەلەفوزی وشەی زمانێکی دیاری‌کراون .

بەوێنە لە زمانی ڕووسی و زمانی کۆرێی‌دا کۆنسۆنانتی زرینگۆکی تەنیشت و لەرۆك هەیە ، بەلام باریان لە سیستەمی فۆنۆلۆژیدا جیاوازە : لە زمانی ڕووسیدا ئەو کۆنسۆنانتانە - (ل ، ر) هەردووکیان فۆنێمی جیاوازن ، کەچی لە زمانی کۆرێی‌دا ، نەك هەر بە نەرمی و ڕەقی لەیەك جیانابنەوە ، بەلکو (ر) ش شێوەی فۆنێمی (ل)ە .

فۆنێم بە شێوەی جیاواز تەلەفوز دەکرێ : لە برگەی کراوە و داخراودا ؛ لەسەرەتا و کۆتایی مۆرفێم و وشەدا ... وەك ئاشکرایە ، لە

زمانی ڕووسیدا مانەوەی ڕەقێتیی و نەمانی ئاوازەدارێتی خاسیەتی کۆتایی وشەیە ؛ نەبوونی خاویی لە سەرەتای وشە و برگەدا ؛ کورتبوونەوەی بزوێنی بێهێز ، ئەمانە و هەندێ تایبەتێتی دی تەلەفوزکردن ئاوازی ڕووسی پێکدێنن . کاتێ ڕووس بە زمانێکی دی بدوێ و لەو زمانەدا ئەو تایبەتێتییانەی تەلەفوزکردنی فۆنێم کە بە ڕەوتی ئاخاوتنییەوە بەندن ، تێدا نەبێ ، ئەوە بە ئاشکرا ئاوازە تایبەتییەکە دەردەکەوێ .

لە کۆتاییدا ، سیستەمی فۆنێمی زمانێکی دیاریکراو لە ئەنجامی پێشکەوتنی مێژووییدا لە سیستەمی فۆنێمی زمانێکیدی و تەنانەت لە زمانی خزمیش جیادەبێتەوە .

### قوتابخانە فۆنۆلۆژییەکان

لێکۆڵینەوەی هاوچەرخ دەربارەی فۆنێم لەسەر یەك ڕێباز نییە . تیۆریی فۆنێم لە ڕووسیا سەری هەڵدا و وەك پێشتر وتمان ئی . ئا . بۆدوئێن دێ کورتەنی دامەزرێنەری بوو . ڕووی مۆرفێمی لەلایەن قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی مۆسکۆوە خرایە سەر بناغەی . ڕووی واتاناسی (دەروونناسی)یش قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی لێنینگراد نایە بان بناغەی .

قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی مۆسکۆ بەتایبەتی لە بەرهەمی پ . ئی . ئاڤانێسۆڤ و پ . س . کوزنیتسۆڤ و ئا . ئا . ڕیفۆرماتسکیدا ڕەنگی

داوەتەوە . ڕوانگەی ئەم قوتابخانەیە لە ئاسۆی تێگەیشتنی فۆنێمەوەیە وەك کورتترین دانەی دەنگی ، کە بریتی بێ لە ماکی جفزی دەنگیی دانەی واتادار (مۆرفێم و وشە) و باری هەلومەرجی فۆنەتیکی - بەتین و بێتین . فۆنێم لە باری بەتینیدا لە شێوەی بنەڕەتیدا بەدەردەکەوێ ، سەربەخۆ جفزی دەنگی جیادەکاتەوە (پێی دەڵێن فۆنێمی بەتین) . لە باری بێتینیدا دەنگی فۆنێم بەندە بە باری فۆنەتیکییەوە .

فۆنێمی بێتین - واتە فۆنێم لە باری بێتینیدا تووشی شێوەگۆڕی دەبێ . هەرچی ئەو دوو شێوەگۆڕییەشە دوو جۆرە : یەك - شێوەگۆڕییێکی وا ، کە وەك دەنگی فۆنێمێکی دی لێ نەکا . دوو - بەپێچەوانەوە لەگەڵ دەنگێکی دیدا بیانکاتە هاوبێژ .

قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی لێنینگراد بەر لە هەر شت بە بەرهەمەکانی ل . ڤ . شێربا و ل . ڕ . زیندێر و ئا . ن . گڤۆزدێڤ و م . ئی . ماتوسێڤیچ بنیات نراوە . نیگای ئەم قوتابخانەیە لەسەر بنچینەی ددانپێدانانی سەربەخۆیی دەنگەکانی ئاخاوتن و ئەرکی جیاکردنەوە ، فۆنێم ڕۆنراوە . نوێنەرانی قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی تێگەیشتنی یەك لایەنی فۆنێم ، وەك جفزی دەنگیی مۆرفێم ، وەك چەپکێك خاسیەتی جیاکەرەوە ، وەك یەکێتی دەورووبەر دەژمێرن .

لەنێوان قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی مۆسکۆ و قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی لێنینگراددا وێکچوون زۆرە : هەردوو بەرە دەدان بە خاسیەتی ئەرکی فۆنێم وەك دەدانەی زمانی ؛ بوونی سیستەمی فۆنێمی زمانی دیاریکراو ؛ گۆڕانی مێژوویی..دا دەنێن . ئەم قوتابخانانە لە قوتابخانە فۆنۆلۆژییەکانی هەندەراندا ددانیان پێدا نرا .

لە قوتابخانە فۆنۆلۆژییەکانی هەندەران ، قوتابخانەی فۆنۆلۆژیی پاریس (بەتایبەتی کتێبی ن . س . تروبێشکی "بنچینەی فۆنۆلۆژی" کە ساڵی ١٩٣٩ بڵاوکراوەتەوە) و لەندەن (کتێبی د . جۆونز "فۆنێم : سروشتی و بەکارهێنانی" ، ١٩٥٠ و ئەمەریکا ("فۆنێم"ی ك . ل . پاییك ، ١٩٤٧ ؛ "ڕابەری فۆنۆلۆژی "ی چ . هۆکێت ، ١٩٥٥) و کۆپنهاگن (کاری سەرەکی ل . ئێلمسلێڤ "تیۆریی زمان" ، ١٩٤٣) ... پتر ناسراون .

لەو کتێبە ناوبراوانەدا و پتریش لە کارەکانی ئەم دە ساڵەی دواییدا (لەتەك لێکۆڵینەوەی چاولێکەریی کێشەی فۆنەتیکی و فۆنۆلۆژیدا) گرنگی بە هەندی مەبەست دراوە و پێشنیاری گەیاندنە ئەنجامی لێکۆڵینەوە بە یاریدەی نوێترین وەسیلە و ئامێری تەکنیکی بیستنی ئاخاوتن بکرێ و سیستەمی فۆنۆلۆژی کەڵك لە ژیربێژی و بیرکاری وەربگیرێ .

## فەرهەنگۆک

| | | |
|---|---|---|
| ئاخاوتن | الكلام | Speech |
| ئاخێوەر | المتكلم | Speaker |
| ئارام | الصبر | Retention |
| ئارەزوو | الرغبة | Desire |
| ئاسمانە | الحنك، سقف الفم | Palate |
| - پەردەی ئاسمانە | لهاة | Uvula |
| - رەقە ئاسمانە | الحنك الصلب | Hard Palate |
| - کۆنسۆنانتی ئاسمانە | الصوامت الحنكية | Palatal consonants |
| - نەرمە ئاسمانە | الحنك الرخو | Soft palatal |
| (بڕوانە : مەلاشوو) | | |
| ئاسۆیی | الافقي | Horizontal |
| ئاکار | الخلق | Character |
| ئاگا | الشعور، الوعي | Consciousness |
| ئامراز | الاداة | |
| - ئامرازی پێوەندی | حرف العطف | Conjunction |
| - ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن | اداة التعجب والنداء | Interjection |
| ئامێرایەتی | الالية | Mechanism |
| ئاواز | نغمة الكلام | Intonation |
| - ئاوازی سەروو | النغمة التوافقية | Overtone |

| | | |
|---|---|---|
| - ئاوازی فرەئاواز | متعدد النغمات | Polytonic |
| - ئاوازی هاودەنگ | اللفظة المجانسة | Homophonus |
| - ئاوازی یەك ئاواز | احادي النغمة | Monotonic |
| ئاوازەدار | المجهور | Voiced |
| ئاوەڵکردار | الظرف | Adverb |
| ئاوەڵناو | الصفة | Adjective |
| ئاوێتە | خليط | Mixed |
| ئاهەنگ | اللحن | Melody |
| - ئاهەنگی ئاخاوتن | | |
| ئەرك | وظيفة | Task, Duty |
| ئەستوونی | العمودي | Vertical |
| ئەلفوبێ | الالفباء | Alphabet |
| ئەندام | العضو | Organ |
| - ئەندامی ئاخاوتن | عضو النطق | Organ of speech |
| ئەوك | الحنجرة | Throat |
| ئەوکی | الحلقي | Glotal |
| ئێتیمۆلۆژی | الاتيمولوجيا (علم اصل الكلمة وتاريخها) | Etymology |
| ئیدیۆم (فرێزیۆلۆژی) | علم الكناية (علم العبارات الاصطلاحية) | Phraseology |
| بابەتەکی | الموضوعي | Objective |
| برگە | المقطع | Syllable |

| | | |
|---|---|---|
| - بڕگەی داخراو | المقطع الساكن | Closed syllable |
| - بڕگەی كراوە | المقطع المتحرك | Open syllable |
| - بڕگەی بێهێز | المقطع غير منبور | Unstressed syllable |
| - بڕگەی هێزدار | المقطع المنبور | Stressed syllable |
| - فرەبڕگەیی | متعدد المقاطع | Polysyllable |
| -یەك بڕگەیی | احادية المقاطع | Monosyllable |
| بڕوا | العقيده، الاعتقاد | Belief |
| بزۆز | المتحرك | Active |
| بزوێن | حرف العلة | Vowels |
| - بزوێنی درێژ | المد | LongVowels |
| - بزوێنی دوولانە | ادغام حرفي العلة | Diphthong |
| - بزوێنی سێلانە | الطليق الثلاثي | Triphtong |
| - بزوێنی كورت | الحركة | Short vowels |
| بڵندی | علو، ارتفاع | Height |
| بۆچوون | التصور | Think, Conaider |
| بۆریچە | الشعبة | Bronchial tubes |
| بۆریی هەوا | القصبة الهوائية | Windpipe |
| بۆشایی لووت (كونەلووت) | الخيشوم (التجويف الانفي) | The Nasal Cavities |
| بەرتەك | رد فعل | Reaction formation |
| بەردەن | متحجر | Fossilized, Petrified |

بەرزی (بڕوانە: بڵندی) .

| | | |
|---|---|---|
| بەرگر | يطوق ، يحبس | Enclitic , Synenclitic |
| بەریان | اتجاه | Direction |
| – بەریانی فراژۆبوون | اتجاه النمو | Developmental direction |
| بەشەکانی ئاخاوتن | اقسام الكلام | Parts of speech |
| بەهرە | الحدس | Intuition |
| بەهرەکی | الحدسی | Intuitional |
| بیر | الذاكرة | Memory |
| بیستن | سمعي | Acoustic |
| بیقلۆك | الانفی، الخیشومی | Nasal |
| پارچە (کەرت) | قطعة، جزء | segment |
| –پارچە بەدەرایەتی | قطعة جزئية صوتية ، تقطيعة | Supersegment |
| پاشبەند | لفظة مؤخرة | Postposition |
| پاشگر | اللاحقة | Suffix |
| پرۆتسێس | العملية | Process |
| – پرۆتسێسی دەوروبەر | ارتباطي | Combinatory |
| – پرۆتسێسی شوێنەکی | موقعي | Positional |
| پشتەکی | الظهري | Dorsal |
| پل | نبض | impulse |
| پۆپەیی | سمك القد | Cocuminal |
| پووك | اللثة | Gum |

| | | |
|---|---|---|
| - پووکە مەلاشوویی | اللثة حنكي | Palatal Alveolar |
| پووکی | السنخي | Alveolar |
| پیّبەست | الرابطة | Connective , Relating |
| پیت | الحرف | letter |
| پیّچەوانە | العكس | Inverse , Contrary |
| پیّشبەند | حرف الجر | Preposition |
| پیّشگر | السابقه | Prefix |
| پیّکەڵ بوون | التطابق | Accordancee , Conformity |
| پیّوار | الرمز | Symbol |
| پیّوارەتی | الرمزية (مذهب) | Symbolism |
| پیّوانە | القياس | Measure |
| - پیّوانەی کارەکی | عملي | Practical |
| پیّوەر | مقياس | Criterion , Measurer |
| پیّویستی | الضرورة | Necessity |
| تاك | المفرد | Singular |
| تاکایەتی | فردي، شخصي | Indivdual |
| تاوگیری | الانفعال | Emotion |
| تایبەتی | الخاصة، الخصوصي | Special |
| ترازان | التفكك | Differentiation |
| تریە | الايقاع | Breath gruop |
| توانست | القدرة ، الامكانية | Ability |

| | | |
|---|---|---|
| Reflex | الانعكاس | تەكدانەوە |
| Pronunciation | التلفظ | تەلەفوزكردن |
| | | (بڕوانە : دەربڕین) |
| Body , Figure | الجسم | تەن |
| Pressure | الضغط | تەوژم |
| Plosive | الانفجاري | تەوژمۆك |
| Glotal Plosive | الانفجار الوتري | – تەوژمۆكی ئەوكی |
| Strength , Force | الشدة | تین |
| Gender | الجنس | جنس |
| Neuter gender | الجنس المحايد | – جنسی بێلایەن |
| Epicene gender | الجنس المزدوج | – جنسی دوولایەن |
| Feminine gender | الجنس المؤنث | – جنسی مێ |
| Mosculine gender | الجنس المذكر | – جنسی نێر |
| Coupling | الاقتران | جووت هاتن |
| Alternation , Gradation | تناوب | جێگرتنەوە |
| Pronoun | الضمير | جێناو |
| Infinitive | المصدر | چاوگ |
| Imitation | التقليد | چاولێكەری |
| Qualitative | الكيفي | چۆنەكی |
| Glacial epoch | العصر الجليدي | چەرخی سەهۆڵبەندان |
| quantitative | الكلي | چەندەكی |

| | | |
|---|---|---|
| Essence | الماهية | چییەتی |
| Integral Feature | سمة متكاملة | خاسیەتی دەست لێنەدراو |
| Distinctive Feature | سمة مميزة | خاسیەتی جیاکەرەوە |
| Fricative | الاحتكاكي | خشۆك |
| Volition | الارادة | خواز |
| Voluntary | الارادي | خوازەکی |
| Self- Control | ضبط النفس | خۆگری |
| Variation | تنوع | خۆگۆڕ (شێوەگۆڕ) |
| Subjective | الذاتي | خۆیەکی |
| Quickness | السرعة | خێرایی |
| Private property | الملكية الخاصة | دارایی تایبەتی |
| Derivation | الاشتقاق | دارِشتن |
| Stigma | الوصمة | داغ |
| Unit | وحدة | دانه |
| The teeth | الاسنان | ددان |
| Lower teeth | الاسنان السفلي | - ددانی خوارەوە |
| Upper teeth | الاسنان العليا | - ددانی سەرەوە |
| Dental | السني | ددانی |
| Length | الطول | درێژی |
| | التضاد | دژایەتی |
| Antonym | الاضداد | دژواتا |

| | | |
|---|---|---|
| دژەکردار | رد الفعل | Reaction |
| دواگر | ميل ، نزعة | Proclitic |
| دۆخ | الحالة | Case |
| دوودڵ | الشاك | Doubtful |
| دوودڵی | الشك | Doubt |
| دوولاگرایەتی | التنوية | Dualism |
| دەربڕین | التلفظ | Pronunciation |
| دەروونناس | العالم النفسي | Psychologist |
| دەروونناسی | علم النفس | Psychology |
| دەرەکی | الخارجي | Outsider , Stranger |
| دەستەواژە | العبارة (العقدة) | Phrase |
| دەنگ | الصوت | Sound |
| دەنگساز (دەنگناس) | عالم الصوت | Phonetican |
| دەنگسازی (دەنگناسی) | علم الصوت | Phonetics |
| دەنگبڕان | الحبسة | Aphasia |
| دەنگەژێ | الاوتار الصوتية | Vocal C ords |
| دیارخراو | | Dependent member determinatum |
| دیارخەر | | Atributive (adherent) adjunct , attribute |
| دیفتۆنگ | ادغام حرفي علة | Diphthong |
| – دیفتۆنگی داکشاو | الاصوات المدغمة المنسحبة (المنبسطة) | Outgoing diphthong |

| | | |
|---|---|---|
| Rising diphthong | الاصوات المدغمة الصاعدة | – ديفتۆنگى هەڵكشاو |
| Diphthongoind | | ديفتۆنگۆيد |
| Naturalism | مذهب الطبيعيين | ڕاڕەوەى سروشتەكى |
| Orthoepy | اللفظ الصحيح | ڕاست وتن |
| Sentence | الجملة | ڕستە |
| Interrogative sentence | الجملة الاستفهامية | – ڕستەى پرس |
| Affirmative sentence | الجمله الخبريه | – ڕستەى خەبەرى |
| Exclamatory sentence | جملة التعجب | – ڕستەى سەرسوڕمان |
| Syntax | علم النحو | ڕستەسازى (سينتاكس) |
| Organ | الجهاز | ڕشتە |
| Organs of speech | الجهاز النطق | – ڕشتەى ئاخاوتن (ڕشتەى وتن) |
| The central nervous system | جهاز العصبي المركزى | – ڕشتەى دەمارانى ناوەندى |
| Vocal apparatus | جهاز الصوت | – ڕشتەى دەنگ |
| Organ of windpipe | الجهاز التنفسى | – ڕشتەى هەناسە |
| Sham | العارض | ڕووكەش |
| Originality | الاصالة | ڕەسەنى |
| Root | جذر | ڕەگ |
| Root of verb | جذر الفعل | – ڕەگى كردار |

| | | |
|---|---|---|
| ڕەوانبێژی | البلاغة | Stylistics |
| ڕەها | المطلق | Absolute |
| بەڕەهایی | مطلقا | Absolution |
| ڕەهایەتی | المطلقية | Absolutism |
| ڕێباز | الطريقة | Method |
| ڕێڕەو | اتجاه ، مسار | Tendency |
| ڕیز | منطقة | Zone |
| - ریزی پشتەوە | منطقة خلفية | Backword Zone |
| - ریزی پێشەوە | منطقة امامية | Forword Zone |
| - ریزی ناوەڕاست | منطقة الوسطية | Mid(dle) Zone |
| ڕێزمان | القواعد | Grammar |
| - ڕێزمانی بەراوردیی مێژوویی | | Comparative grammar |
| ڕێژە | الصيغة | Formula |
| ڕێنووس | الاملاء | Orthography |
| زانست | العلم | Knowledge, learning |
| - زانستی کۆمەلایەتی | علم الاجتماع | Sociology |
| زرنگانەوە | رنين | Sonorousness |
| زرینگۆك | الرنان | Resonant |
| ١- زمان | اللغة | language |
| - زمانە ئێرانییەکان | اللغات الايرانية | Iranian Language |
| - زمانە هیندو | اللغات الهندو - | Indo-European Language |

| | | |
|---|---|---|
| ئەوروپاییەکان | اوربيه | |
| - زمانی پێڕۆی ژمارەی دەدە | نضام العد العشري | Algorithmic Language |
| - زمانی پێناو | لغة الوسيط | Mediator (madiating , intermediate , intermediary) Language |
| - زمانی فارسیی ناوەڕاست (پەهلەوی) | اللغة الفارسية الوسطى (البهلوية) | Pahlavi |
| - زمانی نێومیللەتان | اللغة العالمية | International Language |
| زمانناس | عالم اللغة، لغوي | Linguist |
| زمانناسی | علم اللغة | Linguistics |
| - زمانناسیی کارەکی | علم اللغة العملي | Practical Linguistics |
| ٢- زمان | اللسان | The Tongue |
| - زمانە بچکۆلە | اللهاة | Uvula |
| - بنی زمان | مؤخرة اللسان | |
| - سەری زمان | اسل اللسان ، مقدمة اللسان | Tip of the Tongue |
| - لێواری زمان | حافة اللسان | Edg of Tongue |
| - ناوەڕاستی زمان | وسط اللسان | Sentrolor Tongue |
| زوانەکی | الاسلي | Lingual |
| - زوانەچکۆلەیی | اللهوى | Uvular |
| زەنگ | الجرس | Timbre |

| | | |
|---|---|---|
| ژاوەژاو | ضجيج | Noise |
| ژاوەژاوەیی | الضجيجي | Noise (breath) consonant |
| ژمارە | العدد | Numeral |
| ژیریێژی | المنطق | Logic |
| ژێر خان | البنية التحتية ، اساس | Basis |
| سروشت | الطبيعة | Natural |
| سروشت بەدەرایەتی | فوق الطبيعة | Supernaturalism |
| سروشتایەتی | الطبيعي | Naturalism |
| سۆز | العاطفة | Sentiment |
| سۆنانت | الصوتى | Sonant |
| سەرخان | البنية الفوقية | Superstructure |
| سی | الرئة | The lung |
| سیستەم | النظام | Systeme |
| - سیستەمی زمان | نظام اللغة | Systeme of a Language |
| سینتاگمە | تركيب او بناء الجملة | Syntagme |
| شەبەنگ | الطيف | Spectrum |
| - شەبەنگی دەنگ | طيف الصوت | Sound spectr |
| شەبەنگنووس | مرسمة الطيف | Sectrograph |
| شەپۆل | الموج | Wave |
| شەویلە | الفك | Jaw, Maxilla |
| شیمانە | الاحتمال | Probability |

| | | |
|---|---|---|
| شێواز | الاسلوب | Style |
| شێوازناسی | علم البلاغه (البيان) | Styleistics |
| شێوەگۆڕی | تغيير، الانحراف | Variation |
| شێوەناسی | دراسه الملامح | Physiognony |
| ١ - شێوەی فۆنێم | نمط الفونيم | Allophone |
| شێوەی فۆنێمی پەیوەند | نمط الفونيم الشرطي | Dependent (conditioned) Allophone |
| ٢- شێوەی فۆنێم | | Divergent |
| فراژۆ | النمو، التطور | Development progress |
| فرەواتا | كثير المعاني، تعدد المعاني | Polysemantic |
| فرێزیۆلۆژیی | علم الكناية، علم العبارات الاصطلاحية | Phraeological |
| فشار | الضغط | Pressure |
| (بڕوانە : تەوژم) | | |
| فۆرم | شكل، قالب | Form |
| (بڕوانە: قاڵب) | | |
| فۆنۆلۆژی | علم وظائف ونظم الاصوات الكلامية | Phonology |
| فۆنەتیك | علم الاصوات | Phonetics |
| - ئەزموونگەریی فۆنەتیکی | ـ التجريبي | Instrumental (exerimental) phonetics |
| فۆنێم | الوحدة الصوتية | Phoneme |
| فەرمان | الامر | Imperative |

| | | |
|---|---|---|
| فەرهەنگ | قاموس، معجم | Vocabulary , Dictionary |
| فەرهەنگنووس | مؤلف معاجم (قواميس) | Leicographer |
| فەرهەنگنووسی | علم تصنيف المعاجم | Lexicography |
| فیشکەیی | الاصوات المكتومة | Hushing sounds |
| فیکەیی | الصفيري | Whistling (sibilant) |
| - کۆنسۆنانتی فیکەیی | الصوامت المصفرة | Whistling (sibilant)consonant |
| ڤۆگالیزم | حروف العلة | Vocalism |
| قاڵب (بڕوانە : فۆرم) | شكل ، قالب | Matrix |
| قۆناغ | المرحلة | Phase |
| قەفەزی سنگ | قفص الصدر | Thorax |
| کارەکی | العملي | Practical |
| کاسەی سەر (بڕوانە : کەللەسەر) | | |
| کپ | المهموس | Voiceless |
| کردار | الفعل | Verb |
| - کرداری ئێستا | الفعل المضارع | Present tense |
| - کرداری تێپەڕ | الفعل المتعدى | Transitive verb |
| - کرداری تێنەپەڕ | الفعل اللازم | Intransitive verb |
| - کرکڕاگە | الغضروف | Cartilage , Gristle |

| | | |
|---|---|---|
| كرۆك | اللب ، الجوهر | Kernel , Essence , Substance |
| كشانەوە | الانسحاب، التراجع | Off-glide , Withdrawal |
| كۆ | الجمع | Plural |
| كۆسپەك | المعوق | Obstruents |
| كۆكەرەوە | الجامع | Collector , Gather |
| كۆنسۆنانت | الحروف الصحيحه | Consonants |
| – كۆنسۆنانتی ئاوازەدار | الصوامت الصائته | Voiced consonant |
| – كۆنسۆنانتی دووتویێ | الصوامت المزدوجة (الثنائية) | Double consonant |
| – كۆنسۆنانتی رەق | الصوامت الصارمة | Hard consonant |
| – كۆنسۆنانتی كپ | الصوامت المتنفسة | Breathed consonant |
| – كۆنسۆنانتی نەرم | الصوامت المسهلة (غير صارمة) | Lax consonant |
| – كۆنسۆنانتی نێوددانی | | Interdental consonant |
| كۆنسۆنانتیزم | | Consonantism |
| كەسەر | الحزن | Grief |
| كەللەسەر | الجمجمة | Skull , cranium |
| كێش | المعيار | Norm |
| كێشە | القضية | Problem |
| كێشەكی | المعياري | Normative |
| گریمانە | الافتراضات | Assumptions |

| | | |
|---|---|---|
| گشت | العموم | Universal |
| گشتی | العام | Universality |
| گشتییایەتی | الشموليه ، عقيده الخلاصيين | Universalism |
| گڤۆك | ذو جلبة | Noisy |
| گوته | المقولة | Phrase |
| گۆڕین | تباين | Dissimilation |
| گۆشەگیری | الانعزال، الاجتماعي | Asocial |
| گونجان | التوافق | Adjustment |
| ١ - گونجاندن | التوفيق | Adjust |
| ٢- گونجاندن | مهايأة | Accommodation |
| گەروو | البلعوم | Throat |
| گەشبینایەتی | التفاؤل | Optimism |
| گیرەك (ئافیکس) | لاصقة | Affix |
| گێل | الابلة | Imbecile |
| لوتکەیی | قمي | Apical |
| لووزەو | التيار | Jet , Spurt , Spirt , Stream |
| لەرۆك | الاهتزازي | Vibrant |
| لەرە | ذبذبة | Pitch |
| لەرەساز | المرنان | Resonator |
| لەرەنووس | مرسمة الذبذبات | Oscillograph |
| لەرینەوە | رنين | Resonance |

| | | |
|---|---|---|
| لەمپەر | الحواجز، العوائق | Barriers |
| لێکدان | التركيب | Composition , Compounding |
| لێکدژ | المتضاد | |
| لێکسیکۆلۆژی | علم المفردات القاموسيه | Lexicology |
| لێو | الشفة | The lips |
| – لێوی خوارەوە | الشفة السفلى | Lowerlip |
| – لێوە – ددانەکی | الشفوى سنى | Labiodental |
| – لێوی سەرەوە | الشفة العليا | Upperip |
| – لێوە – لێوەکی (هەردوولێو) | | Bilabial |
| لێوەکی | الشفوي | Labial |
| ماسوولکە | العضلة | Muscle |
| ماك | العنصر | Element |
| مانا | المعنى | Meaning |
| – مانای تیان | المعنى غير المباشر | Indirect meaning |
| – مانای حەقیقی | المعنى الحقيقي | Direct (proper)meaning |
| – مانای دارێژە | المعنى الاشتقاقي | Derivational meaning |
| – مانای ڕاستەوخۆ | المعنى المباشر | Direct meanin |
| – مانای مەجازی (مانای پێچەکی) | المعنى المجازي | Transferred meaning |
| – مانای نیسبی | المعنى النسبي | Relational meaning |
| مایەکی | المادي | Material |

| | | |
|---|---|---|
| Materialism | المادية | مایەکیەتی |
| Dialectical materialism | المادية الدياليكتيكية | - مایەکیەتی بێژیاری |
| Homo sapiens | الانسان (بوصفه نوعا بيولوجيا) | مرۆڤی هۆشیار |
| Anthropology | علم الانسان | مرۆناسی |
| Morpheme | المورفيم | مۆرفێم |
| Root morpheme | المورفيم الجذري | - مۆرفێمی ریشەیی |
| Derivational morpheme | المورفيم المكون للكلمة | - مۆرفێمی وشەدارێژ |
| Inflexional morpheme | المورفيم المغير للكلمة | - مۆرفێمی وشەگۆڕ |
| Conditionalty | الشرطي | مەرجایەتی |
| Palate | الحنك | مەلاشوو |
| Hard palate | الحنك الصلب | - رەقە مەلاشوو |
| Soft palate | الحنك اللين | - نەرمە مەلاشوو (بروانە: ئاسمانە) |
| Palatal | الحنكي | مەلاشوویی |
| Proconsul | | مەیمونی سەرەتایی (شەمپازی) |
| Brain | الدماغ | مێشك |

| | | |
|---|---|---|
| نائاگایی | اللاشعور | Irresponisible |
| ناساندن | التعريف | |
| ناو | الاسم | Noun |
| - ناوی چاوگ | اسم المصدر | Action noun |
| - ناوی واتا | الاسم المعنوي | Abstract noun |
| ناوپنچك | الحجاب الحاجز | diaphragm |
| ناوگر | الواسطة | Inflex |
| ناوەکی | الداخلي | Inside, Interior |
| نزیکبەوتنەوە | توحيد ، عمليه التكامل | Intergration |
| نموونایەتی | المثالية | Idealism |
| نووسین | الكتابة | Writing |
| نەسازاو | المتناقض | Contradictory |
| نەسازی | التناقض | Contradiction |
| ١- نیشانە | العلامة | Marker |
| - نیشانەی ناسیاوی | علامة التعريف | Definite articles |
| - نیشانەی نەناسیاوی | علامة التنكير | Indefinite articles |
| ٢- نیشانە | السمة | trait |
| نیمچە بزوێن | نصف الطليق | Semi- vowel |
| نیمچە كۆسپەك | اللثوي | Affricate |
| واتاناسی | علم معاني الالفاظ | Semasiology |
| واتای پێچەکی | المعنى المجازي | Transferred meaning |

(بڕوانە: مانای مەجازی)

| | | |
|---|---|---|
| وتن | نطق ، انبناء الصوت | Articulation |
| وتە (بڕوانە : گوتە) | | |
| وزە | الطاقة | Energy |
| - وزەی هۆشەکی | الطاقة العقلية | Mental enenrgy |
| وشکەبڕوا | الدوغما، الدوغمائی | Dogmas, Dogmatist |
| وشکەبڕوایەتی | الدوغمائية | Dogmatism |
| وشە | الكلمة | Word |
| - وشەی تەواو | الكلمة التامة | Autosemantic word |
| - وشەی دارێژراو | الكلمة المشتقة | Derivational word |
| - وشەی سادە | الكلمة البسيطة | Simple word |
| - وشەی لێکدراو | الكلمة المركبة | Compound word |
| - وشەی ناتەواو | الكلمة الناقصة | Syntactic |
| - وشەی هاوبێژ | المشترك اللفظي | Homonym |
| - وشەی هاوواتا | المرادف | Synonym |
| وشەڕۆنان | بناء الكلمة | Word= formation |
| وشەسازی (مۆرفۆلۆژی) | علم الصرف، المورفولوجيا | Morphology |
| وەستان | توقف | Pause |
| وەسفی | الوصفي | Descriptive |
| وێك چواندن | المماثلة | Assimilation |
| - وێكچواندنی پێچەوانە-ارتدادي | | Regressive assimilation |

| | | |
|---|---|---|
| Progressive assimilation | | – وێکچواندنی ڕاستەوخۆ ـ متوالي |
| Partial assimilation | | – وێکچواندنی ناتەواو |
| | | (بڕوانە : وێکچواندی هەندەکی) |
| Equalization | | ـ وێکچواندنی هەمەکی |
| Partial assimilation | | ـ وێکچواندنی هەندەکی |
| Homonym | مشترك اللفضي | هاوبێژ |
| Correlation | الارتباط | هاوپێوەندی |
| Correspondence | الترابط | هاوڕەنگی |
| Correlative | متبادل العلاقة | هاوڕێژە |
| Synonym | المرادف | هاوواتایی |
| Synonymic, Synonymous | التعادل | هاوتایی |
| Mind | الذهن، العقل | هۆش |
| Mental | الذهني، العقلي | هۆشەکی |
| Belongingness | الانتماء | هۆگری |
| General, Universal | الكلي | هەمەکی |
| Partial | الجزئي | هەندەکی |
| | الجزئية | هەندەکیەتی |
| Tract formant | | هەرێمی پارچە |
| Rise, Raising | الرفع | هەڵبڕین |
| Low rise | | – هەڵبڕینی خواروو |
| High rise | | – هەڵبڕینی سەروو |

| | | |
|---|---|---|
| - هەڵبڕینی ناوەڕاست | | Midle rise |
| هەڵکشاندن | الاعلاء | Sublimation |
| هەڵمەت | | On-glide , Attack |
| هەڵێنجان | الاستنباط | Deduction |
| هەمەکی | الكلي | General |
| هەناسەدان | التنفس | Breathing |
| هەناسەدانەوە | الزفير | Expiration |
| هەناسەکێشان | الشهيق | Inspiration , Inhalation |
| هێرتز | الهرتز | Hertz. Hz |
| هێز | النبرة | Stress |
| - هێزی بەرەڵلا | | Movable stress |
| - هێزی دووەم (هێزی ناسەرەکی) | | Secondary stress |
| - هێزی ڕستە | نبرة الجملة | Phrasal stress |
| - هێزی سەرەکی | | Primary stress |
| - هێزی فرەئاواز | | Polytonic stress |
| - هێزی ناسەرەکی (هێزی دووەم) | | Secondary stress |
| - هێزی وشە | نبرة الكلمة | Word stress |
| - هێزی هەمیشەیی (بەند) | | Fixed stress |
| - هێزی یەك ئاواز | | Monotonic stress |
| یەکجارەکی | القطعي | Permanent , permanently |
| یەکسانی | التساوي | Equality , Uniformity |
| یەکسەر | المباشر | Directly |

# ناوەڕۆک

## (بەرگی یەکەم)

لاپەرە

وێنەیی ، نووسینی بیر ، نووسینی
هێرۆگلیف ، نووسینی فۆنەتیکی .
٢ _ ئەلفوبێ.......
نووسینی فینیقی و ئەلفوبێ
ڕۆژهەلاتی‌یەکان ، ئەلفوبێی یۆنانی ،
ئەلفوبێی لاتینی و ئەو ئەلفوبێ‌یانەی
لەسەر بنەمای لاتینی سازکراون ،
ئەلفوبێی سلاڤی ، ئەلفوبێی کوردی .
٣ _ ڕاستخوێندنەوە و ڕێنووس و ترانسکریپشن ....
ڕاست خوێندنەوە ، ڕێنووس و بنەما
سەرەکی‌یەکانی ، ترانسلەیشن ،
ترانسکریپشن .

فەسلی هەشتەم: لێکسیکۆلۆژی و فەرهەنگنووسی ....
١ _ وشە و واتای وشە ............
مەفهومی وشە ، بەشەکانی لێکسیکۆلۆژی ،
واتای لێکسیکی و پێکهاتنی دەنگیی وشە ،
وشە وەك ناوی شت ، وشە وەك
ڕاگەیەنەری مەفهووم ، واتای لێکسیکی و
واتا گەیاندن ، فۆرمی ناوەکیی وشە ،
پێکهاتنی سیمانتیکیی وشە ، واتای

دابەشکردنی زمانان

# محتويات المجلد

د. عبدالرحمن الحاج معروف

# نتاجاتي اللغوية

(( كتابة وترجمة ))

المجلد الأول

( الكتب والكراريس ) ٩

السليمانية ـ ٢٠٠٢